# یاداشتەکانی فوئاد عارف

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

مستەفا سەعید عەلی

چاپی یەکەم

٢٠٢١

# ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب: یاداشتەکانی فوئاد عارف

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: مستەفا سەعیدعەلی

چاپ: یەکەم

سلێمانی – ٢٠٢١

کۆمپیوتەر: ئەمین عوسمان

تیراژ: ١٠٠٠

چاپخانە: چوارچرا

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٢٨١ ) ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە.

# پێڕست

## بنەماڵەکەم و منداڵیم

لە ساڵی ١٩١٣ لە شاری عەمارە لە باوك و دایکێکی کورد لەدایك بووم، باوکم سەیید عارف کوڕی سەیید مەحموود کوڕی شێخ ئیسماعیلی کونەکۆتری کوڕی شێخ مستەفا قەرەداغی کوڕی شێخ حەسەن بابا ڕەسوڵ گەورەی بنەماڵەی بەرزنجی، دایکی باوکم ناوی نەعیمە کچی مستەفا ئەفەندی کوڕی مەحموود کوڕی موراد، بەخێوکەری منداڵانی بابانییەکان، لە هۆزی مەردۆخ بووە.

شێخ ئیسماعیلی کونەکۆتری بەرزنجی باپیرە گەورەم، لەگەڵ مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە سەردەمی داوود پاشای والیدا (١٢٣٢-١٢٤٧/١٨١٧-١٨٣١ز) پێکەوە چوونەتە بەغداد، والی بەغداد تەکیەیەك بۆ مەولانا لە ناوچەی (رأس القرية) دروستدەکات، کە تا ئێستاش ماوە و بە تەکیەی خالیدیە بەناوبانگە. باپیریشم کرایە مامۆستای مزگەوتی حەیدەرخانە و دەوترێت والی ناوبراو (مقامات الحريري)ی لەسەر دەستی باپیرم خوێندووە. باپیرم لە بەغداد کۆچی دوایی دەکات و لە مزگەوتی شێخ عومەری سورەوەردی لە تەنیشت گۆڕی شێخ عومەردا بە خاك سپێردراوە. لەبەر ناکۆکییەك کە دەکەوێتە نێوان والی و مەولانا خالید، مەولانا بەغداد جێدەهێڵێت و دەچێت بۆ شام و باپیرم لە جێگەی دادەنرێت، سەیید مەحموودی بەرزنجی باپیریشم لەلایەن داوود پاشاوە دەکرێتە لێکۆڵەر لە دادگاکانی بەغداد، تا کۆچی دوایی لەو کارەیدا دەمێنێتەوە. سەیید مەحموود چوار کوڕی بوون: شوکری ژنی نەهێناوە و

دوایین وەزیفەیەك كە تیایدا خانەنشین كراوە سەرۆكی دادگای (ئەطفە) بووە. دوای ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد و كاری پارێزەری دەكات، تا كۆچی دوایی كە لە بەغداد و لە ساڵی ١٩٣٩ و لە گۆڕستانی شێخ مارفی كەرخی بە خاك سپێردراوە. سەیید حەمدی بە گەنجی كۆچی دواییكردووە، سەید عارف باوكی ئەم بیروەرییینووسە، پیاوێكی زانا بووە و هاوشێوەی هاوڕێیانی زانستەكانی سەردەمی خۆی خوێندووە و یەكەمجار بە مامۆستای قوتابخانەی ڕوشدییەكان دامەزراوە، دوای ئەوە كراوەتە بەڕێوەبەری ناحیەی برادۆست، ئەمجا لێكۆڵەری دادگاكانی عەمارە، دوایین كاریشی سەرپەرشتیاری قوتابخانەی ڕوشدییەكانی سوڵتانییەی بەغداد بووە، لە پاڵ ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی لە سەردەمی عیززەت ئەلفارسی سەرۆكی ئەو كاتەی شارەوانی بەغداد. عیززەت ئەلفارسی لە ساڵانی پەنجاكان بۆی گێڕامەوە: "هەرچەندە من سەرۆكی شارەوانی بووم، بەڵام وەك ڕێزێك هەرگیز بەر لە سەیید عارف واژۆی كۆنووسەكانم نەدەكرد".

باوكم لە ساڵی ١٩١٤ كۆچی دوایی دەكات، سەیید نووری بەرزنجی كە دوایین مامم بوو، چەندین پۆستی پەروەردەیی وەرگرتووە، لەوانە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی كوردستان لە ساڵی ١٩٣٢ز لە كەركوك، ساڵی ١٩٥١ لە بەغداد كۆچی دوایی كرد و لە گۆڕستانی ئەلئەعزەمییە بەخاك سپێردرا، باوكم لەسەر داوای مەحموود سوبحی ئەلدەفتەری هاوڕێی، لەسەر ناوی باوكی ناوی لێناوم (فوئاد).

## لە باوەشی ماجید مستەفای خاڵمدا

کاتێك باوکم لە ساڵی ١٩١٤ کۆچی دوایی کرد، تەمەنم حەوت مانگ بوو، لەگەڵ دایکم چووین بۆ ماڵی باپیری دایکم لە بەغداد. دوای کەوتنی بەغداد بە دەستی ئینگلیزەکان لە ئاداری ١٩١٧، گواستمانەوە بۆ سلێمانی و لە ماڵی ماجید مستەفای خاڵم دەژیاین، کە گرنگییەکی زۆری پێدام و منیش بە ڕادەیەك پێوەی وابەستە بووم هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان هەستم بە بێ باوکی نەکرد، تا ئێستاشی لەگەڵ بێت خاڵم لە ژیانمدا بۆ من نموونەی باڵا بووە. خاڵم لە دەرچووانی کۆلێژی سەربازی ئەستەنبوڵ بوو، لە کاتی داگیرکردنی بەریتانیا گەڕایەوە بۆ عێراق، لەبەر ئەوەی سڵاوی ڕێزی بۆ مێجەرسۆن نەگرتبووەوە، ئەویش زیندانیی کرد. دوای ئەوە کردیە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ڕوشدیە لە سلێمانی، بە بەڕێوەبەری مایەوە تا پەیوەندی کردنی بە بزووتنەوەی سمایل ئاغای شکاك (سمکۆ)وە، ماوە ماوە بە نهێنی دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی و چەند ئەفسەرێکی کورد پەیوەندییان پێوەکرد، لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەغداد کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئەلغەزالی بە خاك سپێردرا.

## پێشکەشکردنی عەرزەوحاڵێك بۆ مێجەرسۆنی حاکمی سیاسی

چاکم لە بیرە خوالێخۆشبوو تەوفیق وەهبی بەگ عەرزەوحاڵێکی دامێ تا بیدەمە دەستی مێجەرسۆنی حاکمی سیاسی لە سلێمانی، ئەو کاتە منداڵێکی بچووك بووم، ئامۆژگاری کردم ناوی نەبەم، لەسەر ڕێگای مێجەرسۆندا وەستام و چاوەڕێی هاتنیم دەکرد، هەر کە هات و لە ئۆتۆمبێلەکەی دابەزی، نامەکەم دایە، ئەویش چەمایەوە و بە هەردوو دەستی بەرزی کردمەوە و پێی گوتم: "کێ ئەم عەرزەوحاڵەی داویتێ؟" وتم: نازانم! بە دەنگی بەرز پێکەنی، دوای ئەوە خاڵم ماجید مستەفای ئازادکرد، وەك بزانم خاڵم بۆ جاری دووەم زیندانی کرایەوە، بەڵام لە زیندان هەڵهات.

## بۆردومانکردنی شاری سلێمانی و هەڵهاتن بۆ ئێران

کاتێك فرۆکەکانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ شاری سلێمانیان بۆردومان کرد، تەمەنم لە نێوان شەش، حەوت ساڵاندا بوو. ئێمە لەگەڵ دایکم و داپیرەم و بەخێوکەرەکەم و حەمەکەریم و حەمە سەعید و حەمە کوردە ناچاربووین هەڵبێین بۆ ئێران، لە نزیك گوندی (کونەماسی) لە چەمێك دەپەڕینەوە، پوورەهەنگ هێرشی کردە سەرم و پێوەیان دەدام و لەسەر ولاخەکە خستمیانە خوارەوە. دەنگی ویزەویزی هەنگەکان لەگەڵ دەنگی فرۆکەکانی ئینگلیز کە بۆردومانیان دەکرد تێکەڵ بووبوون. پزیشکێکی میللییان لە گوندی کونەماسییەوە هێنا بۆ چارەسەرکردنم، زۆر لە گوندەکە نەماینەوە و چووین بۆ شاری بانە و لەوێدا بەرپرسێکی ئێرانی بە

ناوی (کلانتەر) وەریگرتین و کاری مانەوەی جێبەجێکردین. دوای چەند هەفتەیەك لە دوورخستنەوە و گۆشەگیری، ڕۆژێکیان حەمە کوردە کە دەرگای ژوورەکەی بە هێمنی داخست، داوای لێکردین زۆر بە خێرایی ئەسپەکان ئامادە بکەین و هەرچی زووە هەڵبێین، چونکە ئێرانییەکان ئەگەر پێمان بزانن دەمانگرن و ڕادەستی ئینگلیزەکانمان دەکەنەوە. هەرزوو پەلەکرا لە ئامادەکردن و زینکردنی ئەسپەکان و بارکردنی هەرچی پێویستی ڕێگایە. من لە پشکەی سەلما خانمی بەخێوکەرم سوار کرام. بە چاونوقانێك حەمە کوردە دەرگاکەی کردەوە و زۆر بە خێرایی بۆی دەرچووین و بە دەمانچەکەی دەستیکرد بە تەقەکردن لەو هێزە ئێرانییانەی کە دەیانویست دەوری ماڵەکەمان بدەن، حەمە کوردە زۆر خراپ شلەژاندنی. لەگەڵ هەردوو براکەی حەمە کەریم و حەمە سەعید ڕێککەوتبوون بە چ ڕێگایەکدا دەربازمان بکەن و خۆی گەڕایەوە بۆ سەرقاڵکردنی ئەو سەربازە ئێرانییانەی بە دواماندا هاتبوون و چەند خولەکێکی نەخایاند دوورکەوتینەوە و ڕزگارمان بوو، دوای چەند کاتژمێرێك کە شەو داهاتبوو، حەمە کوردە پێمان گەیشتەوە. گوند بە گوند هاتین تا گەیشتینە گوندی (شەشۆ) کە دێی حەمە ئاغای مێردی پوورم و ئاغایەکی ناسراوی یەکێك لە هۆزەکانی پشدەر بوو و لە ماڵی ئەوانداماینەوە.

## فێربوونی قورئان لە گوندی شەشۆ و بەسەرهاتم لەگەڵ مەلا عەبدوڕەحمان

ئێمە لە ماڵی (حەمە ئاغا) ناسراو بە (حەمە بچکۆل) کە یەکێك بوو لە سەرۆك هۆزەکانی پشدەر، دەژیاین. لە لای مەلا عەبدوڕەحمان دەستمکرد بە فێربوونی قورئان، مەلا عەبدوڕەحمان هەموو ڕۆژێك سپێدەی بەیانی دەهاتە مزگەوتی گوند کە لە شوێنێکی بەرزی باکووری گوندەکەوە بوو، باشم لە بیرە وەرز زستان بوو، دونیا زۆر سارد بوو، وێڕای ساردی کەشوهەوا و بارینی بەفر و بەستنی هەرچی ئاوەکانە، بەڵام مەلا عەبدوڕەحمان هەموو بەیانییەکی زوو دەهات بۆ ئەوەی فێری قورئانم بکات، نوێژی بەیانیی لە مزگەوت دەکرد و ئەمجا دەهات هەڵیدەستاندم بۆ ئەوەی وانەم پێبڵێتەوە، هەموو جارێك هەوڵم دەدا قەناعەتی پێبێنم وازم لێبێنێت، جارێك بە بیانووی ئەوەی نەخۆشم و جارێك بە بیانووی ئەوەی شەکەری دەدەمێ، بەڵام سوودی نەبوو، چونکە مەلا لەو جۆرە مەلایانە نەبوو بە ئاسانی قەناعەت بکات. ڕۆژێکیان بۆ ئازاردانی مامۆستای بەستەزمان، کارێکی زۆر منداڵانەم کرد، جۆگەلە ئاوێك لە سەرووی مزگەوتەوە هەبوو، شەوێکیان جۆگە ئاوەکەم شکاند بۆ بەردەم مزگەوتەکە و ئاو بەستی، خوالێخۆشبوو حاجی موحەممەدی سام ئاغا کە یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی شاری سلێمانی، بە میوانی هاتبووە گوندەکە، قاچی لێخلیسکا و تا خوارەوەی مزگەوتەکە خلۆر بووەوە، مەلا ئەو ئەو جارە قوتاری بوو، دوای دە ڕۆژ جارێکی تر جۆگەلەکەم شکاندەوە، بەڵام ئەمجا مەلا لێی خلیسکا و لە تەپۆڵکەی مزگەوتەکەوە بە تەپاوتل تا خوارەوەی مزگەوتەکە خلۆر بووەوە و قاچێکی شکا. بۆ گرتنەوەی قاچی

برایە گوندێکی تر و دوای شەش مانگ هاتەوە، بەو جۆرە بۆ هەتا هەتایە ڕزگارم بوو، دوای ئەوە زانیم مەلا تەنانەت نەیدەزانی قورئان بخوێنێتەوە و کۆلکە خوێندەوار بوو.

## بۆمبەکانی ئینگلیز

ڕۆژێکیان لە سلێمانی بۆ قوتابخانە دەچووم، فڕۆکەکانی بەریتانیا لە ئاسمانی شار پەیدابوون و دەستیان بە بۆردومان کرد، لە ترسی ئەوەی نەیپێکرێم، دەستمکرد بە ڕاکردن. هێندە منداڵ بووم نەمدەتوانی ڕابکەم و لە شوێنێك خۆم حەشار بدەم، بۆیە ژنێك کە ئەویش هەوڵیدەدا هەڵبێت، دەستیگرتم. بە چاوی خۆم بۆمبەکانم دەبینی لە نزیکمان دەکەوتنە خوارەوە و تیرهاوێژە کوردەکانیش بە تفەنگەکانیان تەقەیان لە فڕۆکەکان دەکرد.

## سیخوڕی یەهودی

ئینگلیزەکان جارێکی تر گەڕانەوە و شاری سلێمانییان داگیرکردەوە، من و دایکم و داپیرم لە سلێمانی بووین، ناچار بووین بچین بۆ ماڵی حەمەکەریم، حەمەکەریم لە پیاوە دڵسۆزەکانمان بوو، پیاوێکی یەهودی کە چاوێکی کوێر بوو، لێمان وەژوورکەوت و بە حەمەکەریمی وت: بیستوومە فوئاد عارف لەگەڵ حەلیمەی داپیرەی کە دایکی ماجید مستەفایە، لە ماڵی ئێوەن. حکومەتی بەریتانیا بە دوایاندا دەگەڕێت و بڕە پارەیەکی زۆری تەرخان کردوە بۆ ئەو کەسەی دەیانگرێت. ئەو کات تەمەنم لە دەوروبەری یازدە ساڵدا بوو، بۆیە بە سەربانی ماڵاندا هەڵهاتین

و چووینه ماڵی ئەحمەد تەوفیق بەگی موتەسەریفی سلێمانی، (حەبە خانی) دایکی بە گەرمی پێشوازی لێکردین و لە باوەشی گرتم و ماچی کردم، کە بەو حاڵە ئێمەی بینی دەستیکرد بە گریان، ناردی بە شوێن ئەحمەدی کوڕی کە لە دیوەخان بوو و پێیگوت: "ئەمە حەلیمە خانی دایکی ماجیدە و ئەمەش فوئادی کچەزایەتی، دەبێت شتێکیان بۆ بکەیت". ئەحمەد بەگ وتی: "ئەگەر بەریتانییەکان بزانن لێرەن خراپم لەگەڵ دەکەن، بەڵام هەوڵ دەدەم لێرە نەیانهێڵم". بۆ بەیانییەکەی چووین بۆ ماڵی تۆفیق قەزاز، چونکە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا باشبوو، چەند ڕۆژێك لە ماڵیان ماینەوە، تا ڕۆژێك بە بیانووی گەشتکردن چووین بۆ گوندی وڵوبە. لە وڵوبە چەند چەکدارێك لە چاوەڕوانیماندا بوون، لەوێوە لەگەڵماندا هاتن بۆ گوندێکی تر کەناوەکەیم بیر نەماوە. شەوەکەی چاومان کەوت بە شێخ مەحموود و ماجید مستەفای خاڵیشمی لەگەڵ بوو. زۆر دڵگران بوو بۆ دۆخی ئێمە، بۆیە شێخ مەحموود مەفرەزەیەکی تایبەتی نارد بۆ شاری سلێمانی بۆ سزادانی هەرچی ئەو کوردانەی هاوکاری ئینگلیزەکان دەکەن و خراپەیان لەگەڵ ئێمەدا کردووە، وەك باسمکرد لە وڵوبەوە چووین بۆ بانە و کاری نیشتەجێکردنمان ڕێکخرا. دوای گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ فەرمانڕەوایی سلێمانی، ئێمەش لە گوندی شەشۆی پشدەرەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی.

## پێشکەشکردنی عەرزەو حاڵی خانەنشینان بۆ مەلیک مەحموود

وەك لە بیرم بێت لە کاتی تێکچوونی بارودۆخی سلێمانی، پێدانی مووچە بە خانەنشینان چەند هەفتەیەك دواکەوت، خانەنشینانی گەڕەکەکەمان بوونی شێخ مەحموودیان لە شاردا بە هەل زانی، بۆیە عەرزەوحاڵێکیان نووسی و واژۆیان کرد و داوایان لە مەلیك کرد مووچەکەیان بۆ خەرج بکات، لە منیان باشتر نەدیتەوە عەریزەکەیان بۆ بگەیەنێتە لای مەلیك، چونکە مەلیك منی خۆشدەویست، منیش عەریزەکەم برد و لەسەر ئەو ڕێگایە وەستام کە مەلیك مەحموود و دارودەستەکەی لێیەوە دەچوون بۆ سەرا و عەریزەکەم بە دەستەوە بوو، هەر کە مەلیك مەحموود دەرکەوت، لێی چوومە پێش و عەریزەکەم دایە، بە پێکەنینەوە لێی وەرگرتم و فەرمانی دا مووچەی خانەنشینانی گەڕەکەکەمان – گۆیژە – خەرج بکرێت.

کە هەواڵ گەیشتە خانەنشینانی گەڕەکەکانی تر کە مووچەی گەڕەکێکی تر خەرجکراوە، هەموو هاتن بۆ لام و داوایان لێکردم ئەو کارە بۆ ئەوانیش بکەم. منیش عەریزەکانم لێوەرگرتن و بردمن بۆ لای مەلیك مەحموود کە سەرپەرشتی هەندێك چاککرنەوە و نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی گەورەی دەکرد. هەر کە لە دوورەوە بینیمی، خشتێکی لێهەڵگرتم و تێیخوڕیم ئەگەر لێی نزیك ببمەوە پێمدا دەکێشێت، دوایی دەستیکرد بە پێکەنین و بە خۆشەویستییەوە بانگیکردم بۆ لای خۆی و عەریزەکانم دایە دەستی و لێیانی کۆڵییەوە.

## دیاری بۆ مەلیك مەحموود

هاتنی سەرۆك هۆز و دەستڕۆیشتوانی تر لە ناوچەکانی ترەوە بۆ لای شێخ مەحموود، تەنانەت لە کوردستانی ئێرانیشەوە بۆ نیشاندانی پشتگیری بۆ شێخ بەردەوام بوو. شێخ مەحموود چەندین میوانخانەی تایبەتی بە پێشوازیکردنی ئەوانە دروستکردبوو. یەکێك لەو سەرۆك هۆزانە، موحەممەد ساڵەح بەگی گوڵی لە سەرکردە ناسراوەکانی (بانە)و لایەنگری شێخ مەحموود بوو، بە حوکمی خزمایەتیی و پەیوەندی بەهێزمان لە ماڵی ئێمە دەمایەوە. شێخ مەحموود عادەتی وابوو لە شوێنی نیشتەجێبوونیان ناوە ناوە سەردانی ئەو سەرۆکانەی دەکرد، ڕۆژێکیان شێخ لە ماڵی ئێمە سەردانی موحەممەد ساڵەح بەگی کرد، دوای کۆتاییهاتنی سەردانەکە، شێخ مەحموود لەگەڵ ماجید مستەفای خاڵم چوونە حەرەم و لەگەڵ نەنە حەلیمە خانم ماوەیەك دانیشتن، دابی خەڵکی ئەو سەردەمە وابوو نێرگەلەیان دەکێشا، دەمی نێرگەلەکەی داپیرەم زۆر جوان بوو، شێخ پرسیاری لێکردبوو ئەم دەمە نێرگەلە جوانەت لە کوێ هێناوە؟ ئەویش وەڵامی دابووەوە بە دیاری بۆیان هێناوم. دوای یەك دوو ڕۆژێك داپیرەم دەمە نێرگەلەکەی لە دەستە سرێکی ئاوریشم پێچا و بە مندا ناردی بۆ مەلیك مەحموود، کە ڕۆیشتم لە مەجلیسێکی قەرەباڵغدا دانیشتبوو، ڕۆیشتمە ژوورەوە و بە گەرمی پێشوازی لێکردم و دیارییەکەی لێوەرگرتم و لە تەنیشت خۆی دایینیشاندم، سوپاسی داپیرەمی کرد بۆ دیارییەکەی و سۆزێکی باوکانەی لەگەڵ نواندم و پاشان هاتمەوە.

## جووتە هاویشتنی ئەسپێك

هەرچیم لە بیر بچێت ئەوەم لە بیر ناچێت کاتێك ئەسپێکم برد بۆ ئەوەی لە جۆگەیەکی دەرەوەی شار ئاوی بدەم، ئەسپەکە جووتەیەکی لێدام و بورامەوە، کە بە ئاگا هاتمەوە دەبینم لە باوەشی خانمی وەسمان پاشای جافدام و شفتەیەکی خستبووە سەر نێوچەوانم گوایە دەرمانە و چاکم دەکاتەوە. هێشتا بەزەیی و قسە خۆشەکانی عادیلەخانمم لە بیرە، کە دەیگوت: "وریابە شفتەکە نەخۆیت". تا ئێستاش شوێنەواری جووتەکە بە نەوێلمەوە دیارە.

## قوتابێتی و فێربوون لە نێوان حوجرە و قوتابخانەدا

بەهۆی نا ئارامی بارودۆخەوە، خوێندنم لە نێوان حوجرە و قوتابخانەی فەرمیدا پچڕ پچڕ بوو، جارێك ناچار دەبووین هەڵبێین بۆ شاخ و جارێك لە نێوان ترس و هیوادا بگەڕێینەوە بۆ سلێمانی، دوو ڕۆژ لە قوتابخانە دەواممان دەکرد و ڕۆژەکانی تر لە ترسی بۆردومانی فڕۆکەکانی بەریتانیا هەڵدەهاتین. زۆربەی کاتەکانمان لە گوندەکانی نێو سنووری ئێران، یان گوندەکانی پشدەر بەسەر دەبرد، وەك پێشتر باسمکرد هەریەك لە مەلا حسەینی پیسکەندی و خواجە ئەفەندی (بە ڕەحمەت بێت) و مەلا عەبدوڕەحمان لە گوندی شەشۆ وانەیان پێگوتوومەتەوە.

## هەڕەشەی هەڵدانەوەی گۆڕ

ئێوارەیەکیان کە لەسەر خوانی نانخواردن بووم، ماجید مستەفای خالّم، هەواڵی سەرنەکەوتنمی لە پۆلەکەمدا پێدام، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان خوالێخۆشبوو مامۆستا ڕەفیق حیلمی بوو، ڕاستەوخۆ هەستام و چووم بۆ ماڵیان و بە تووڕەبوونێکی منداڵانەوە هەڕەشەم لێکرد لە سزای ئەوەی لە پۆلەکەمدا هێڵراومەتەوە گۆڕی کچەکەی کە لەبەردەم ماڵیاندا بە خاك سپێردرا بوو، هەڵدەدەمەوە. بەڵام ژنە بەڕێزەکەی بە هەوڵی دڵسۆزانەی هێوری کردمەوە و هەندێك نوقڵ و شیرینیشی دامێ و گەڕامەوە.

## شێخ مەحموودی حەفید دەبێتە مەلیك

هێشتا منداڵ بووم گوێم لێدەبوو خەڵکی دەیانگوت شێخ مەحموودی بەرزنجی (حەفید) بۆتە حوکمداری کوردستان و حکومەتەکەی بەر لە پێکهێنانی حکومەتی کاتی عێراق لە ٢٥ تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ بە سەرۆکایەتی عەبدوڕەحمان ئەلنەقیب پێکهێناوە. هەروەها باس لەوە دەکرا حکومەت ڕێگە خۆشدەکات بۆ ڕیفراندۆمێکی گشتی بۆ دانانی مەلیك فەیسەڵی یەکەم، وەك پادشا لەسەر عەرشی عێراق و دەوڵەتی نوێی عێراق ڕووبەڕووی ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێزی کوردی دەبێتەوە، بە تایبەت لە سلێمانی و کەرکوك کوردان ڕەتیانکردۆتەوە بچنە ناو حکومەتێکی تازەوە لە ژێر سەرپەرشتی و ئیدارەی حکومەتێکدا کە زۆربەی

فەرمانبەرانی لە ئینگلیزن، لە لایەکی ترەوە هەردوو لیوای – پارێزگای– موسڵ و ئەربیل چووبوونە نێو حکومەتە نوێیەکەوە. بەو جۆرە هەموو

لیواکانی عێراق لە دواییدا بەشدارییانکرد لەو ڕیفراندۆمەی ئەنجامدرا، جگە لە لیوای سلێمانی، وە لیوای کەرکوکیش لە دژی فەیسەڵ دەنگیان دا.

دوای پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق و دانانی شا فەیسەڵی یەکەم بە پادشای عێراق، کورد جارێکی تر لە دژی حکومەتی عێراق و دەسەڵاتی بەریتانیا وەستایەوە. هەماهەنگی لە نێوان کورد و تورکە کەمالییەکاندا کرا و تورکیا بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر هێزەکانی لەسەر سنوور کۆکردنەوە و هاتە نێو خاکی کوردستانەوە. ئەوەش چالاکی شۆڕشگێڕانی کوردی زیاترکرد و هێزەکانی بەریتانیای ناچارکرد لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان پاشەکشە بکەن، هێزەکانی تورکیاش گەیشتنە شارەکانی ڕانیە و کۆیە، بەڵام ناوچەی پشدەر لە ژێر دەستی ئیدارەی کورددا مایەوە، کورد سوودی بینی لە بوونی هێزەکانی تورکیا لە کوردستان و پاشەکشەی هێزەکانی ئینگلیز لە سلێمانی، ئەم ڕوداوانە وایانکرد بۆ چارەسەری دۆخەکە، ئینگلیزەکان بیربکەنەوە لە گەڕاندنەوەی شێخ مەحموود لە هیندستانەوە. دوای گەڕاندنەوەی شێخ مەحموود، دەستکرا بە کارکردن بۆ دووبارە دروستکردنەوەی ئیدارە و ڕێکخستنی چەکدارانی کورد لە لیواکانی سلێمانی و ئەربیل و کەرکوک، شێخ مەحموود پێکهێنانی حکومەتی کوردیی لە ١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ ڕاگەیاند، هەردوو حکومەتی بەریتانیا و عێراقی لە ٢٤ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ بە دیفاکتۆ، بەیانێکی هاوبەشیان ڕاگەیاند تیایدا هاتبوو:

"حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیا و حکومەتی عێراق داندەنێن بە مافەکانی کوردانی نیشتەجێی سنووری عێراق، بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەو ناوچانەی کوردان زۆرینەی ڕەهای پێکدەهێنن، هیوادارین

کوردانی ڕەگەز جیاواز لە نێو خۆیاندا بگەنە ڕێککەوتنێك لەسەر شێوەی پێکهێنانی ئەو حکومەتەی خۆیان حەزیان لێیەتی لەگەڵ سنوورەکەیدا و نوێنەری فەرمی خۆیان بنێرن بۆ بەغداد بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی پەیوەندییە سیاسیی و ئابوورییەکانیان لەگەڵ هەردوو حکومەتی بەریتانیا و عێراق دا".

بەڵام هەردوو حکومەتی بەریتانیا و عێراق، وەك هەمیشە ڕاستگۆ نەبوون لە بەڵێنەکەیان و زۆری نەخایاند لەو بەیاننامەیە پەشیمان بوونەوە. سوپای عێراق بە پشتیوانی فڕۆکەکانی بەریتانیا هێرشیانکردە سەر شاری سلێمانی و لە تەممووزی ١٩٢٤ داگیریان کرد.

دوای هاتنی هێزەکانی عێراق بۆ نێو شاری سلێمانی، شێخ مەحموود کشایەوە بۆ پێنجوێن، ئینگلیزەکان کە زانییان بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژی شێخ مەحموود و چەکدارانی سوودی نییە، بۆیە جارێکی تر بیریان لە چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ دۆزی کورد کردەوە.

وەك بیستم مستەر (کورونوالیس)ی ڕاوێژکاری ئەو کاتەی وەزارەتی ناوخۆی عێراق لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٦ هاتۆتە سلێمانی و لە ناوچەی خورماڵ کۆبوونەوەی لەگەڵ شێخ مەحمووددا کردووە و هەوڵی داوە ڕێککەوتنێکی لەگەڵدا بکات، بەڵام شێخ مەحموود مەرجی بەریتانییەکانی قبووڵ نەکردووە، ئەمەش وایکرد حکومەتی عێراق هێزی سەربازی بنێرێت بۆ قەزای پێنجوێن و لە ٢١ی نیسانی ١٩٢٧ داگیری بکات، بەڵام ئەمجارە شێخ مەحموود ناچار بوو مەرجەکانی حکومەتی عێراقی قبووڵ بکات، بۆ خۆی هات بۆ سلێمانی و لەگەڵ پارێزگاری سلێمانی ئەحمەد عوسمان کۆبووەوە و پێکەوە ڕۆیشتن بۆ بەغداد، ئەو کات لە قوتابخانەی زانستی لە کەرکوك لە

پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم، لە ماڵی خاڵم فائق مستەفا کە ئەندازیاری تۆماری خانووبەرە (تاپۆ) بوو لە کەرکوک، دەژیام. شێخ مەحموود کە گەیشتە کەرکوک، بۆ خوانی نیوەڕۆ بوو بە میوانی سەیید ئەحمەدی خانەقا. ئێوارەی هەمان ڕۆژ بە ڕێگەی شەمەندەفەر ڕۆیشت بۆ بەغداد. ماجید مستەفای خاڵم لەگەڵی ڕۆیشت. دوای ڕێککەوتنی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، وەك نیازپاکییەك شێخ بابا ڕەسوڵی کوڕی نارد بۆ بەغداد، لە قوتابخانەی (**الفضل**) لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی وەرگیرا، منیش هەمان ساڵ ١٩٢٧ لە کەرکوکەوە گواستمەوە بۆ هەمان قوتابخانە.

دوای سەرکەوتنی شێخ بابا ڕەسول بە پلەی سێیەم، نێردرا بۆ ئەسکەندەرییەی میسر بۆ تەواوکردنی خوێندن لە کۆلێژی ڤیکتۆریا، بەڵام من بە پلەی پێنجەم دەرچووم و چوومە قوتابخانەی سەربازی بە ناونیشانی کوڕی سەرۆك هۆز، کە وەرگرتنیان لەم قوتابخانەیە لە پێشتربوو لەوانی تر.

بەو جۆرە شێخ مەحموود لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق ڕێککەوت و ماجید مستەفای خاڵمی کردە بەڕێوەبەری ناحیەی ئەلعەزیزییە. لە بەغداد لە ماڵی سەیید نووری بەرزنجی مامم دەژیام، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی فەزڵی سەرەتایی بوو، دوای سەرکەوتنم لە پۆلی چوارەم، چوومە قوتابخانەی سەربازی بەشی کوڕانی هۆزەکان.

## وەرگرتنم لە کۆلێژی سەربازی

ساڵی ١٩٢٨ لە کۆلێژی سەربازی وەرگیرام، وەرگرتنم لە چوارچێوەی قبووڵکراوی کوڕانی سەرۆك هۆزەکاندا بوو. خوێندنی سەربازی بە سێ بەش بوو: بەشی یەکەم ئەوانە بوون خوێندنی ئامادەییان تەواوکردبوو، واتە دەرچووی خوێندنە ئامادەییەکان بوون و لە پۆلی ناوەندی وەردەگیران. بەشی دووەم ئەو قوتابیانە بوون قۆناغی ناوەندییان تەواوکردبوو و لەپۆلی تازەدا وەردەگیران. بەشی سێیەم کوڕانی سەرۆك هۆزەکان بوون بەو مەرجەی خوێندنەوە و نوسینیان زانیبا، یا قۆناغێکی خوێندنی دیاریکراویان تەواو کردبێت. من لەم بەشەدا وەرگیرام. مەلیك غازی کە ئەو کات پێی دەوترا (ئەلشەریف غازی) لەگەڵمان بوو، ئەویش لەگەڵ چینی کوڕانی سەرۆك هۆزەکان وەرگیرا بوو، چونکە تا ئەو کاتە هیچ قۆناغێکی خوێندنی تەواو نەکردبوو، بەڵام ئەو خوێندنەی لە بەریتانیا خوێندبووی بۆی حیسابکرا و لە پۆلی دووەمی قوتابخانەی سەربازی بۆ کوڕانی هۆزەکان وەرگیرا.

کۆی قوتابیانی قوتابخانەی سەربازی لەو کاتەدا لە ٧٠ قوتابی تێنەدەپەڕی و ژمارەی قوتابیان لە پۆلێکدا ٢٠ بۆ ٢٥ قوتابی دەبوون، لە ساڵی ١٩٣٢ بە پلەی ملازمی دووەم کۆلێژی سەربازیم تەواوکرد، بەڵام چۆن چوومە کۆلێژی سەربازی؟ دوای خوێندنم لە کەرکوك، سەید نووری بەرزنجی مامم کە لە بەغداد بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو، لە ساڵی ١٩٢٧ هات بۆ کەرکوك و منی برد بۆ بەغداد بۆ لای خۆی. سور بوو لەسەر

ئەوەی خوێندن تەواو بکەم، خاوەنی هەستێکی پەروەردەیی جوان بوو، لە ساڵی ١٩٣٢ بوو بە سەرپەرشتیاری پەروەردەی کوردستان لە کەرکوك و لە ساڵی ١٩٥١ کۆچی دواییکرد، کاتێك خوێندنم لای ئەو تەواو کرد، حەزمکرد بچمە قوتابخانەی سەربازی، ئەو سەردەمە حەزم لە ژیانی سەربازی دەکرد. دەبێت ئاماژە بەوە بدەم هەریەك لە بەڕێزان تۆفیق وەهبی و موحەممەدئەمین زەکی، ئەوەی لە تواناياندا بوو بۆ وەرگرتنم لە کۆلێژی سەربازی کردیان. زۆر دڵخۆشبووم بەو بەشە و سەرەڕای هەموو سەختییەکانی. ئێستاش حەزم لێیە و بە وەزیفەیەکی تەواو گونجاوی بۆ خۆم دەزانم، ئەگەر ڕەوڕەوەی ژیان بگەڕێتەوە دواوە و سەرلەنوێ ژیانێك بۆ خۆم هەڵبژێرم، بێگومان هەر ژیانی سەربازیم هەڵدەبژارد.

کاتێك چوومە کۆلێژی سەربازی، هەندێك لە ئەفسەرانی ئینگلیز وانەیان پێدەگوتینەوە، سەرپەرشتیاری کۆلێژیش کاپتن (تیك)ی بەریتانی بوو. یەکەم عێراقییەك کە بوو بە فەرماندەی کۆلێژی سەربازی عێراق، خوالێخۆشبوو موحەممەدئەمین زەکی بەگ بوو. دوای ئەو خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ و دوای ئەویش خوالێخۆشبوو خالد ئەلزەهاوی بوو. دەبێت ئاماژەی پێبدەم قوتابیانی کۆلێژی سەربازی لە باشترین گەنجانی عێراق بوون.

هاوڕێیانی خوێندنم لە کۆلێژ بریتیبوون لە عەبدولکەریم قاسم (کە دواتر بوو بە سەرۆك وەزیران و فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراق) و ئەنوەر فرەنگوڵ و مەجید حەسەن (ئەمینداری پایتەختی پێشوو)و کازم

ئەلعەبادی و ئیسماعیل مەحموود و ئەحمەد موحەممەد یەحیا (وەزیری ناوخۆ لە کابینەی عەبدولکەریم قاسم)و سەعدی عەبدولوەهاب و منیر مودەلەل و بورهان عەبدولکەریم و حسەین فەخری موحەممەد عەلی و ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی (سەرۆك ئەرکانی سوپا و حاکمی گشتی سەربازی لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم)و عەبدولقادر خۆجە و بەسیم حەسون و بەکر سامی و ساڵەح موحەممەد (برازای شێخ مەحموود)و عەبدولقادر عیززەت و عەبدولقادر موحەممەد و مەحموود تەها بەرزنجی و مەعروف غەریب (خوشکەزای شێخ مەحموود)و بەهادور مەجید و فەرمان ئەمین و داوود سەبری سەلمان و موحەممەد فەتاح ڕەشید و سەبری ڕەشید و مستەفا بایز و موحەممەد شێخ سەلام. زۆربەیان لە کورد و عەرەب هاوڕێم بوون و لە وەزیفەشدا پەیوەندییم لەگەڵیاندا بەردەوام بوو.

### هاوڕێیەتی شازادە غازی

لەگەڵ شازادە غازی لەو ساڵەدا و پێکەوە لە کۆلێژی سەربازی وەرگیراین، ئەو لە پۆلی دووەم وەرگیرا، کۆلێژ بریتیبوو لە دوو هۆڵ، لەگەڵ ئەلشەریف غازی بۆ ماوەی سێ ساڵ لە یەك هۆڵدا پێکەوە دەنووستین، جگە لە ساڵی کۆتایی ئیتر غازی بۆ خەوتن چووە ژووری قوتابیانی (الضباط الصف) کە چوار کەسی یاریدەدەری ئەفسەران بوون لە پۆلی پێشکەوتوودا. هەر سێ ژەمی خواردنمان لەگەڵ ئەودا لەسەر مێزێك دەخوارد.

غازی قوتابییەکی ئاسایی دەهاتە بەرچاو، نەماندەزانی ئەوەی

لەگەڵماندایە لە دوای باوکی کاندیدە بۆ سەر عەرشی عێراق. پەیوەندیمان لەگەڵیدا وەك پەیوەندیمان لەگەڵ هەر قوتابییەکی تر بوو. خواردن و خەوتن و مەشقمان لەگەڵ یەك بوو، جگە لە ئێوارەی ڕۆژانی پێنجشەممە، کە کۆلێژمان جێدەهێشت و دادەبەزین، غازی دەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و ئێوارەی ڕۆژی هەینی دەهاتەوە بۆ کۆلێژ. ڕۆژانی پێنجشەممە خالد ئەلزەهاوی هاوڕێیەتی غازی دەکرد لە کۆلێژەوە بۆ ماڵ و هێنانەوەی بۆ کۆلێژ ئێوارەی ڕۆژی هەینی.

شازادە غازی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەگەڵ هەندێك لە قوتابییەکاندا هەبوو، بە شێوەیەکی گشتی شازادە غازی کەسێکی بێوەی و خۆشەویستی هەموو قوتابیان بوو، ڕەنگە بڕوا نەکەن ئەگەر بڵێم لە دەست گاڵتەکردنی هەندێك لە قوتابییەکان کە لەگەڵی دەیانکرد بێزار دەبوو. تەنانەت جارێك هات بۆ لام گلەیی لە دەست هاوڕێیەکی کوردی کرد، کە زەکی عەزیزی خەڵکی کۆیە بوو، پێی وتم: فوئاد، تکا دەکەم بە زەکی بڵێ سوعبەتم لەگەڵ نەکات!

جارێکیان چوومە یانەی کۆلێژەوە، شازادە غازی بانگیکردم و وتی: فوئاد وەرە لەگەڵمان دانیشە، وتم لەگەڵتان دانانیشم. وتی بۆ؟ وتم: دەترسم تۆ ببیتە پادشا و ئەوانەش لەگەڵت دانیشتوون ببنە وەزیرەکانت. وتی: ئەی تۆ چیت دەوێت؟ وتم: ئەو کات حەز دەکەم خانەنشین بم. هەمووشمان پێکەنین. نەمدەزانی قەدەر لەوەودوا دەمکاتە پاسەوانی تایبەتیی و دەبمە جێی متمانەی بنەماڵەی شاهانە.

شازادە غازی بەو پێیەی قوتابی بوو لە کۆلێژی سەربازی، زۆری حەز لە پیشەکەی بوو، چالاك و دیار بوو لە نێوان هاوڕێکانیدا، زۆر حەزی لە وەرزش بوو و باشترین سوارچاك بوو لە کۆلێژدا و هەمیشە لە پێشەوە بوو، پێدەچوو دڵخۆشبێت بە خوێندنی لە کۆلێژی سەربازی، ڕەنگە هۆکارەکەی ئەو هەموو سەختیی و ئازارەی خوێندن بووبێت لە بەریتانیا بینیبووی. وەك زانیمان حەزی نەکردبوو لە دەرەوەی عێراق بخوێنێت. لە بەریتانیا خوێندنی پچڕ پچڕ بووبوو و زیاد لە خانوویەك و زیاد لە قوتابخانەیەکیشی گۆڕیبوو، وە زیاد لە مامۆستایەکیان بۆ هەڵبژاردبوو. ڕاپۆرتی زۆری لەبارەوە درابوو، ئەمەش موعاناتەکانی زیاتر کردبوو. زیاد لە هۆکارێك ڕۆڵیان هەبوو لە سەرنەکەوتنی خوێندنی لە ئینگلتەرا، غازی هەر لە منداڵییەوە بۆچوونی نەرێنیی لە بەرامبەر ئینگلیزەکاندا هەبوو، بە تایبەت لەو کاتەوە ئەو مامەڵە خراپەی ئینگلیزەکان لەگەڵ (ئەلحسەین)ی باپیری کردبوویان، کە دواتر دێینە سەری و باسی دەکەین، بە جۆرێك کاتێك باسی (ئەلحسین)ی باپیری دەکرد بە دەستی ئینگلیزەکانەوە چی لێکراوە، هەردوو چاوی پڕ دەبوون لە فرمێسك، کە بوو بە پادشای عێراقیش ئەو حاڵەتەی هەر لەگەڵدا مایەوە. هەروەها زۆر پەیوەست بوو بە دایکییەوە و نەیدەتوانی لەو تەمەنەدا کە چواردەساڵان بوو لە دایکی دووربکەوێتەوە. ئەمجا بەو مامەڵە تایبەتە لەگەڵیدا دەکرا و هەستکردن بە نامۆبوونی کتوپڕ و جیاواز لە شێوازی ژیانی ڕۆژهەڵاتی کە لە حیجاز و عێراق لەسەری ڕاهاتبوو. کاتێك لە کۆلێژی سەربازی خۆی لەگەڵ کوڕانی نیشتمانەکەیدا بینییەوە، بێئەوەی مامەڵەیەکی تایبەت و جیاوازی لەگەڵدا

بکرێت، متمانەی بە خۆی پەیداکردەوە و ئاسوودەیی بۆ گەڕایەوە. بۆیە لە نێو کۆلێژدا دەمانبینی لە ئەوپەڕی تێکەڵاویی کۆمەڵایەتیدایە و پەیوەندی گەرمی لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەیە.

لە یادگارییە خۆشەکانمان پێکەوە، لە بیرمە جارێکیان کۆمەڵێك قوتابی بەردمان دەگرتە دارخورمایەك بۆ ئەوەی خورمای لێبکەوێتە خوارەوە، غازیشمان لەگەڵ بوو، ئەویش وەك ئێمە بەردی دەهاویشت، کاتێك خورماکان دەکەوتنە خوارەوە و هەڵمان دەگرتنەوە زۆر هەستمان بە دڵخۆشی دەکرد، زەکی عەزیز پێی وت:

– ئەی پرنس تۆ چوار فلست نییە بیدەیتە خورما، وا هاتوویت بەرد لەو دارخورمایە دەگریت بۆ ئەوەی خورمای لێبکەوێتە خوارەوە!

غازی وتی:

– برادەران بۆ خاتری خوا، منیش پێمخۆشە وەك ئێوە یاری بکەم.

شازادە غازی وەك ئێمە کارەکانی خۆی ئەنجامدەدا، وەك بۆیاخکردنی پێڵاو، هەر قوتابییەك سندوقێکی هەبوو بۆ ئەوەی پێداویستی و کەرەستەکانی تێدا دانێت، سندوقەکان دەپشکێنران تا بزانرێت شتی قەدەغەکراوی تێدا هەڵنەگیراوە، بۆ نمونە خواردن قەدەغە بوو بهێنرێتە هۆڵەکەوە، یان لە سندوقەکەدا هەڵبگیرێت، بۆیە سندوقەکەی شازادە غازیش وەك سندوقەکانی ئێمە دەپشکنرا.

هەندێك مامۆستای وەك (فازل ئەلجەمالی و ئەحمەد ئەلمەناسفی و

عەبدولمەسیح ئەلوەزیر) لەسەر داوای باوکی دەهاتنە کۆلێژ و وانەی تایبەتییان لە بواری کۆمەڵایەتیدا بە شازادە غازی دەگوتەوە.

زۆر جار غازی توندتر لە قوتابییەکان مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، هەڵوێستێك لە بیرم ناچێت و ڕوونی دەکەمەوە چۆن غازی وەك قوتابیانی تر مامەڵەی لەگەڵ نەدەکرا، بەڵکو توندتر لەوانی تر. جارێکیان چووین بۆ لای پزیشکێك لە نەخۆشخانەیەکی نزیك، بۆ ئەوەی مۆڵەتی پشوودانی نەخۆشی وەربگرین، یان داخڵی نەخۆشخانەیەك بکرێین، غازیشمان لەگەڵ بوو، غازی هەر بە ڕاستی نەخۆش بوو، مۆڵەتمان وەرگرت و غازیش وەك ئێمە مۆڵەتی پشوودانی وەرگرت، کاتێك گەڕاینەوە بۆ کۆلێژ، جێگری فەرماندەی کۆلێژ ڕائید سەعید سەلمان بێ لێکۆڵینەوە لە تەندروستی غازی مۆڵەتەکەی لێوەرگرت و ناردی بۆ گۆڕەپانی مەشقکردن، ئێمەش هەمووومان بۆ پشوودان. ڕائید سەعید سەلمان جێگری فەرماندەی کۆلێژ لە باشترین ئەفسەرانی ئەو سەردەمەی عێراق بوو، زۆر جدی و بە پرەنسیپ بوو، بەڵام فەرماندەی سریەی ئێمە نەقیب سەیید ئەحمەد مەحموود بوو.

شا فەیسەڵ لە کاتە جیاوازەکاندا بەبێ ئاگادارکردنەوە، ناوە ناوە سەردانی کۆلێژی دەکرد. لە بیرمە لە ساڵی ١٩٢٩، لە کاتێکدا ئێمە لە هۆڵەکەدا لە حاڵەتی نا نیزامیدا بووین و هەریەك بە کاری خۆیەوە سەرقاڵ بوو، یەکێك گۆرانی دەگوت و یەکێك ڕیشی دەتاشی و یەکێکی تر بە دەنگی بەرز لەگەڵ هاوڕێکەی قسەی دەکرد، گوێمان لە فەرمانی "وریابە"

بوو، دەبینین ڕووبەڕوو شا فەیسەڵ لە بەردەمماندا وەستاوە و فەریق جەودەت پاشا ئەلعەزاوی سەرۆکی پاسەوانەکانی لەگەڵدایە. ئێمەش هەرزوو کەوتینە خۆمان بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگەکانمان، وتی: "ڕۆڵەکانم پەلە مەکەن". لەسەر کورسییەکی بچووك دانیشت و شازادە غازی لەو کاتەدا پێڵاوەکانی بۆیاخ دەکرد، مەلیك چاوی خستبووە سەری، دوای ئەوە دۆلابەکەی پشکنی. هەروەها لە بیرمە شا فەیسەڵ بە بۆنەی دەرچوونمانەوە ئێوارەئاهەنگێکی بۆ سازکردین و وەزیرەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، لەو چەند کاتە کەمەی شا فەیسەڵمان تێدا بینی توانیمان سادەیی و خۆشەویستی ئەو بۆ ئێمەی قوتابی بەدیبکەین. کەسێکی هێمن و بەڕێز بوو، ئاشتی لە ڕوخساریدا بەدیدەکرا. کەسایەتییەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو کە نەتدەتوانی ڕێزی نەگریت.

لە خوێندندا زیاتر حەزم بە لای لایەنی زانستیدا بوو، لەو بابەتانەی زۆر تیایدا سەرکەوتوو بووم و ئامادەگییەکی بەرچاوم تیایاندا هەبوو، مەشقی ئازاد بوو. لە بیرمە بابەتەکە ناوی (خولەکە شێتەکە) بوو. سرووشتی چالاکییەکە وایدەخواست ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات دەبێت زۆر بەهێز بێت. ئەگەرنا ناتوانرێت ئەنجام بدرێت، وێڕای ئەو کارامەییانەی دەبوو لە مەشقەکەدا ئەنجام بدرێت. کە بریتیبوو لە چەندین جۆر تێچەقاندن و لێدان بە قۆناغە تفەنگ و لێدانی پێنج فیشەك. لەم ڕاهێنانەدا زۆر سەرکەوتوو بووم، ڕێککەوت جارێکیان ژەنەڕاڵێکی یابانی سەردانی کۆلێژی کرد، کۆلێژ ئەم چالاکییەی ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی ژەنەراڵە یابانییەکە ببینێت، بە جۆرێك کارەکان ڕێکخرابوون کاتێك ژەنەراڵ

دەگات من ئەو چالاکییە ئەنجام بدەم، لە بەردەمیدا ئەنجامم دا و لە ئەداکردنم ڕازی بوو، نەك هەر من، بەڵکو سەرسامبوو بە تەواوی ڕاهێنانەکانی کۆلێژەوە. حەزیشم لە سێباز بوو و سەرکەوتوش بووم لە ئەسپ سواریدا و لەو بابەتەدا سوارچاکێکی باش بووم.

مامۆستای زمانی عەرەبیمان ئەحمەد ئەلمەناسفی بوو، هاوکات سکرتێری وەزارەتی بەرگریش بوو، لە یەکێك لە وانەکانی عەرەبیدا فەرمودەیەکی پێغەمبەری بۆ باسکردین و وتی: "پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەفەرموویێت: (**إياكم وخضراء الدمن**" **قالوا: وما خضراء الدمن يا رسول الله؟ قال:" المرأة الحسناء في المنبت السوء**"؟ شرۆڤەی فەرموودەکەی بۆ کردین و وتی: ئەم فەرموودەیە دەشێت لەسەر پیاویش جێبەجێ ببێت". لە وانەیەکی تری زمانی عەرەبیدا ویستمان مامۆستا لە بابەتەکە لابدەین، هاوڕێیان هانیان دام لێی بپرسم و هەر دەیانگوت فوئاد پرسیاری لێبکە، منیش پرسیارم لێکرد: مامۆستا ئەگەر جارێکی تر باسی (خضراء الدمن)مان بۆ بکەیت، مامۆستا لێم توڕە بوو و وتی: "تۆ عەرەبی نازانیت، دەتەوێت گاڵتەم پێبکەیت" ڕەوانەی زیندانی کردم. لە بیرەوەرییەکانی ترم لەگەڵ ئەلمەناسفیدا، جارێکیان داوای لێکردین ڕاپۆرتی لەسەر زمانی عەرەبی بۆ ئامادەبکەین، داوام لە یەکێك لە هاوڕێکانم کرد، کە لە کۆلێژی شەریعە دەیخوێند، ڕاپۆرتەکەم بۆ بنووسێت. ڕاپۆرتەکەی بۆ نووسیم و ناوی منی لەسەر دانا و پێشکەشی مامۆستام کرد، ڕاپۆرتەکە بە ئاستێکی بەرز نووسرابوو، بەڵام مامۆستا سفری دامێ، بە تووڕەییەوە چووم بۆ لای، لە بیرمە پێمگوت: ئەو

ڕاپۆرتەی پێشکەشمکرد زۆر باشە و هیچ هەڵەیەکی تێدا نییە، چاوەڕێی نمرەیەکی باش بووم، چونکە لە ڕاپۆرتەکانی تردا کە ئاستیان وەك ئەم نەبوو نمرەی باشت دەدامێ. وتی: "بەڵێ! نمرەی باشم دەدایتێ، چونکە خۆت دەتنووسین، بەڵام ئەمەیان خۆت نەتنووسیوە، بۆیە سفرم دایتێ".

سینەما هۆکارێکی سەرگەرمکردن بوو بۆ ئێمە و حەزمان لێدەکرد، هەر کە ئێوارەی پێنج شەممە دەهات خۆمانمان لەسەر کورسی سینەما دەدیتەوە. ئێوارەیەکیان لە سینەما "ئەلوەتەنی" دانیشتبووین، ژنان لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوون و بە عەباکانیان خۆیان داپۆشیبوو، نەمانزانی کێن؟ لە کاتی نیشکردنی فیلمەکەدا کچێك هەستا و کورسییەکەی خۆی بەجێهێشت تا قسە لەگەڵ کچێکی تردا بکات، یەکێك لە کوڕەکان چوو لە شوێنەکەی دانیشت، کاتێك کچەکە گەڕایەوە لەبەر ئەوەی تاریکبوو نەیزانی شوێنەکەی گیراوە لە باوەشی کوڕەکەدا دانیشت و قیژاندی، لەگەڵ قیژاندی سەیری بارودۆخەکەم دەکرد، هەستام و هەوڵم دا فرێیدەمە نهۆمی دووەمی هۆڵەکە، چونکە هۆڵەکە دوو نهۆم بوو، فیلمەکە ڕاوەستێنرا و گڵۆپەکان هەڵکران، گوێم لێبوو هاوڕێکانم دەیانگوت: نەکەی فوئاد، نەکەی. زۆر خراپ لێم دا، تا ئەوەی ئینزیباتەکانیش هاتنە ناوەوە و ئەوانیش تێروپڕیان لێدا، ئیتر ئێمە بەجێمانهێشتن و گەڕاینەوە بۆ کۆلێژ، ئێمە نەمانزانی ئەو ژنانە کێن، بەڵام دواتر دەرکەوت ژنی ئەفسەرانی کۆلێژ بوون، واتە خێزانی دەستەی مامۆستایانی کۆلێژ و ئەرکان بوون. ماڵی مامۆستایانی کۆلێژ لە نێو کۆلێژی سەربازیدا بوون. کاتێك ژنەکان لە کاتی لێدانەکەدا ناوی منیان بیست و بە جلوبەرگی

کۆلێژی سەربازییەوە منیان بینی، باسی منیان بۆ مێردەکانیان کردبوو.

بەیانی ڕۆژی دواتر، واتە ڕۆژی شەممە خوالێخۆشبوو ئەمین ئەلعومەری کە بریکاری فەرماندەی کۆلێژ و فەرماندەی کۆلێژی ئەرکان بوو، بانگی کردم و پێیگوتم: "فوئاد! شەوی پێنجشەممە لە کوێ بوویت"؟

– گەورەم لە سینەما.

– بۆچی شەڕت کرد؟

چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، دیاربوو تەواوی چیرۆکەکەی دەزانی، سوپاسێکی پلە یەکی بۆ دەرکردم.

لە بیرەوەرییەکانی ژیانی قوتابیێتی، جارێك چووین بۆ ئاهەنگێك کە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی ڕێکیخستبوو، من و عەبدولقادر عیززەت و شێخ ساڵەح شێخ موحەممەد شێخ سەلام بووین، دەزگیرانەکەی شێخ ساڵەح خوێندکاری خانەی مامۆستایان بوو. نرخی بلیت (٣) ڕوپیە بوو، ئاهەنگەکە بریتیبوو لە پێشکەشکردنی شانۆیەك لەسەر هۆڵی خانەی مامۆستایان لە کەرخ. بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان مەتی عەقراوی بوو، بلیتی نمرە یەکمان گرت، بەڵام کورسییەکانی ڕیزی پێشەوە گیرابوون و لە ڕیزی دووەم دایاننناین، یەکێك لە هاوڕێیان ڕەخنەی گرت و وتی: ئێمە بلیتی نمرە یەکمان کڕیوە، بۆچی لە ڕیزی یەکەم دامان نانێن؟ هەستاین و چووینە ڕیزی یەکەم، مامۆستا مەتی عەقراوی ڕێگری لێکردین، یەکێك لە قوتابییەکان دای لە مەتی عەقراوی و بۆی دەرچووین و قوتابیانی خانەی مامۆستایان بە دواماندا، بەڵام لە نێوان کوچە و

كۆلانەكان خۆمان ونكرد و خۆمان گەیاندە چایخانەی ئەلبەیروتی و لەوێوە تەكسییەكمان گرت و گەڕاینەوە بۆ كۆلێژی سەربازی. دیارە مامۆستا مەتی عەقراوی پەیوەندی كردبوو بە وەزیری بەرگرییەوە، وەزیریش بە كۆلێژی سەربازییەوە، هەر كە گەیشتینە كۆلێژ، ئەفسەری ئێشكگر بە تۆمەتی سەرخۆشی و ئاژاوەگێڕی رایگرتین و ڕەوانەی لای پزیشكی نەخۆشخانەی سەربازی كراین، پزیشكی ئێشكگر ئەفسەرێكی ئەڵمانی بوو بە ناوی (ڤاینەر) بە پلەی ڕائید. حەزی لە كۆكردنەوەی پولی پۆستە (طابع) بوو. یەكێك لە هاوڕێیانمان پولێكی سەردەمی شێخ مەحمودی پێبوو دایێ و مانای پولەكەی بۆ باسكرد، پزیشك ڕاپۆرتی خۆی نووسی كە هیچ سەرخۆشكەرێكیان نەخواردووە و سەرخۆش نین. هەرواش بوو، هیچ سەرخۆشكەرێكمان نەخواردبووەوە. ڕۆژی دواتر سزای قورس نەدراین و بە فەرمانی وەزیری بەرگری هەریەكە ٧ ڕۆژ زیندانی كراین.

## فریاكەوتنی خاوەن گالیسكەیەك

ساڵی ١٩٢٨ بەغدا شارێكی بچووك بوو، كۆلێژی سەربازی لە ناوچەی كەڕادە ئەلشەرقییە و لە نزیك پردی موعەللەقی ئێستا بوو. لە ناوچەی سەیید سوڵتان عەلی بەلەمێكمان بە كرێ دەگرت و لە دیجلە دەیپەڕاندینەوە بۆ بەری كەڕادە، نەفەری بە چوار عانە.

بیرمدێ كاتژمێر ١١ی شەو بوو، هیچ بەلەمێك نەمابوو لەو كاتەدا خەڵك بپەڕێنێتەوە و پارەی ئەوەشم پێنەبوو تاكسییەك بە كرێ بگرم، بۆیە بە

ڕێگەی (سەدوە)دا هاتم کە دەچووم بۆ کۆلێژی سەربازی، بەو جادەیەی ئێستا پێی دەڵێن شەقامی (ئەبو نەواس) تێپەڕیم، ناوچەی نێوان شەقامی ئەبو نەواس و شەقامی ئەلسەعدون تا دەگاتە کەڕادە هەمووی باخ و باخات بوو، بەر لەوەی بگەمە ناوچەی پۆلیسخانە کە پێی دەوترا (رەخیتە))، بە کۆلانێکی درێژی نێوان شەقامی ئەبو نەواس و شەقامی ئەلسەعدوندا تێپەڕیم، گوێم لێبوو خاوەن گالیسکەیەك بەو شەوە تاریکە هاوار دەکات و دەپاڕێتەوە و گلۆپەکانی گالیسکەکەی هەڵکرابوون، دۆخەکە ئەوەی دەگەیاند ڕوداوێك ڕوویدابێت یان ڕووبدات، منیش یەکسەر دەمانچەکەم دەرهێنا و چەند فیشەکێکم تەقاند، دەبینم چەند پیاوێك هەڵدێن و وازیان لە خاوەن گالیسکەکە هێنا کە لە ترساندا دەلەرزی، گەیشتمە لای و داوام لێکرد بە گالیسکەکەی بمگەیێنێتە کۆلێژی سەربازی، وتی: "فەرمانتانە گەورەم".

لەو ترس و تاریکەشەوەدا نەیتوانی بمبینێت، کاتێك گەیشتینە کۆلێژی سەربازی و چووینە نێو گۆڕەپانە ڕووناکەکەیەوە، هەر کە لە گالیسکە دابەزیم و سەیریکرد هێشتا منداڵم، بە هەردوو دەستی دەیکێشا بە سەری خۆیدا و دەیگوت:

– ئەم منداڵە بچکۆلەیە ڕزگاری کردم!

خاوەن گالیسکەکە هەر بە خۆیدا دەشکایەوە، چونکە من کە ڕزگارم کردبوو زۆر لە تەمەندا لەو منداڵتر بووم. ئەمە چەند بیرەوەرییەکی سەردەمی خوێندنم بوو.

## لەگەڵ شازادە غازی لە ئامێدی

لە پشووی هاوینی ساڵی ١٩٣٣ سەردانی ماجید مستەفای خاڵم کرد، ئەو کات قائیمقامی ئامێدی بوو. کاتێك زانیمان شازادە غازی لەگەڵ یەکێك لە خاڵەکانی کە ئەلشەریف عەلی بوو لەگەڵ موتەسەریفی موسڵ بۆ چارەسەری کێشەکان هاتووەتە ئامێدی، زۆر ئاسایی بوو من نەچم بۆ پێشوازیی، چونکە لەو کاتەدا هیچ سیفەتێکی فەرمیم نەبوو، بەڵام کاتێك چوو بۆ سۆلاڤ بە تەلەفۆن پەیوەندییان پێوەکردم و وتیان شازادە غازی حەز دەکات بتبینێت. چووم بۆ لای و سلاوم لێکرد، بە رەحمەت بێت لەو کاتەدا پلەی ملازمی دوو بوو، دوو رۆژ لە سۆلاڤ مایەوە، ئەو کات هێشتا کۆلێژم تەواو نەکردبوو، چونکە غازی پێش ئێمە خوێندنی تەواو کرد.

ئەو دوو رۆژە قسە و گفتوگۆکانمان لەگەڵ شازادە غازیدا هەر لەسەر رۆژانی خوێندن بوو، ئێوارەکەی بیرەیان بۆ هێنایین، شەرمێکی زۆر دایگرتم لە خواردنەوەی بیرە لەبەرچاوی خاڵم، چونکە نەیدەزانی من لە زووەوە بیرە دەخۆمەوە، کاتێك شازادە غازی بوتڵە بیرەیەکی پێشکەشکردم، هەوڵم دا سەرنجی ڕاکێشم، بۆیە لە ژێر مێزەکەوە قاچێکم لە قاچی دا، تێکەیشت و بە خاڵمی وت: "بە فوئاد بڵێ لەگەڵمان بخواتەوە، چونکە شەرم دەکات" خاڵم ماجید گوتی: "وەڵا گەورەم ئەگەر دەزانیت فوئاد پێشتر خواردویەتییەوە با لەگەڵمان بخواتەوە، لەگەڵ تۆ بخواتەوە باشترە وەك لەوەی لەگەڵ کەسانی تر بخواتەوە، ئەگەر تا ئێستاش نەیخواردۆتەوە وا باشترە تا کۆلێژ تەواو دەکات نەخواتەوە".
غازی وەڵامی دایەوە: "فوئاد بیرە دەخواتەوە و لەگەڵ خۆمدا لە بەغداد

خواردویەتییەوە" خاڵم وتی: "کەواتە با بخواتەوە"، دوای ئەوە ئیتر لەگەڵ خاڵم ماجید لە ئامێدی پێکەوە دەمانخواردەوە.

هێشتا بیرەوەری ئەو دوو ڕۆژەی غازیم لە بیرە کە لە سۆلاڤ بەسەرمانبرد، قسەکەرێکی خۆش گوفتار بوو، وای لێدەکردی هەست بە بەختەوەری بکەیت لەگەڵیدا، بەڕاستی پیاوێکی باش و بەشووش بوو، بەڵام هۆکاری ئەوەی شازادە غازی هاتبوو بۆ ئامێدی، وەك جێگری مەلیك هاتبوو، ئامانج لە هاتنەکەشی بەدیهێنانی ئارامی بوو لە ناوچەکە. وەك بزانم بەر لە هاتنی، ناوچەکە چەند چالاکییەکی تایبەتی بەخۆوە بینیبوو.

بۆ نیشتەجێکردنی ئاشوورییەکان، دەستەیەك لە شارەزایانی ئاودێری بە سەرۆکایەتی ئەحمەد سوسە هاتنە ناوچەکە بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنێتی ڕاکێشانی ئاو لە زێی گەورەوە بۆ ناوچەی دەشتازێ و خەملاندنی بڕی تێچوونی، بە مەبەستی نیشتەجێکردنی ئاشوورییەکان لەو ناوچەیە، بەڵام ڕوداوی ئاشوورییەکان ڕوویان دا و لەبەر بڕانی ڕێگەی گەڕانەوە، ئەحمەد سوسە و گرووپەکەی لە ئامێدی گیریان خوارد.

لە ڕاستیدا نووری ئەلسەعید ماوەیەك لەوەوپێش هاتبووە ناوچەکە و لەگەڵ مار شەمعون و سورمە خانی پووری مار شەمعوندا کۆبووبوەوە و گفتوگۆی زۆری لەگەڵ کردبوون، لەو کاتەدا ئاشوورییەکان داوای ئۆتۆنۆمییان لە حکومەتی عێراقی دەکرد. مار شەمعون لەسەری ئامێدی ساباتێکی هەبوو و پاسەوانی تایبەتی هەبوو، جارێکیان سەردانمکرد و بووم بە میوانی، دوو شەو لای مامەوە، پیاوەکانی زۆر ڕێزیان لێدەگرت و

تا ڕادەی پیرۆزی لێیان دەڕوانی. سورمە خانیش خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز بوو، زیاتر لە مار شەمعونی برازای، لە ڕاستیدا تا ئێستاش ئەو سەردانەم لە بیرەوەریدا ماوە، کە چەند ڕێزیان لێگرتم و چەند خۆشەویستییان لە ناخی دڵمدا بەجێهێشت.

## ڕووبەڕوو بوونەوەی نێوەندگیرییەکی شاهانە

جوانترین بیرەوەریم لەسەر ڕۆژانی خوێندن لەگەڵ شازادە غازیدا لە کۆلێژی سەربازی بگێڕمەوە، ئەم ڕوداوە دەگمەنەیە کە دەمەوێت بەم ڕوداوە کۆتایی بەم بەشەی بیرەوەرییەکانم بێنم:

خوالێخۆشبوو عەبدولقادر ئەلخەتیب فەرماندەی ئەو (حەزیرەیە) بوو، کە شازادە غازی و قوتابیانی پۆلی پێشکەوتووی لە خۆ دەگرت بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٢٨-١٩٢٩. پەیوەندی نێوان غازی و عەبدولقادر زۆر پتەو بوو، هەندێك جار شازادە عەبدولقادری لەگەڵ خۆیدا دەبردەوە بۆ کۆشك، بۆ ئەوەی ڕۆژانی پێنج شەممەش لەگەڵ یەکدا بن، ئا لێرەوە عەبدولقادر پەیوەندیی لەگەڵ مەلیك و شاژنیشدا دروستکرد.

پێدەچێت عەبدولقادر داوای لێیان کردبێت، داوا لە بەڕێوەبەرایەتی کۆلێژ بکەن بۆ ئەوەی چاویان پێوە بێت، مەلیك لەگەڵ پاسەوانی یەکەمیدا نامەیەکی بۆ ئەو مەبەستە بۆ کۆلێژ ناردبوو، نامەکە هەرایەکی گەورەی نایەوە، ئەفسەری ئێشککگر فیکەی لێدا و کۆی کردینەوە، پێشکەشی کردین بە ڕائید سەعید سەلمان. کە نیشانەی تووڕەیی لە دەموچاویدا دیار بوو. ڕائید سەعید سەلمان ڕووی تێکردین و وتی:

من بە فەرمانێکی شاهانە ئێوەم کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی پێتان بڵێم قوتابییەك لە پۆلی پێشکەوتوو کە عەبدولقادر ئەلخەتیبە لای خاوەنشکۆ واسیتەی کردووە بۆ ئەوەی یارمەتی بدەین و دەریچێنین، بۆ زانیاریتان عەبدولقادر خۆی قوتابییەکی زیرەکە و هیچ پێویستی بە یارمەتی نییە و بە ڕەنجەشانی خۆی لە هەموو وانەکان دەردەچوو و دەبوو بە ئەفسەر لەگەڵ هاوڕێکانیدا، بەڵام لە بەر ئەو ڕەفتارەی بەڕێوەبەرایەتی کۆلێژ بڕیاری دا واسیتەکەی خاوەنشکۆ ڕەتبکاتەوە و عەبدولقادر ئەلخەتیب لە کۆلێژ فەسڵ بکرێت. چونکە کەسێکی ئاوەها شایانی ئەوە نییە ببێتە ئەفسەر لە سوپای عێراقدا، بەڵام سۆزی باوکایەتی فەرماندەی کۆلێژ تۆفیق وەهبی بۆ عەبدولقادر، وایکرد بەڕێوەبەرایەتی بڕیارەکە لە فەسڵکردنەوە بگۆڕێت بۆ هێشتنەوەی لە پۆلەکەی خۆیدا بۆ ئەوەی ببێتە پەند بۆ کەسانی تر.

ئەمجا ڕائید سەعید سەلمان، شازادە غازیی لە ڕیز هێنایە دەرەوە و لە بەردەمماندا وەستاندی و پێیگوت:

غازی! بە خاوەنشکۆ بڵێ کۆلێژی سەربازی لە دەستێکی پاك و ئەمیندایە، پێویست ناکات دەست لە کاروبارەکانی وەربدات، خاوەنشکۆ ئەرکی گرنگتر و گەورەتری لەسەرە، وەك لە کاروباری کۆلێژ. بەڕاستی وانەیەکی جوانبوو کە تا ئێستاش لە ناخمدا دەزرنگێتەوە.

## لە خوڕەوشت و ئارەزووەکانی شا غازی

لە ماوەی هاوڕێیەتیم لە کۆلێژی سەربازی و ئەمجا بوون بە پاسەوانی تایبەتی شازادە غازی، بۆم دەرکەوت بێفیزی و خاکێتی لە دیارترین سیفەتەکانین. پیاوێك بوو بە شێوەیەکی سەیر بێ فیز بوو، ئەوەی غازیی ناسیبا، بە ئاسانی دەیتوانی پەی بە بێفیزی و ڕادەی خۆشویستنی ببات. لە ژیان و ڕەفتاریدا تا ئەوپەڕی سادە بوو. پارێزەری پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی بوو لەگەڵ هاوڕێکانیدا، زیاتر وەك ئەفسەرێکی بەك ئەستێرە دەردەکەوت وەك لەوەی پادشای عێراق بێت، لە ڕاستیدا ئەفسەرێك بوو پڕ بە گیانی سەربازی، زۆر بێزار دەبوو لە هەموو شێوەکانی پێشوازیی فەرمی، بە تایبەت لە کاتەکانی دەرەوەی دەوامی فەرمی، تەنانەت کاتێك دەهات بۆ لای ئێمە، ئێمەش هەڵدەستاین و سلاومان بۆ دەگرتەوە، بە قەڵسبوونەوە دەیگوت: "تەنانەت لەم پێنج خولەکەشدا ئازادیم زەوت دەکەن". سەرنج بدە ئەو سلاو و ڕێزگرتنەی ئێمەی، بە زەوتکردنی ئازادیی خۆی دەزانی!

زۆر بێزار بوو لە هەموو شێوازێکی پاسەوانیکردنی، زۆر جار پێی دەگوتم: "زۆرم پێخۆشە بچمە چایخانەی (ئەبو عەلی) لە شەقامی ئەبو نەواس". هەندێك جاریش پێی دەگوتم: "فوئاد دەزانیت من کێم؟ من زیندانییەکی بەڕێزم، چەند حەز دەکەم ئێستا لە بازاڕی سەرای و شەقامی ئەلڕەشید پیاسەیەکم کردبا"! مەلیك زۆر حەزی لە ئازادی کەسی بوو، لە کاتی ئەرکی فەرمیشدا وەك مەلیك ڕەفتاری نەدەکرد، تەنانەت بێفیزی و

خاکێتی لە ڕەفتارەکانیدا سەرنجی میوانە فەرمییەکانیشی ڕاکێشا بوو، کاتێك موحەممەدی کوڕی ڕەزا شای ئێران کە ئەو کات شازادە بوو، لەگەڵ سەرۆك وەزیران ئاغای جەم سەردانی عێراقیان کرد، لەگەڵ شازادە عەبدولئیلاھ و سەرۆکی دیوانی شاھانە چوینە پێشوازییان بۆ سەر سنووری ئێران لە ناوچەی مونزرییە، تا ئەوێ بە ئۆتۆمبێل ھاتبوون، لە بەغداوە بە فڕۆکە چوونە میسر بۆ مارەبڕینی خوشکی مەلیك فاروق بۆ خۆی، موحەممەد ڕەزا پەھلەوی زۆر سەری سوڕما لە ھەڵسوکەوتەکانی مەلیك غازی، کە دەیبینی بە دەستی خۆی جگەرە پێشکەش بە وەزیرەکانی دەکات، یان بە دەستی خۆی چاییان بۆ دادەنێت، ھەندێك جار جگەرەی بۆ وەزیرەکانیشی دادەگیرساند.

غازی زۆر حەزی لە سەمونی سوپا بوو، لە ھەموو خواردنە فەرمییەکانیدا ھەر ئەو سەمونە بۆرە سەربازییەی دەخوارد، بە بەردەوام سەمونی سەربازی لەسەر سفرەی مەلیك غازی نەدەبڕا. لەو ئێوارە خوانەی مەلیك غازی لەسەر شەرەفی کوڕی شای ئێران کردی، دانانی سەمونی بۆر لەسەر سفرە، سەرنجی کوڕی شای ڕاکێشا و پرسیاری لە مەلیك کرد، ئەمە چییە دەیخۆیت؟ وتی: ئەمە سەمونی سەربازییە، ئەو کاتەی قوتابی کۆلێژی سەربازی بووم ئەم نانەم دەخوارد، بۆیە لەسەری ڕاھاتووم و ناتوانم نانی تر بخۆم.

بێفیزی و خاکیبوون لە خواردن و جلوبەرگی ڕۆژانەیدا بەدیدەکرا، سفرەی ڕۆژانەی ھیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ سفرەی ھەر

فەرمانبەرێکی ئاسایی عێراقیدا، جلوبەرگیشی زۆر ئاسایی بوو، هەمو جلوبەرگەکانی (وارمە)ی هیندیی بەرگدروو لە بەغداد بۆی دەدروو.

سیفەتێکی تر کە بە ڕوونی لە کەسایەتی غازیدا بەدیدەکرا، بوێریی و حەزی ئاڵنگاریی بوو، ئەگەر سەیرێکی سرووشتی پەیوەندییەکانی عێراق – بەریتانیا لە سییەکان و هەڵوێستی غازی لە بەرامبەر باڵوێزی بەریتانیا لە دەستتێوەردانی بکەین لە کاروباری عێراقدا، ئەوجا دەزانین لە هەڵوێستەکانی لە بەرامبەر بەریتانیادا چەند بوێر بووە! وێڕای ئەوەی پیاوانی دەوروبەری، زۆربەیان هێندە وەلائیان بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا هەبوو هێندە وەلائیان بۆ عەرشی عێراق نەبوو. ئەم ڕاستییە ناتوانین چاوی لێداخەین و ڕەنگە دواتر باسی بکەین. لە جۆرەکانی تری بوێریی، سەرکێشی بوو بە لێخوڕینی فڕۆکە و ئۆتۆمبێل. لە سوارچاکیدا لەسەر ئاستی کۆلێژی سەربازیش یەکەم بوو.

شازادە غازی تا دوا ڕادە کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، حەزی لە دۆستایەتییەکی توندوتۆڵ بوو بەبێ هیچ تەکلیفێك، زۆریش کەسێکی ڕاشکاو و گاڵتەچی بوو، لەگەڵ ئەوەش دەیتوانی چەندین کاتژمێر بە تەنها بمێنێتەوە و بە حەزەکانی ڕابگات، زۆربەی جار بە شەوان بە تەنیا لە کۆشکی حارسییە بە بێداری دەمایەوە و بە ئامێرە پیشاندەرە تایبەتەکەی کە بۆ خۆی کاری پێدەکرد، سەیری فیلمی سینەمایی دەکرد. کاتێك بوو بە مەلیك، بە پێچەوانەی کۆلێژەوە، پەیوەندییەکانی کەمکردنەوە، چونکە لە کۆلێژ هەستیدەکرد وەك هەر خەڵکێکە و بەشێکە

لە ئەوان و هەر خۆشی حەزی لە دوورکەوتنەوە لە خەڵك نەدەکرد و حەزی نەدەکرد جیاوازبێت لێیان.

لە سیفەتەکانی تری کە باشم لە بیرە، بە هەندێك هەڵوێست زوو کاریگەر دەبوو و هەڵدەچوو، بەڵام هەرزوو هێور دەبووەوە و لەو بڕیارانەی لە کاتی تووڕەبووندا دابووی، پەشیمان دەبووەوە. لە هەندێك هەڵوێستیدا زۆر شەرمن و بە ئاشکرا لە دەم و چاویدا شەرم دیار بوو، مەلیك غازی زۆر حەزی لە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بوو، وەك سوار لەگەڵ ئەسپدا مامەڵەی لەگەڵ ئۆتۆمبێلدا دەکرد. زۆر خێرا و سەرکێشانە ئۆتۆمبێلی لێدەخوڕی.

یەکێکی تر لە حەزەکانی زۆر لێخوڕینی فڕۆکە بوو. زۆر حەزی لە بەدواداچونی هەواڵی فڕۆکە و تازەترین دروستکراوەکانی بوو، حەزی لە چاوپێکەوتن بو لەگەڵ پسپۆڕان و ئەندازیارانی فڕۆکە و باسکردنی جۆر و تایبەتمەندییەکانی لەگەڵیان. بەردەوام گوێی لە هەواڵی فڕۆکەیەك دەگرت کە تازە دروستکرابوو، بە تێکەڵکردنی بەنزین و نەوت کاریدەکرد، چۆن دەفڕێت و دێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی فڕیوە. هەروەها زۆر گرنگیی دا بە فڕۆکەی (بلوبێرد)، کە لە سەر داوای شا غازی هێنرایە عێراق، بریتیبوو لە فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگر، شەش سەرنشینی هەڵدەگرت، سواربوونی زۆر خۆشبوو، ئەو فڕۆکەیە فڕۆکەوانێکی ئینگلیزی هێنایە عێراق و ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ بەغداد و چەند رۆژێك لە عێراق مانەوە، چەندین وێنەی یادگارییان لەگەڵ شا غازیدا گرت، مەلیك زۆر دڵخۆشبوو بەو

فرۆکەیە و بە قسەکانی فرۆکەوانە ئینگلیزییەکە. حەزیدەکرد بۆ خۆی ئۆتۆمبێلەکەی چاك بکاتەوە، هەروەها ئامێرەکانی وێنەگرتن و سینەما و ئێزگە تایبەتەکەی. زۆر حەزی لە دانیشتن بوو لەگەڵ "عەبوش"ی وێنەگرە تایبەتەکەی، چونکە زۆربەی قسە و باسەکانیان لەسەر ئامێرەکان بوو، واتە لە هەندێك لە حەزەکانیان زمانێکی هاوبەش هەبوو لە نێوانیاندا.

ڕاوکردن یەکێکی تر بوو لە ئارەزووەکانی. زۆر جار بەبێ پاسەوان دەچووینە شوێنە دوورەکان بۆ ڕاوکردن و چەند کەسێکمان لە خەڵکی ناوچەکە لەگەڵ خۆمان دەبرد، واتە ئەو کەسانەی شارەزای ناوچەکە بوون. هەرگیز بێزار نەدەبوو لە ڕاونانی ئاسك، کە چەند دانەیەکمان دەکوشت، دەگەڕاینەوە بۆ نێو ئەو خێوەتەی پشوومان لێدەدا. کە دەگەڕاینەوە، هەرچی ئەو ئاسکانەی ڕاومان کردبوون بەسەر وەزیرەکان و گەورەپیاوانی دەوڵەتدا دابەشیدەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر حەزی لە وەرزش و بە تایبەتی یاری (تەنس) بوو، زۆر جار دەچوو بۆ (تەل ئەلملح)و لەوێدا مومارەسەی حەزەکانی دەکرد.

لە ڕاستیدا ئێمە دەچووین بۆ زۆر ناوچەی جیاواز، جارێکیان ناردی بە دوای شێخ حەمید مامی شێخ عەجیل ئەلیاوەر، وەك ڕاوچییەکی شارەزا لە ناوچەکە لەگەڵ مەلیك کەوت، لە ناوچەی پردی (ئەلحوڕییە) خێوەتمان هەڵدا، ئۆتۆمبێلەکەی مەلیك مارسیدسێکی تایبەت بە ڕاوکردن بوو، بە خۆی لێیدەخوڕی، شەش کەس لە ئۆتۆمبێلەکەدا بووین، مەلیك کەوتبووە

شوێن ئەو ئاسکانەی هەڵیساندبوون، بە دەستێك ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و بە دەستەکەی تری تەقەی لێدەکردن، دۆخەکە زۆر سەرکێشانە بوو، لەپڕ کەوتینە چاڵێکەوە، بەهۆی کەوتنە چاڵەکەوە تفەنگەکان کە پێمان بوون تەقین و دەستم بریندار بوو، مەلیك بۆ خۆی تەداوی کردم و بۆ چارەسەرکردن فەرمانی گەڕاندنەوەمی دا بۆ بەغداد، بەهەرحاڵ بیرەوەرییەکانی ڕاوکردن لەگەڵ مەلیك غازیدا زۆر زۆرن.

دو سەگەکەی هیتلەر

مەلیك بە گشتی حەزی لە ئاژەڵ بوو، هەندێك ئاژەڵ لە نێو باخچەکەی کۆشکی ئەلزهوردا بوون، مەلیك گرنگی پێدەدان و حەزی لێدەکردن. هیتلەر دوو سەگی گەورەی ئەڵمانی بە دیاری بۆ ناردبوو، یەکێکیان بە تەزووی کارەبا تۆپی و ئەوی تریان مایەوە، هەریەکە و هێندەی پڵنگێك گەورە بوون، مەلیك بۆ تۆپینی سەگەکە زۆر دڵتەنگ بوو، بۆیە نامەیەکی بۆ عەبباسی مەحموود ئاغای سەرۆکی هۆزی پشدەر نووسی و داوای لێکرد سەگێکی زۆر گەورەمان بۆ بنێرە. سەگەکە بە ئۆتۆمبێلێکی لۆری گەیەنرایە کۆشك کە لە سلێمانییەوە هاتبوو، لەو کاتەدا مەلیك خەوتبوو، کرێی لۆرییەکەم دا و ڕۆیشت. بە دابی کوردەواری خۆمان یەکەم ژەمی خواردنم بە سەگەکە دا، کە بریتیبوو لە هێلکەی کوڵاو بە ڕۆن، دوای ئەوە پەیوەندیم بە مەلیکەوە کرد کە سەگەکە لە سلێمانییەوە گەیشتووە. هەر لەو کاتەدا گوێمان لە وەڕین و حەپەی سەگەکە بوو کە خەریکی پەلاماردان بوو، کاتێکمان زانی سەگەکە خۆی لە ئاوێنەیەکی گەورەدا

بینیووە کە لە بەرامبەریدا هەڵواسرا بوو، وای زانیبوو سەگێکی تر لە بەرامبەرییەتی، مەلیک هات و سەگەکەی بینی و زۆر پێی سەرسام بوو. داوایکرد سەگە ئەڵمانییەکەش بێنن و وتی: "با بە شەڕیان بدەین". سەگە تازەکە زۆر دڕ بوو، هەرکە سەگە ئەڵمانییەکەی بینی هێرشیکردە سەر و خوڵماندییەوە، یەکجار دڕ بوو، کارێکی وای لێکرد هەرچیمان کرد نەمانزانی چی بکەین بۆ ئەوەی سەگەکان لە یەکتر جیا بکەینەوە.

غازی هاواریکرد: "فوئاد! چی بکەین؟ سەگە ئەڵمانییەکە خەریکە دەتۆپێت.." وتم: گەورەم ناتوانم هیچ بکەم، کێ دەتوانێت لێیان نزیک بێتەوە؟ بەڵام خزمەتکارەکان هەرزوو سۆندەی ئاوی ناو باخچەکەیان بەست بە بۆری ئاوە گەرمەکەوە و کردیان بەسەر سەگەکاندا، سەگە دڕەکە کشایەوە و بەو جۆرە سەگە ئەڵمانییەکەمان لە مردنی ڕاستەقینە ڕزگار کرد، بەڵام خراپ بریندار بووبوو و بە دەست ئازارەوە هەر دەوەڕی.

مەلیک هێندەی تر سەرسام بوو بە سەگەکە و بردی بۆ لای خۆی. کاتێك لە باخچەکەی کۆشکدا دەڕۆیشت دەتگوت شێرە. ڕاهێنانی پێکرد لەسەر پاسەوانی. تا بوو بە سەگێکی پاسەوانی زۆر نایاب. مەلیک لە سەربان دەخەوت. پێیگوتم سەگەکە ڕاستەوخۆ لە ژێر قەڕەوێڵەکەم دەخەوێت، لەبەر کەتەیی و بەهێزیی کاتێك لە ژێر قەرەوێڵەکەی مەلیك هەڵدەستێت، قەرەوێڵەکە لەگەڵ خۆیدا دەجووڵێنێت. ئەو سەگەی مەلیك و شابانو خۆشیان دەویست، شەوانە چەند جارێك لە سەربان دەهاتە

خوارەوە و ماڵی دەپشکنی و دوای ئەوە دەچووە سەرەوە و بە دەوری قەرەوێڵەکەدا سووڕێکی دەخوارد و ئەوجا دەچو لە ژێر قەرەوێڵەکەدا دەنووست.

کاتێك مەلیك کۆچی دوایی کرد، سەگەکەش مانی لە خواردن گرت، دەڵێن ئەسپەکەشی بۆی گریاوە، سەگەکە برایە ماڵی کەسێك لە دەرەوەی کۆشکی ئەلزهور، چونکە زۆر تووڕە و بێتاقەت بوو، وەك ئەوەی هەستی کردبێت شتێك ڕوویداوە، لەو ماڵەش نە نان و نە ئاوی نەخوارد بوو تا تۆپی بوو، ئەمە بوو سەگە کوردستانییەکە.

## باسی تەل ئەلملح

دەکەوێتە ناوچەی ئەبو غرێب، فڕۆکەخانەیەکی بچووکی لێبوو، غازی تیایدا فڕۆکەکانی باڵدەدایەوە و دەینیشاندنەوە، هەروەها شوێنی لێخوڕینی خێرای ئۆتۆمبێل و ئەسپسواریش بوو، پێکەوە چاییمان دەخواردەوە و هەندێك جار بیرەش. هەر کە ئێوارە دادەهات دەگەڕاینەوە، لە ڕاستیدا خانوویەکی سادە و ساکار بوو، زۆر جار شا غازی لەوێدا چاوی بە هاوڕێ نزیکەکانی دەکەوت. شوێنێکی خۆش بوو بۆ گەشت و پشوودان، هەموو گەڕان و گەشتەکانی مەلیك غازی لە تەل ئەلملح، یان لێخوڕینی ئێوارانی ئۆتۆمبێل لە ناوچەی باب ئەلشەرقی تێنەدەپەڕی.

لەو یادگارییانەی لە بیرم بێت، جارێکیان دەچووین بۆ تەل ئەلملح لە ڕێگادا ئۆتۆمبێلەکەمان پەنچەر بوو، تەنها من و مەلیك بووین، ئەو لێی

دەخورِی و منیش لە تەنیشتی دانیشتبووم، مەلیك دابەزی و جەکەکەی دەرهێنا، ئەو کات وەك ئێستا هێندە ئاسان نەبوو، خۆی بردە ژێر ئۆتۆمبێلەکە و جەکەکەی دایە ژێر ئۆتۆمبێلەکە، تایەکەی گۆڕی و دەستیکرد بە تێکردنی هەوا بە تایە پەنچەرەکە، زۆر هەوڵم دا بە خۆی لە نێو ئەو جادەیە خەریکی چاککردنی تایەکە نەبێت، بەڵام قبووڵی نەکرد و وتی: "فوئاد! ئەگەر نەتوانم ئەم کێشەیە بە دەستی خۆم چارەسەر بکەم، ئیتر بە کەڵکی چی دێم؟ مرۆڤ نابێت خەڵکانی تر بە کێشە تایبەتەکانی خۆیەوە سەرقاڵ بکات، بە تایبەت ئەگەر بتوانیت بۆ خۆی چارەسەریان بکات". لە بیرمە هەندێك ئۆتۆمبێل لامان دەوەستان و شۆفێرەکانیان ئامادەیی یارمەتیدانیان دەردەبڕی، چونکە مەلیك و ئۆتۆمبێلەکەیان دەناسی، بەڵام مەلیك قبووڵی نەدەکرد و سوپاسی دەکردن. هەر کە تەواویکرد و هەستا، جلوبەرگەکەی بە تەواوی خۆڵاویی بووبوو و هەردوو دەستی پیس بووبوون، بەڵام زۆر دڵخۆش و ئاسوودە بوو، سواربووینەوە و ملی شوێنی مەبەستمان گرتەبەر.

### غازی و عەرەبە دەشتەکییەکە

ڕوداوێکی تر لە بیرم مابێت، عەسرانێك بە ئۆتۆمبێل دەسووڕاینەوە و دەچووین بۆ تەل ئەلملح، لە سییەکاندا ئۆتۆمبێل لە شەقامەکانی بەغداد زۆر کەمبوو و ئۆتۆمبێلە تایبەتەکان لە ئۆتۆمبێلی کرێ (تاکسی) جیا نەدەکرانەوە، عەرەبێکی دەشتەکی کە هەندێك کەلوپەلی پێبوو دەستی لێڕاگرتین، مەلیك وەستا و عەرەبەکە وایزانی مەلیك کرێ کێشی دەکات،

بە زمانێکی دەشتەکی پێیگوت:

– کوڕەکە بە ڕوپیەیەك دەمبەیت بۆ خان ضاری؟

– نەخێر، بە دوو ڕوپیە.

بەڵام عەرەبە دەشتەکییەکە پێداگری کرد یەك ڕوپیە زیاتری ناداتێ، مەلیك ڕازی بوو، ئەمجا پیاوەکە بە مەلیکی وت:

– کەواتە دابەزە و ئەو کەلوپەلانە بخەرە سندوقەکەوە.

مەلیك دابەزی و منیش لەگەڵیدا، کەلوپەلەکانمان خستە سندوقەکەوە، پیاوەکە لە ڕیزی دواوە دانیشت و ئۆتۆمبێل بەڕێکەوت، ئۆتۆمبێلەکە سەر واڵا بوو، دوای ماوەیەك لە ڕۆیشتن، مەلیك بە پیاوەکەی وت:

– دەتگەیێنم، بەڵام بە دوو ڕوپیە.

پیاوەکە لە کورسییەکە هەستا و هەردوو دەستی لە ملی مەلیك ناو دەیویست بیخنکێنێت و هاواری دەکرد، خۆت وتت یەك ڕوپیە، ئێستا بۆچی پەشیمان بوویتەوە؟

مەلیك بە پێکەنینێکی قووڵەوە وتی باشە ڕازیم بە ڕوپیەیەك، هەر کە گەیشتینە خان ضاری، چەند پۆلیسێك لە بنکەکەدا کە ئۆتۆمبێلەکەی مەلیکیان دەناسی، بۆ ئەوەی ئەو پیاوە لادێیە تووشی ئیحراجی نەبێت، مەلیك هەندێك لەولاترەوە ئۆتۆمبێلەکەی ڕاوەستاند و لەگەڵیدا کەلوپەلەکانی لە سندوقەکە هێنایە خوارێ و هەرزوو سواری ئۆتۆمبێلەکە بوو و بۆی دەرچووین، پیاوە دەشتەکییەکە زۆری بەلاوە سەیر بوو،

شۆفێرەکە تەنانەت داوای یەك ڕوپیەکەشی لێنەکرد.

هەر کە سەیری دواوەمان کرد دەبینین پۆلیسەکان دەوری پیاوە دەشتەکییەکەیان داوە و پرسیاری لێدەکەن چۆن سواری ئۆتۆمبێلەکەی مەلیك بووە؟ نەمانزانی چ گفتوگۆیەك لە نێوانیاندا ڕوویدابوو!

**باری دارایی مەلیك غازی**

ئەوەی پەیوەندی بێت بە دۆخی دارایی مەلیك غازییەوە، وەك بیرمبێت ۸۰۰ دیناری بۆ بڕابوەوە، لەو پارەیە دەرماڵەی هەموو فەرمانبەری کۆشکی دەدا بە سەرۆکی دیوانیشەوە. لە ڕاستیدا مەلیك غازی وەك مەلیك لە دۆخێکی دارایی خۆشگوزەراندا نەبوو، زۆر جار ئەو پارەیەی لە بودجە بۆی دیاریکرابوو بەشی نەدەکرد، بۆ نمونە ئۆتۆمبێلێکی جۆری (پیکەرد pickard)ی مۆدیل ۱۹۳۷ هاتە عێراقەوە نرخی فرۆشتنی ٤١٠ دینار بوو، مەلیك زۆر حەزی لێبوو بیکرێت، بەڵام پارەی تەواوی نەبوو بۆ کڕینی، بەڕێوەبەری خەزێنە (حەقی بەگ) پێی وت: "بەخوا گەورەم حەز دەکەم بیکڕیت، بەڵام پارەمان نییە".

ئەمەش وایکرد مەلیك لە ڕێگەی کشتوکاڵەوە بیر لە باشترکردنی باری دارایی خوێ بکاتەوە، وەك بزانم کێڵگەیەکی لە خانەقین هەبوو دەیویست لێیەوە هەندێك لە خەرجییەکانی دابین بکات. لە بیرمە کاتێك ئۆتۆمبێلێکی بە ۱۳۰ یان ۱٤۰ دینار کڕی، بە تەواوی کاری کردە سەر داراییەکەی، هەندێك جار پێویستی بە ٥٠ دینار دەبوو، دادەما چۆنی پەیدا بکات، بۆیە دەسەڵاتی زۆر سنووردار بوو، هیچ خۆشگوزەران نەبوو، نە لە پارە و نە لە خواردن و نە لە جلوبەرگ و نە لە.... و نە لە.....

## بە تەنگەوەهاتنم بۆ ژیانی مەلیك

دوای كودەتای بەكر سدقی، ئەفسەر بووم لە حامییەی ئەربیل گواسترامەوە بۆ مستەوودەعی موسڵ و دوای ئەوە گواسترامەوە بۆ پاسەوانی شاهانە، چۆن هەڵبژێردرام بۆ پاسەوانی شاهانە؟ نە ئەوسا و نە ئێستاش نازانم. فەوجی پاسەوانی شاهانە پێكدەهات لە دوو سریە، سریەی سوارە كە پێی دەوترا سریەی مەراسیم و لە كۆشكدا بوو، سریەی پاسەوانی كە لە كۆشكی ئەلزهوردا بوو، من لە سریەی پاسەوانی بووم، فەرماندەی سریەكەمان نەقیب عوبید عەبدوڵلا ئەلمەزایفی بوو. سریەكە پێكدەهات لە سێ فەسیل، فەسیلێك بە فەرماندەیی خوالێخۆشبوو عەبدوڵلا تاڵەبانی و فەسیلێك بە فەرماندەیی موحسین مەكی شەبوت و فەسیلی سێیەمیش من فەرماندەی بووم. بارەگای فەوج لە نێو كۆشكدا بوو. دوای ماوەیەك لە فەرماندەی فەسیلی پاسەوانی شاهانە، كرامە پاسەوانی مەلیك، بێگومان ئەركی پاسەوانی شاهانە، پاسەوانیكردنی مەلیك و ژیان و ژیانی خێزانەكەیەتی. پاسەوانیكردن بە سیستمێكی دیاریكرا و ئەنجامدەدرا، كۆشكی ئەلزهور دابەشكرا بوو بۆ هەشت خاڵی پاسەوانی و دوو دەورییە.

پاسەوانەكان بە تایبەت لە شەواندا لەبری پۆستاڵی سەربازی پێڵاوی لاستیكیان لە پێ دەكرد بۆ پاراستنی ئارامی و بۆ ئەوەی دەنگی نەیەت و مەلیك بێزار نەبێت، ئەركی ئەفسەرانی ئێشكگر ئەنجامدانی خولی ئاسایی پشكنین بوو لە نیوەی شەودا. لە ڕاستیدا من خۆم تا دڵنیا نەبوومایەتەوە لەوەی مەلیك نوستووە، نەدەنووستم، چونكە زۆربەی

شەوان لە کۆشکی حارسییە بوو و تا درەنگانێکی شەو نەدەنووست.

لەو ڕووداوانەی لە کاتی ئێشکگری شەوانەدا توشمان بوو، ڕووداوەکەی (وەسڵ) بوو. (وەسڵ) برای شیریی مەلیك بوو، لە کۆشکی حارسییە دادەنیشت و کچێکی خانەقینی هێنا بوو، زۆر لە مەلیکەوە نزیك بوو.

شەوێکیان لە ئەرکی گەڕان و پشکنیندا بووم، مەلیك لە کۆشکی ئەلزهور بوو سەیری فیلمێکی سینەمایی دەکرد، کات لە نیوە شەودا بوو، لە کاتی پشکنیندا و لە ڕێڕەوەکانی کۆشکدا پایسکیلسوارێك لە تاریکیدا خۆی پێدا کێشام و هەردووکمان کەوتینە سەر زەوییەکە. گوێم لێبوو گوتی: "ببورە"، لە دەنگیدا ناسیمەوە (وەسڵ)ە، هەستامەوە و پایسکیلەکەم هەڵگرت و کێشام بەسەریدا، ئەوجا تێر و پڕیشم لێدا، دەبینم خوێن بەسەریدا هاتە خوارەوە، بۆ ئەوەی مەلیك بیبیسێت (وەسڵ) بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد:

"گەورەم فریامکەوە، خەریکن دەمکوژن" گوێم لێبوو مەلیك بە دەنگی بەرز هاواری کرد: "لەوێ چی ڕوویداوە؟" (وەسڵ) ڕایکرد بۆ لای مەلیك و منیش گەڕامەوە بۆ بارەگاکەم، وا دەزانم بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی ساڵحییە دکتۆر یەحیا ڕەفعەتیان هێنا بۆ تیمارکردنی (وەسڵ). ڕەشید عەلی پاسەوانی یەکەم و پاسەوانی ئێشکگر بوو لە کۆشکدا، داوای کردم. هەر کە لێی چوومە ژوورەوە بە توورەییەکەوە وتی: "چۆن دەدەیت لە وەسڵی برای مەلیك؟ ئەنجامێکی ڕەش چاوەڕوانت دەکات" منیش وتم: هەرچیت لەدەست دێت بە گوێرەی یاسا بیکە. وتی: "باشە بچۆرە

دەرەوە". گوێم لێبوو تەلەفۆنی کرد بۆ فەرمانگەی (ئینزیباتی) سەربازی و پێی وتن: "ئەفسەرێکی ڕاگیراومان لایە ئینزیباتێك و کەلەپچەیەك بنێرن بیبات، دوای ئەوە تەلەفۆنی بۆ مەلیك کرد و پێیگوت: "گەورەم ئەفسەرەکەمان ناسییەوە، فوئادە". دیاربوو مەلیك داوای کردبووم، چون گوێم لە ڕەشید بوو وتی: "لەگەڵی بێم؟" عەریفێکی ئینزیباتی لەگەڵ ناردم و وتی: "بڕۆ مەلیك داوات دەکات".

چوومە کۆشك و چوومە نهۆمی دووەم، مەلیك لە باڵکۆنەکە دانیشتبوو نانی ئێوارەی دەخوارد، هەستایە سەرپێ و باوەشی بۆ گرتمەوە و ئەملاوئەولای ماچکردم و وتی: "فوئاد دانیشە". وتم: "گەورەم ببوورە"، بەڵام بە زۆر دایانام و باسی بیرەوەرییەکانی سەردەمی خوێندنی سەربازیمان کرد، دوای ئەوە پرسیاری کرد چی ڕوویداوە، منیش باسەکەم وەك خۆی بۆ گێڕایەوە، مەلیك غازی بانگی (وەسڵ)ی کرد، کە هاتە ژوورەوە سەری بە لەفاف پێچرا بوو، پێی وت: "وەسڵ! داوای لێبوردن لە ملازم بکە، چونکە تۆ بەسەر ئەودا ڕۆیشتووی و فوئاد لە ئەنجامدانی ئەرکدا بووە، تۆ بە پایسکیل داوتە لە ئەو، دەتەوێت چی بکات؟ دەی هەردوو دەستی ماچ بکە". وتم: "نە گەورەم من داوای لێبوردن لە وەسڵ دەکەم بەوەی پێمکرد". مەلیك قبووڵی نەکرد و وەسڵ داوای لێبوردنی کرد، دوای ئەوە بە مەلیکم وت ئێستا ئینزیبات دێن بۆ کۆشك بۆ ئەوەی بە کەلەپچەکراوی بمبەن و سزام بدەن.

بۆیە مەلیك تەلەفۆنی بۆ عەقید ڕەشید کرد و پێیگوت: "ئەی تۆ نازانی

فوئاد برامە؟" دەتوانێت لە کۆشکدا لە هەر کەسێك بدات، واز لە کەلەپچە و ئینزیبات بێنە، کێشەکەی چارەسەر بووە و وەسڵ داوای لێبوردنی لێکردووە، هەر کە بڵندگۆی تەلەفۆنەکەی دانا هەستام سڵاوێکم بۆ گرتەوە و خودا حافیزیم لێکرد. دوای ئەوە عەقید ڕەشیدم بینی سیمای گۆڕا بوو، ئەو کاتەی بە دەم و چاوێکی مۆنەوە دەیویست بمنێرێت بۆ زیندان، ئەمجا بە ڕوومدا پێکەنی و وتی: "پێم وانەبوو مەلیك تا ئەو ڕادەیە تۆی خۆش بوێت".

دوای ڕوداوەکەی وەسڵ حەزمکرد لە کۆشك نەمێنم و بگەڕێمەوە بۆ یەکەیەکی سەربازی ئاسایی، بۆیە چوومە لای فەریق بەکر سدقی، کە ئەو کات سەرۆك ئەرکانی سوپا بوو، پێمگوت: دەمەوێت ژن بهێنم، بۆیە حەز دەکەم بگوازرێمەوە بۆ شاری سلێمانی، یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی و بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەری ئیدارە کرد و پێیگوت: "فوئاد لە پاسەوانی شاهانەوە بگوازنەوە بۆ سلێمانی".

هیچ شارەزاییەکم لە کاروباری ئیداریدا نەبوو، وامزانی ئەو تەلەفۆن کردنە واتە گواستنەوە، نەمزانی دەبێت چاوەڕێ بکەم تا فەرمانی گواستنەوەم دەردەچێت و واژۆی لەسەر دەکرێت، دوای ئەوە دەبێت جیابوونەوە و دەستبەکاربوون بکەم، هەروەها نەمدەزانی دەبێت ڕێکارەکان بگیرێنەبەر لە نێوان وەزارەتی بەرگری و بارەگای فەوجی پاسەوانی شاهانە.

بەهەرحاڵ نەگەڕامەوە بۆ کۆشك و یەکسەر چوومە وێستگەی

شەمەندەفەر، سوار بووم بۆ کەرکوک و لەوێوە بۆ سلێمانی، لە سلێمانی چوومە لای فەرماندەی حامییە و پێمگوت: من گواستراومەتەوە بۆ لای ئێوە، وتی: نەمبیستووە تۆ گواسترابیتەوە بۆ سلێمانی. سێ ڕۆژ لە سلێمانی مامەوە چاوەڕێی گەیشتنی فەرمانی گواستنەوەکەم بووم، ڕۆژی سێیەم بروسکەیەك گەیشتە حامییە دەیگوت:

"ملازم فوئاد عارفمان بۆ بنێرنەوە بۆ بەغداد" ئۆتۆمبێلێك هاتە بەردەرگا و یەکسەر سواریان کردم، نەمدەزانی مەسەلە چییە؟ دایکم بە ڕەحمەت بێت زۆر ترسا، وایدەزانی زیندانی دەکرێم، خۆشم هەروەها، لە ڕاستیدا نەمدەزانی مەبەست لەو بروسکەیە چییە. لە بەغداد برامە کۆشك، لەوێ چاوم کەوت بە فەرماندەی پاسەوانی پاشایەتی موقەددەم شوکری جەمیل، وامدەزانی زیندانی دەکرێم، کەچی فەرماندەی پاسەوان هەستایە سەرپێ و زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم و پێی ڕاگەیاندم کە کراومەتە پاسەوانی تایبەتی خاوەنشکۆ مەلیك غازی.

### لەگەڵ شاژنە عالیە

یەکەم ڕۆژی پاسەوانیم لەگەڵ شا غازی، لە تەنیشتییەوە سوار بووم، خۆی ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی، شاژنە عالیە و مەلیك فەیسەڵی کوڕی و دایەنەکەی فەیسەڵ لە ڕیزی دواوە بوون، دەچووین بۆ تەل ئەلملح، کات دەوروبەری پێنجی ئێوارە بوو، مەلیك و شاژن دابەزین و لە نێو باخچەکە دانیشتن، منیش لە نێو ئۆتۆمبێلەکەدا مامەوە، خزمەتکارەکەی کە ناوی موحەممەد بوو هات وتی: "فەرموو، گەورەم تۆی دەوێت".

کە چووم مەلیك و شاژن لەسەر سفرەیەك دانیشتبوون کە هەندێك میوەی لەسەر بوو، وتی: "دانیشە". دانیشتم. وتی: "فوئادی برام! دەزانیت تۆ یەکەم کەسی لە دەرەوەی خێزانی شاهانە لەگەڵ شاژنە عالیەدا دانیشتبێت". هەرچەندە پێشتر لە کۆشکدا کارم کردبوو بەڵام لە ڕاستیدا تا ئەو کاتە شاژنم نەدیبوو، پێمگوت: "خاوەنشکۆ ئەمە شانازییەکی گەورەیە بۆ من"، ئەمجا وتی: "لە ڕاستیدا ئەوەی تۆی بە پاسەوانی من هەڵبژارد، شاژنە عالیە بوو، من سوپاسی دەکەم بۆ هەڵبژاردنی تۆ، بەڕاستی باشترین هەڵبژاردنە" شاژنە عالیە بەڕەحمەت بێت ڕووی کردە من و وتی: "فوئادی برام، ئێوە من نابینن، بەڵام من یەکە یەکە هەموو ئێوە دەبینم، لە نێو کۆشکەوە زۆر چاودێریم دەکردی کاتێك بە هەموو جدییەت و دڵسۆزییەکەوە ئەرکی پاسەوانی و پشکنینت بەجێدەهێنا، مەلیك زۆر باسی تۆی بۆ کردووم و باسی سەردەمی خوێندنتانی پێکەوە لە کۆلێژی سەربازی زۆر بۆ گێڕاومەتەوە. پێم سەیر بوو چەند ڕۆژێکە لە کۆشکدا ناتبینم، پرسیارم لە مەلیك کرد هاوڕێ کوردەکەت بۆچی دیار نییە؟ ڕەنگە نەخۆش بێت، ئەو ڕۆژانە گوێم لە دەنگی نییە کاتێك پشکنین دەکات و دەنگی دارەکەی دەستی نابیستین، ئەگەر نەخۆشە، خۆزگە چەپکە گوڵێکمان بۆ دەنارد".

پرسیارم کرد وتیان: "گواستراویتەوە بۆ سلێمانی، داوام لە مەلیك کرد بتگەڕێنێتەوە، بۆیە تۆیان گەڕاندەوە تا ببیتە پاسەوانی تایبەتی خاوەنشکۆ". سوپاسی مەلیك و شاژنم کرد بۆ ئەو متمانەیەی بە من هەیانە، پەیوەندیم کرد بە دایکمەوە و پێمگوت: هیچ دوودڵ مەبە، نەك زیندانی نەکرام، بەڵکو کرامە پاسەوانی تایبەتی مەلیك.

## ئایا دەبێت کوردێك پاسەوانی تایبەتی مەلیك بێت؟

بیرمە هەندێك لە ئەفسەران باسیان لەوە دەکرد چۆن مەلیك منی کردۆتە پاسەوانی تایبەتی خۆی؟! قسەکانیان جۆرێك لە مەرایی تێدا بوو و دڵە نەخۆشەکانیانی تەنگ کردبوو. لەو قسانەی لەسەر هەڵبژاردنی من بە پاسەوانی تایبەتی مەلیك دەیانکرد، ئەوەبوو چۆن دەبێت پاسەوانی تایبەتی مەلیك کورد بێت؟! هەر کە ئەو قسانە بە گوێم گەیشتنەوە یەکسەر چووم بۆ لای مەلیك و داوام لێکرد لە ئەرکی پاسەوانی بمبورێت، ڕێکاری خێرا گیرایەبەر دەربارەی ئەم بابەتە و هەرزوو سزای ئەو ئەفسەرانە درا، هەروەها مەلیك پەیوەندی بە جەمیل ئەلمەدفەعی وەزیری بەرگرییەوە کرد و پێیگوت: "یەکێك لەو هۆکارانەی تۆم بە وەزیری بەرگری هەڵبژارد، پاراستنی یەکێتیی نیشتمانی عێراق بوو، نامەوێت گوێم لە جیاوازی نێوان کورد و عەرەب بێت لەم وڵاتەدا". جەمیل ئەلمەدفەعی هەرزوو بانگی ئەو ئەفسەرانەی کرد و لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن، هەندێکیان عێراقی نەبوون، جەمیل ئەلمەدفەعی هەڕەشەی لێکردن ئەگەر قسە لەم بابەتە بکەن، لە عێراق دەریان دەکات، ئەفسەرانی تریش سزای ئاگادارکردنەوەیان وەرگرت.

لە کاتی دەرکردنی فەرمانی دامەزراندنم بە پاسەوانی تایبەتی مەلیك، ئاگادار کرام فەریق بەکر سدقی سەرۆکی ئەرکانی سوپا، حەز دەکات سەردانی بکەم. یەکسەر چووم بۆ لای، پیرۆزبایی پۆستی تازەی لێکردم کە نادرێتە کەسێك، ئەگەر بە تەواوی جێی متمانەی دەوڵەت و مەلیك نەبێت. شەرەفێکی گەورە بوو ئەفسەرێك ببێتە پاسەوانی تایبەتی مەلیك،

بە تایبەت مەلیکێکی وەك مەلیك غازی، کە گەلی عێراق زۆر خۆشیان دەویست و متمانەیەکی تەواویان پێیبوو، ئەو ڕۆژە ئەو خۆشەویستییە بە ڕوونی بە دیار کەوت، کە عێراقییەکان هەموویان بۆ مردنی مەلیك غازی گریان، دواتر دێینە سەر ئەم بابەتە، وەك وتم بەکر سدقی پیرۆزبایی لێکردم و موحەممەد عەلی جەواد فەرماندەی هێزی ئاسمانیی لای دانیشتبوو. بەکر سدقی وتی: "فوئاد، کوڕم، هەڵبژاردنت بە پاسەوانی مەلیك غازی، بە بڕیاری خودی خۆی بووە و خۆی تۆی بۆ ئەم ئەرکە دەستنیشان کردووە، لەبەر پێگە هەستیارەکەت بە پێویستی دەزانم سێ ئامۆژگاریت بکەم.

یەکەم: ئامۆژگارییە بۆ خۆت، دووەم و سێیەمیشیان ڕێنمایی گرنگن".

گوتم: "فەرموو گەورەم!" گوتی: "یەکەم، تۆ لە بوارێکدا کار دەکەیت دەشێت یان پارە، یان شەرەف بەدەست بێنیت، بەڵام ناتوانیت هەردووکیان پێکەوە بەدەست بێنیت، یان دەبێت پارە و پول بەدەست بێنیت و شەرەف و ناوبانگ لەدەست بدەیت، یان شەرەف و ناوبانگ بەدەست بێنیت، تۆ ئازادی کام لەو دووانە هەڵدەبژێری، بەڵام تەنها حەز دەکەم بیرتی بێنمەوە باشترە پشت لە پارە و پول بکەیت، ئەگەر پارە لەدەست بچێت دەشێت دەست بکەوێتەوە، بەڵام ئەگەر شەرەف ڕۆیشت هەرگیز ناگەڕێتەوە.

دووەم: غازی ئێستا ئەو کەسە نییە کاتێك لە کۆلێژ پێکەوە بوون و گاڵتەوگەپتان پێکەوە دەکرد، ئەو ئێستا پادشای عێراقە، تۆش یەکێك لە

كارمەندەكانیتی، دەبێت هەمیشە ئەمەت لە یاد بێت.

سێیەم: دەبێت بزانیت هەرچی ئەمڕۆ غازی دەیڵێت فەرمانی شاهانەیە و دەبێت جێبەجێ بكرێت، بەڵام هەندێكجار هەست دەكەیت مەلیك لە كاتی تووڕەبووندا داوای شتێكت لێدەكات و دەزانیت جێبەجێكردنی بە زیان بۆی دەشكێتەوە، چونكە فەرمانەكە لە حاڵەتی تووڕەبوون یان نائاساییدا دراوە، یان مەلیك لە درەنگانێكی شەودا بە تووڕەیی فەرمانت پێدەكات، بۆیە تا دەتوانیت لە لایەكەوە هەوڵبدە لە ئەنجامی ئەو فەرمانە تووڕەیە نەكەوێتە تەنگەژەیەكەوە كە دواتر لێی پەشیمان بێتەوە، یان تا دەتوانیت دوای بخە بۆ كاتێكی تر یان ڕۆژی دوایی، تا كاتێك دەشێت لەو بۆچوونەی پەشیمان بێتەوە...".

### دكتۆر سندرسن

سندرسن پزیشكی شا فەیسەڵی یەكەم بوو، دوای ئەویش پزیشكی مەلیك غازی و بنەماڵەی شاهانە، پەیوەندی لەگەڵ مەلیك و بنەماڵەكەیدا بەهێز بوو. زۆر سەردانی كۆشكی دەكرد كە سەردانی شاژنی دەكرد خێزانەكەی لەگەڵ خۆی دەهێنا، دكتۆر سندرسن ڕۆڵی گەورەی بینی لە بواری تەندروستی لە عێراق و لە دامەزراندنی كۆلێژی پزیشكی لە عێراقدا، سەرباری ئەوەی پزیشك بوو، بە حوكمی پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ كۆشكدا ڕۆڵ و كاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لە زۆرێك لە كاروبارەكاندا.

وەك باسمكرد دكتۆر سندرسن زۆر هاتوچۆی كۆشكی دەكرد و هیچ گومانم نەبوو لە دڵسۆزیی بۆ بنەماڵەی شاهانە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت

ئامادە نەبووم لەگەڵ کەسێکی وەك ئەویشدا ئاسانکاری بکەم لە بابەتی پاراستنی مەلیك غازی، وام هەستدەکرد ئەرکەکەم لە کۆشکدا ئەرکێکی پیرۆزە و وام لێدەخوازێت وابم.

### کۆشکەکانی مەلیك

کۆشکی ئەلزهور لەسەر شێوازی فەرەنسی دروستکرابوو، کۆشکێکی سادەی دوو نهۆمی بوو، نهۆمی یەکەم کتێبخانە و ژووری پاسەوانەکانی تێدا بوون، نهۆمی دووەم تایبەت بوو بە شوێنی خێزانی شاهانە.

کۆشکی حارسییە بریتیبوو لە ماڵێکی بچووك، هۆڵێك و سێ ژووری خەوتن، باخچەیەك بە ڕووبەری (٢٠٠٠) مەتریی بەدەوردا بوو، بەردەمی باخچەیەکی بچووك بوو بۆ ئاژەڵان، ڕووباری ئەلخەڕ، نێوانی هەردوو کۆشکی ئەلزهور و حارسییەی لەیەکتر جیادەکردەوە.

کۆشکەکەی مەلیك لە تەل ئەلملح کۆشك نەبوو، بەڵکو بینایەکی ئاسایی بوو پێکهاتبوو لە دوو ژوور و هۆڵێك و حەمامێك، بینایەکی کۆن بوو و فڕۆکەخانەیەکی تێدا بوو، تەل ئەلملح ناوچەیەکی نزیك ئەبو غرێبە بەر لەوەی بگەیتە ناوچەی خان ضاری.

مەلیك لە کۆشکدا بە شێوەزاری عێراقی قسەی دەکرد تێکەڵ بە هەندێك وشەی حیجازی، سەبارەت بە زمانەکانی تر، ئینگلیزی و تورکیشی دەزانی، زۆربەی جارەکان لەگەڵ شاژنە عالیە بە زمانی تورکی پێکەوە قسەیان دەکرد.

## پیلان

بەر لەوەی ببمە پاسەوانی تایبەتی مەلیك، واتە لەسەردەمی کابینەی حیکمەت سلێمان و پێش کوژرانی بەکر سدقی، هەرگیز هەستمان نەدەکرد مەترسی لەسەر ژیانی مەلیك غازی هەیە و هیچ ڕێگرییەك نەبوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانویست سەردانی بکەن. بیرم نایەت بەر لەوەی سەردانی هەر ناوچەیەکمان کردبێت، گەڕان و پشکنین، یان هیچ ئامادەکارییەکی ئەمنی و خۆپارێزی پێشوەختەمان بۆ کردبێت. توندترین شێوازی خۆپارێزی ئەو کاتە بوو کە چەند کەسێك بەسەر پردی ئەلخەڕدا دەپەڕینەوە، ئەو پردە هەردوو کۆشکی حارسییە و ئەلزهوری لە یەکتر جیادەکردەوە، کەمینێکمان دانا لە (نایب عەریفێك و چوار سەرباز) لە ژێر پردەکە بۆ پشکنینی ئەو کەسانەی لە درەنگانێکی شەودا بەسەر پردەکەدا دەپەڕنەوە. ئەو کاتەی مەلیك لە کۆشکی حارسییە بوو هێشتا نەگەڕابووەوە بۆ کۆشکی ئەلزهور.

دوای گەڕانەوەی بۆ کۆشکی ئەلزهور، کەمینەکە شوێنەکە جێدەهێڵن، دوای ماوەیەك بینیمان چەند کەسێك لە نزیکی کۆشك دەسوڕێنەوە. شوێنەکە باخ و باخات بوو، کاتێك گیران وتیان: "ئەوان لە ئارەزوومەندانی کۆکردنەوەی مێرووەکانن". ڕادەستی لێکۆڵینەوەی تاوانەکان –التحقیقات الجنائیة – کران و لێکۆڵینەوە هەرزوو ئازادی کردن. بە گومانی من ئەو کەسانە سەر بە لایەنێکی سیاسیی هاوکاری ئینگلیزەکان بوون، یان ڕاستەوخۆ لەلایەن کونسوڵخانەی بەریتانیاوە نێردرابن بۆ سوسەکردنی شوێنی کۆشك، خوا دەزانێت... کێ دەزانێت؟!

هەندێك دەنگۆی لاوازمان دەبیست، ئەركی ئێمە پاراستنی مەلیك بوو، بەڵام لێكۆڵینەوە لەو دەنگۆیانە و تا چەند ڕاست بوون ئەوە بۆ خودی مەلیك و لایەنە پەیوەندیدارەكانی تر دەگەڕایەوە. بەڵام كردنەوەی فڕۆكەخانەی بەسرەم لە بیرە، دەنگۆی ئەوە هەبوو لە كاتی كردنەوەی فڕۆكەخانەی بەسرەدا، پیلانێك بۆ كوشتنی مەلیك غازی لە ئارادایە، مەلیك غازی هەواڵگری تایبەت بە خۆی هەبوو. ئەو دەنگۆیەی بیستبوو كە ئەگەری تیرۆر كردنی هەیە لە كاتی ئاهەنگی كردنەوەی فڕۆكەخانەی بەسرە. بۆیە دوو ڕۆژ پێش كردنەوەی فڕۆكەخانەكە داوای لێكردم بچم بۆ بەسرە. لەگەڵ فڕۆكەوانی ئەندازیار ڕائید جەواد حسێن بە فڕۆكەیەكی تایبەت چووین بۆ بەسرە.

مەلیك ڕایسپاردم بۆ لێكۆڵینەوە و دڵنیابوون لە مەسەلەی پیلانەكە و چوونە لای فەرماندەی حامییە موقەددەمی روكن عەلی غالب ئیسماعیل، فەرمانی پێكردم پێی ڕابگەیەنم هەر لە ساتەوەختی دابەزینی مەلیك لە بەسرە تا ئەو كاتەی بەسرە بەجێدەهێڵێت، بەرپرسی یەكەمە لەسەر گیانی مەلیك. لە ڕاستیدا زۆربەی ئەفسەران و زوبات سەفەكان كە لە بەسرە بوون لە جەماعەتی بەكر سدقی بوون، كە دوای كوژرانی بەكر سدقی و تێكچوونی دۆخەكە دوورخرابوونەوە بۆ بەسرە. ژمارەیەكی زۆریشیان كورد بوون، لەوانە عەزیز قەزاز و ئەمین ڕەواندوزی و بەهادور عەبدولمەجید.

بە گەیشتنم بە بەسرە موقەددەم ڕوكن عەلی ئیسماعیل كۆبوونەوەی بە

فەرماندەی سرییەکان کرد و ڕێوشوێنی ئەمنی پێویست گیرانەبەر. لە ڕاستیدا دوای کوژرانی بەکر سدقی ترسێك کەوتبووە دڵی مەلیك غازییەوە. وایدەزانی دوای کوژرانی بەکر سدقی کاندیدی دووەمە بۆ تیرۆرکردن، بە تایبەت بابەتی تەخویلکردنی بەکر سدقی و دەستگرتنی ئینگلیزەکان بەسەر ئەو جانتایەی بە بەکر بوو، لەو کاتەی دەچوو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ هیتلەر.

موقەددەم ڕوکن عەلی غالب ئیسماعیل ڕێکاری توندی گرتەبەر بۆ پاراستنی گیانی مەلیك، چەندین سەربازی بە جلی ئاساییەوە دانا و لە ژێر جلوبەرگەکانیاندا چەکیان هەڵگرتبوو و لەگەڵ میوان و بانگهێشتکراواندا لە ڕیزدا دانیشتبوون، لەگەڵ دابەزینی لە فڕۆکەکە هەموو هەستانێك قەدەغەکرا، لە بیرمە دایکی جەمیل ئەلمەدفەعی کاتێك ویستی لە شوێنی خۆی هەستێت و سڵاو لە مەلیك بکات، عەلی غالب نەیهێشت و پێیگوت "تکایە هەڵمەستە، خاوەنشکۆ خۆی دێت سڵاوتان لێدەکات". فڕۆکەخانە بە تەواوی کۆنترۆڵ کرابوو. کاتێك چووین بۆ بەسرە مەلیك و پاسەوانەکانی و فەرماندەی هێزی ئاسمانی عەقید ئەکرەم موشتاق لەسەر کەشتییەکی عێراقی دابەزین کە لە شەتولعەرەب لەنگەری گرتبوو، وەزیرەکان لە هۆتێلی شەتولعەرەب بوون. دوای کۆتاییهاتنی ئاهەنگی کردنەوەی فڕۆکەخانە، مەلیك غازی ئاهەنگێکی نانخواردنی ئێوارەی لەسەر کەشتییەکە بۆ میوانەکانی ڕێکخست. دوای ئەوە بە هەمان کەشتی گەشتێکی حەوت ڕۆژەمان بۆ شەتولعەرەب و فاو و کەنداوی عەرەبی کرد. بیرم دێت مەلیك غازی بەبێ پاسەوان دەخەوت، دەستەی کەشتیوانەکان

تێکەڵەیەك بوون لە ئینگیلز و هیندی. تا نیوەی شەو لەگەڵ مەلیکدا دادەنیشتین و دەمەتەقێمان دەکرد. وێڕای نەبوونی پلانێك بۆ پاسەوانیکردنی، بەڵام پێم باشبوو مەلیك بەبێ پاسەوان نەبێت، بۆیە هەموو شەوێك تا بەیانی بێئەوەی بنووم بە تەنیا پاسەوانییم دەکرد، شەوێکیان مەلیك غازی لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و هەرچی سەرنیشینەکانی کەشتییەکە نوستبوون تەنها من بێدار بووم و پاسەوانیم دەکرد، وتی:

– فوئاد ئەوە چی دەکەیت؟

– قوربان پاسەوانیت دەکەم.

– هەموو شەوێك بەم جۆرە لەم کەشتییەدا پاسەوانیم دەکەیت؟.

– بەڵێ، گەورەم.

وتی:

"ئێستا دەزانم بۆچی بە ڕۆژ دەخەویت و ئەوانی تر هەموو لە خەو هەڵدەستن، وامدەزانی زۆرت حەز لە خەوە، بەڵام ئێستا دەزانم تۆ تەنیا کەسی لەم کەشتییەدا شەوان ناخەویت"! بانگی عەبوشی وێنەگری کرد و وێنەیەکی یادگاریمان بۆ ئەو شەوە گرت. لە دوای کوشتنی بەکر سدقی و ڕووخانی کابینەکەی حیکمەت سلێمان گومانم بۆ دروستبوو لە هەندێك شت کە دەکرێت یان دروست دەکرێت. وەك چالاکییەکانی نووری ئەلسەعید و ڕەفتارەکانی لێکۆڵینەوەی تاوانەکان و هەندێك لە پیاوانی

دەوڵەت کە مامە حەمەییان بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا دەکرد و فشارەکانی حکومەت و چاودێرییان بۆ ڕەفتار و جوڵەکانی مەلیك، هەموو ئەمانە کەشێکی دەروونی نائاسایی دروستکردبوو، زۆر جیاواز بوو لەو ژیانەی مەلیك پێشتر دەیکرد. بیرمە شێخ موحەممەد ئەلسەدر کە ئەو کات سەرۆکی ئەنجومەنی ئەعیان بوو، چەند جارێك داوای لە مەلیك کرد ئاهەنگێکی چاپیخواردنەوە ساز بکات و بانگهێشتی وەزیرەکانی بکات، ئەلسەدر ویستی بەو ئاهەنگە پەیوەندییەکان بگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی پێشوو و ئەو ناکۆکییەی دروستبووبوو نەیهێڵێت. مەلیك ڕازی بوو و لە کۆشکی ئەلملح ئاهەنگێکی چاپیخواردنەوەی ساز کرد و تیایدا وەزیرەکان و سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و سەرۆکی ئەنجومەنی ئەعیان و هەندێك لە گەورە پیاوانی دەوڵەت بۆی بانگهێشتکران.

ئەوەی لەو ئێوارەیەدا سەرنجی ڕاکێشام زۆری ئۆتۆمبێلە چەکلەسەرەکان بوو لە جۆری (پیك ئاپ)، لەسەر ئەو جادەیەی دەچوو بۆ کۆشکی ئەلملح، بە جۆرێك سەرنجی مەلیکیشی ڕاکێشا، پرسیاریکرد: "مانای ئەو هەموو ئۆتۆمبێلە چەکلەسەرانە چییە لەسەر ئەم جادەیە"؟! پێمگوت: ڕەنگە بچن بۆ دەرەوەی بەغداد، یان بچن بۆ ڕومادی، مەلیك بێدەنگ بوو هیچی نەگوت.

کاتێك گەیشتینە کۆشك مەلیك چاوەڕێی میوانەکانی دەکرد، بینیمان ئۆتۆمبێلێك هاتە ژوورەوە و دوو کەس لێی دابەزین، مەلیك وایزانی ئەلشەبیبی هێناوە، بەڵام سەیر دەکەین دووکەس لە ئۆتۆمبێلەکە

دابەزین و هاتن لە تەنیشت پاسەوانەکانی پاشایەتیدا وەستان.

مەلیك داوای لێکردم بزانم مەسەلە چییە؟ چووم پرسیارم لێکردن، ئێوە کێن؟ وتیان ئێمە لە لێکۆڵینەوەی تاوان واتە (بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش)ـەوە هاتووین. یەکسەر دەستمکرد بە لێدانیان و گرتمن، کاتێك وەزیرەکان گەیشتن، مستەفا ئەلعومەری وەزیری ناوخۆ، پرسیاریکرد مەسەلە چییە؟! وتم: "ئەمانە لە لێکۆڵینەوەی تاوانەوە هاتوون"، ئەڵبەت لێکۆڵینەوەی تاوان سەر بە وەزارەتی ناوخۆ بوو. فەرمانی کرد ئازادیان بکەم، بەڵام ڕەتم کردەوە و وتم "تا مەلیك بەم ڕوداوە نەزانێت و بڕیار نەدات ئازادیان ناکەم". ئەمجا جەمیل ئەلمەدفەعی سەرۆك وەزیران هات و داوایکرد ئازادیان کەم، ئەویشم ڕەتکردەوە. وەك بزانم مەلیك چاودێری دۆخەکەی دەکرد و بە پێویستی زانی قسەی تێدا بکات و بە مستەفا ئەلعومەری و جەمیل ئەلمەدفەعی وت: "خێر، چیتان لە فوئاد دەوێت"؟ دەستپێشخەریم کرد و پێمگوت: "گەورەم ئەوانە لە لێکۆڵینەوەی تاوانەوە هاتوون، بوونیان لێرە هیچ مانایەکی نییە و نازانم کێ ناردوونی؟".

لە ڕاستیدا مەلیك لە بوونی ئەو کەسانە دڵگران بوو، بەڵام دوای ئەوە فەرمانی دا ئازاد بکرێن. وا دەزانم مەلیك ئاگادار بوو لەوەی چی دەگوزەرێت، بەڵام لەو ماوەیەدا واتە لە دوای کابینەکەی حیکمەت سلیمان لاواز بووبوو.

لە ڕاستیدا هاتنی ئەو دوو کەسە مایەی گومان بوو، وێڕای زۆری ئەو

ئۆتۆمبێلانەی پۆلیس کە بڵاوبووبوونەوە. زیاتر لە یەك ئەگەر هەبوو بۆ ڕەفتارێکی لەو جۆرە. بەهەرحاڵ حکومەت ئامرازێك بوو کونسوڵخانەی بەریتانیا ئاڕاستەی دەکرد. مەلیك لەو ماوەیەدا زیاتر چاودێری چالاکییەکانی لێکۆڵینەوەی تاوانی دەکرد و زۆرێك لەو کەسانەی لە کۆشکدا کاریان دەکرد گۆڕدران بە کەسانێك ئەرکیان چاودێریکردنی مەلیك بوو، چاودێری خرایە سەر تەلەفۆنەکان و لە هەموو پاسەوانەکان و خزمەتگوزارەکاندا ئاڵوگۆڕ کرا.

## غازی و ئینگلیز

مەلیك غازی بە ئاشکرا ڕقی لە ئینگلیزەکان بوو بە دوو هۆکار، کاتێك غازی باسیدەکردن بە توورەییەوە باسیدەکردن، یەکەمیان هەڵوێستی ئینگلیزەکان لە بەرامبەر ئەلشەریف حسێنی باپیری و ئەو مامەڵە خراپەی لەگەڵ باپیریدا کردبوویان و دووریان خستبۆوە بۆ قوبرس، زۆر جار کە باسیدەکرد خۆی نەدەگرت و دەگریا. دووەم جەختی دەکردەوە لەو کەسانەی لەگەڵ باوکیدا لە حیجازەوە هاتبوون بۆ عێراق پیاوی ئینگلیزن، ئەمەش وایکرد پیاوانی دەوڵەت هێندەی وەلائیان بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا هەبێت، هێندە وەلائیان بۆ دەوڵەتی عێراق نەبێت. دەیگوت ئەوانە دەبێت پیاوی نیشتمانی و نەتەوایەتی بن، بەڵام نە نیشتمانی و نە نەتەوایەتیین. غازی ڕقی لە فرت و فێڵ و درۆ و دەلەسە و کاری ژێربەژێر بوو، حەزی دەکرد هەڵوێستەکانی ڕاست و ڕوون دەرببڕێت.

هەر کە باس دەهاتە سەر ڕۆڵی ئەو پیاوانەی لەگەڵ باوکیدا هاتبوونە عێراق و ڕۆڵیان لە سیاسەتەکانی سەرەتای دەوڵەتی عێراقدا هەبوو، دەیگوت: "ئەوان تۆوێکیان چاند وا من ئێستا بەرهەمەکەی دەچنمەوە".

ئەو هەڵوێستانەی ئینگلیز و هاوکارەکانیان، وای لە مەلیك غازی کرد بەڕاستی ئاوڕ بداتەوە لە گرنگی دروستکردنی نەوەیەکی عێراقی ئازاد لە بیروباوەڕی بیانی بە گشتی و ئینگلیزەکان بە تایبەتی. زۆر جار دەیگوت: "دەمەوێت نەوەیەکی گەنجی عێراقی دروستبکەم شوێنی ئەوانە بگرنەوە کە ئێستا وڵات بەڕێوە دەبەن، دوور لە هەیمەنەی بەریتانیا و کونسوڵخانەکەیان". بۆیە سیاسەتەکانی تەقلیدی نەبوون و هەڵوێستەکانی بە گشتی مایەی نائومێدی و دوودڵی بوون بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا و هەڵوێستی مەلیك غازی لە بەرامبەر ئینگلیزەکاندا. لەو کاتەدا زیاتر دەرکەوت، کە لە ڕووپاندا وەستایەوە و لە ڕوداوی ئاشوورییەکاندا ویستەکانیانی جێبەجێنەکرد. کە وایکرد ئینگلیزەکان لێی تووڕە ببن و ڕقیان لێبێتەوە، چالاکییەکانی باڵوێزخانەی بەریتانیا لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستەدا دوو جۆر بوو، یان بە واتایەکی تر کونسوڵخانە دوو ڕێگەی گرتەبەر: ڕێگەی یەکەم هەوڵی دا بە هەر جۆرێك بێت دۆستایەتی غازی بەدەست بێنێت، وا دەچوو سیاسەتی بەریتانیا لە سەرەتاوە ئەوە بووبێت کە غازی بەهێز و بەتوانا بێت و هەمان کات لەسەر هێڵی بەریتانیاش بێت، چونکە دەیزانی ئەگەر بە تەواوی غازی کۆنترۆڵ بکەن، مانای وابوو ئێستا و ئایندەی عێراقیان بە شارستانی و سەربازییەوە لەدەستدایە. واتە دەیانویست غازی مەقاشێك بێت بە دەستی بەریتانییەکانەوە، بەو

مەرجەی ئەو مەقاشە بەهێز بێت، ئەمە باشتر بوو بۆیان لەو وەزیرانەی ناوە ناوە دەگۆڕدران.

دەوترێت غازی لە سەرەتای چوونە سەر عەرشی عێراق، ویستی دیبلۆماسی بێت لەگەڵ بەریتانییەکان و پێیان بڵێت کە لەسەر بەرنامەکەی باوکییەتی، بەڵام ڕۆژگار دەریخست ناتوانێت نوێنەری بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بێت لە عێراقدا. هەرچەند ناوە ناوە هەوڵێك دەدرا بەیوەندی نێوان مەلیك و باڵوێزخانەی بەریتانیا ببوژێنرێتەوە. سێ کەناڵ هەبوون بۆ باشکردنی پەیوەندی لە نێوان مەلیك غازی و باڵوێزخانەی بەریتانیا. کەناڵی یەکەم، هەوڵە دیبلۆماسییەکانی باڵوێزی بەریتانیا، کەناڵی دووەم هەوڵەکانی دکتۆر سندرسن پاشا کە لە ڕاستیدا بەشێکی تەواوکەر بوو بۆ ئەو هەوڵە دیبلۆماسییانەی لە باڵوێزخانەوە دەردەچوون، کەناڵی سێیەم، بریتیبوو لە هەوڵە ناڕاستەوخۆکان لەلایەن ئەو بەرپرسە عێراقییانەی هاوسۆزبوون لەگەڵ باڵوێزخانەی بەریتانیا، ئەوەندەی بە پێویستیان دەزانی ماوە ماوە بە گوێرەی دۆخ و هەلۆێستەکان، ڕێگەی دووەم ئەوە بوو لە ڕێگەی پڕوپاگەندەی سوکەوە غازی بڕووخێنن و بە تەواوی لە ناوی ببەن.

کاتێك ئینگلیزەکان زانییان غازی جەماوەرێکی زۆری هەیە و بە تەواوی بۆتە هاوڕێی گەلی عێراق، بۆ ڕزگاربوونیان لە دەستتێوەردانی بێگانە لە کاروباری عێراق و غازی چیتر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا ناپارێزێت، هەوڵیان دا لە ڕێگەی بەکرێگیراوەکانیان لە عێراق پڕوپاگەندەی ناشیرینی

بۆ دروستبكەن، بەوەی غازی زۆر دەخواتەوە و ڕەفتاری ناشیرینە. من خۆم وەك پاسەوانێكی هیچ ڕەفتارێكی ناشیرینم لێنەبینی. هەرچی ئەو پڕوپاگەندانەی بۆ دەكران هیچیانی تێدا نەبوو، هەمووی دروستكراو بوون، بیرمە جارێكیان كەسێك هات پرسیاری لێكردم: "دوێنێشەو غازی لە كوێ بوو".

– لە كۆشك بوو.

"نەخێر، دوێنێشەو لە ماڵی ژنێك بوو لە ساڵحییە بەناوی (فەرحە)".

وتم: برام من دوێنێشەو ئەفسەری ئێشكگر بووم و تا بەیانی نەخەوتووم و مەلیك لە كۆشكدا بوو بۆ هیچ كوێیەك نەچووە، نە ئۆتۆمبێل چووەتە دەرەوە و نە ئۆتۆمبێل هاتوونەتە ژوورەوە، هەموو دەرگا ناوخۆیی و دەرەكییەكان داخرابوون. هەشت خاڵی پاسەوانی و دوو دەورییەی گەڕۆكمان هەیە، چۆن مەلیك چووە دەرەوە و گەڕاییەوە و ئێمە نەمانزانی؟!

بەو جۆرە ئینگلیز و پیاوەكانیان هەوڵیاندەدا ناوبانگی غازی بشێوێنن و ئەو خۆشەویستییەی لە دڵی خەڵكدا هەیەتی نەیهێڵن. غازی وەك هەر ئەفسەرێكی تر بوو، حەزی لە دۆستایەتی دەكرد لەگەڵ ئەفسەران و بە تایبەت لەگەڵ ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی. ڕابواردنەكانی لە ممارەسەی ئەو حەزە كەسییانەی تێنەدەپەڕی كە پێشتر باسمكردوون. باڵوێزخانەی بەریتانیا و بەكرێگیراوانی هەوڵیان دا مەسەلەی مەیخواردنەوەی غازی تا ئەوپەڕی بقۆزنەوە. لە ڕاستیدا غازی ئەو مەسەلەیەی لە خەڵكی

نەدەشاردەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیگوتبوو ناخواتەوە. لەگەڵ هاوڕێیانیدا دەیخواردەوە و قسە و باس و گەمە و گاڵتەیان دەکرد. وێڕای ئەوەی تەنیایی ئێوارانی بە خواردنەوە دەگوزەراند، بەڵام هیچ ڕۆژێك ڕەفتارێکی ناشیرینم لێ نەبینی، ناحەزانی غازی ئەم لایەنەیان لە دژی بەکارهێنا و چەندین چیرۆکی درۆیان بۆ هەڵبەست، بەڵام ئەو لەوە پاکتر بوو دەربارەی دروستدەکرا. غازی زۆر شازنی خێزانی خۆشدەویست و زۆریش دڵخۆش بوو بە فەیسەڵی کوڕی، سەیر لەوەدا بوو دوای کوشتنی و هاتنی عەبدولئیلاه بو سەر عەرشی عێراق، رمانەکان داخران لە دروستکردنی ئەو پڕوپاگەندانە بۆ عەبدولئیلاه، دیارە خوێنەر دەزانێت بۆچی!

### کوژرانی (وەسڵ)ی برای شیری مەلیك غازی

بە کوشتنی بەکر سدقی، مەلیك ڕاستەوخۆ ئەو باوەڕەی بۆ دروستبوو ئینگلیزەکان هەوڵدەدەن لێی ڕزگار بن، ئەوەی ئەم بۆچوونەی بەهێز دەکرد کوژرانی (وەسڵ)ی برای شیریی مەلیك غازی بوو. بیانووی لۆژیکی دروستبوون بۆ ئەوەی مەلیك غازی گومان بکات دەستێکی نهێنی هەیە بۆ لەناوبردنی.

سەبارەت بە کوشتنی (وەسڵ) بەم جۆرە بوو: لەگەڵ ئەفسەری ئێشکگر بووم لە ئێوارەیەکی مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٨، مەلیك غازی بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم: کە وەسڵ لە خانەی ئێزگەی تایبەت بە مەلیك لە کۆشکی ئەلزهور کوژراوە، بەپەلە چووم بۆ بارەگای ئێزگە دەبینم (وەسڵ) لەسەر کورسییەك ڕاکشاوە و دەمانچەکەی لە دەستی

کەوتووە، پەیوەندیم بە دادوەری لێکۆڵینەوە ئەحمەد طه کرد، ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەریخست وەسڵ بەو دەمانچە کوژراوە کە لە دەستی کەوتۆتە خوارەوە. لە کاتێکدا زۆر سەرخۆش بووە دەمانچەکەی لە دەست بەربۆتەوە و فیشەکێکی لێوە دەرچووە و بەریکەوتووە و کوشتوویەتی. لە ڕاستیدا هەم من و هەم مەلیك بڕوامان بەو قسانە نەکرد، نەشمانتوانی کەسی لەسەر تاوانبار بکەین، بەڵام بە بڕوای من کارەکە ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆ مەلیك، بۆ ئەوەی دەست هەڵگرێت لە وتارە نیشتمانییەکانی و داواکردنی کوەیت و قسە وتن بە سیاسەتەکانی بەریتانیا لە نێزگە تایبەتییەکەیەوە. شەش مانگ بەسەر کوشتنی (وەسڵ)دا تێنەپەڕیبوو، مەلیك غازیش تیا چوو.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٨ مەلیك غازی ئاگاداری کردمەوە، جەمیل ئەلمەدفەعی دەیەوێت بتکاتە پاسەوانی خۆی و دەیەوێت بە سێ پاسەوانی تر بتگۆڕێتەوە، پێمگوت: گەورەم لە ئێستا بە دواوە نامەوێت ببمە پاسەوانی هیچ کەسێك. وتی "زۆر باشە کەواتە دەتگوازمەوە بۆ فەرماندەی سریە لە پاسەوانی پاشایەتی لە کۆشکی ئەلزهور، سڵاوێکم بۆی گرتەوە و بە ڕازیبوونەوە هاتمە دەرەوە، بەڵام سەرم سوڕما لەوەی هەمان ڕۆژ جەمیل ئەلمەدفەعی لە وەزارەت داوای کردم. پێیگوتم: "فوئاد نامەوێت وەك هێڵی پەیوەندی نێوان حکومەت و مەلیك بمێنیتەوە، ڕاشکاوانە واتە نامانەوێت لە نزیکی مەلیك بمێنیتەوە، دەتوانیت هەر شوێنێك دوور لە کۆشکی پاشایەتی بۆ خۆت دەست نیشان بکەیت". داوای گواستنەوەم کرد بۆ سلێمانی، چونکە تێگەیشتم ناکۆکی نێوان

مەلیك و حکومەت چەند توندە و چۆن مەلیك تەنانەت ناتوانێت یەکێك لە پاسەوانەکانیشی هەڵبژێرێت یان بهێڵێتەوە. نازانم دڵسۆزی زۆرم هۆی دوورخستنەوەم بوو، یان شتی تر؟

## بەردەوامی نائارامی و بە دوای یەکداهاتنی ڕوداوەکان

بیرمە شازادە زەیدی مامی مەلیك، ئەو کات وەزیری ڕێگەپێدراو بوو لە ئەڵمانیا، کە هات بۆ عێراق قسەی لەگەڵ کردم سەبارەت بە نیگەرانیی لەسەر مەلیك و وتی: "فوئاد، مەلیك بە تەنیایە، من متمانەی تەواوم بە تۆ هەیە و وەك پاسەوانێکی مەلیك سەیرت ناکەم، بەڵکو وەك برایەکی مەلیك لێت دەڕوانم، چەندە حەزمدەکرد لە عێراقدا پارتێك یان کۆمەڵەیەك هەبایە پشتگیری لە غازی بکردایە". ئەو کات هەستمکرد شازادە زەید دەیەوێت پشتیوانییەکی جەماوەری بە ڕێکخراوێك بۆ غازی دروست بکات، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو پیلانانە ببێتەوە لە بەرامبەر مەلیکدا دەکرێن، پێدەچوو بووبێتە خەیاڵی بیری شازادە زەید. بیری دەکردەوە قەوارەیەکی سیاسی لە هێزەکان و کەسایەتییە سیاسییەکان دابمەزرێنێت، لەوانە حیکمەت سولەیمان کە پەیوەندییەکی زۆر توندوتۆڵ و متمانەیەکی تەواو لە نێوانیاندا هەبوو. هەروەها شێخ موحەممەد ئەلسەدر کە کەسایەتییەکی دیار بوو و مەلیك زۆری ڕێز لێدەگرت و زۆری خۆشدەویست و حەزی لە دانیشتن بوو لەگەڵی. شێخ موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی کە پێگەیەکی بەرزی هەبوو لای خاوەنشکۆ و جێی ڕێز و متمانەی بوو. جەمیل ئەلمەدفەعی کە مەلیك خۆشی دەویست و ڕێزی

دەگرت و بە شێوەیەكی جیاواز جێی متمانەی بوو. مەلیك غازی هەروەها حەزی لە دانیشتنی لەگەڵ هەندێك لە ئەندام پەرلەمانە كوردەكان بوو، بە تایبەت هەردوو پەرلەمانتاری كورد، فارس ئاغای زێباری و میران قادر بەگ. وەك پیاوێكی خەباتگێڕ و بەڕێز سەیری شێخ مەحموودی دەكرد. لەوەش زیاتر بە خزمی خۆیی دەزانی، هەروەها لە كۆلێژی سەربازیدا هاوڕێیەتی قوتابییە كوردەكانی دەكرد و خۆشی دەویستن.

هەندێك لە پیاوانی دەوڵەت هەمیشە هەوڵیاندەدا پەیوەندی نێوان مەلیك و باڵوێزخانەی بەریتانیا باش بكەن. بەداخەوە وەك باسمكرد وەلائەكان زیاتر بەرەو باڵوێزخانەی بەریتانیا بوو، وەك لە كۆشكی شاهانە. نزیكترین وەزیر لە دڵی باڵوێزدا ئەو وەزیرە بوو بتوانێت دڵی وەزیر بە لای بەریتانییەكاندا ڕاكێشێت، باڵوێزخانە لە لایەكەوە زۆر هەراسان بوون لە هەڵوێستە نیشتمانییەكانی مەلیك و لە لایەكی ترەوە حەزكردنی مەلیك لە مامەڵەكردن یان كرانەوە بەسەر وڵاتانی میحوەر و پەرەپێدانی سوپای عێراقی بە چەكی نوێ.

هەوڵێك درا بۆ باشكردنی پەیوەندی نێوان باڵوێزی بەریتانیا و مەلیك، كە بە شكست كۆتایی هات و من هۆكاری ئەو شكستە دیبلۆماسییە بووم.

هەندێك لە وەزیرەكان داوایان لە مەلیك غازی كرد هەوڵی باشكردنی پەیوەندییەكان لەگەڵ بەریتانییەكان بدات و هەنگاوی یەكەمیش میوانداریيەكی چاخواردنەوە بێت، مەلیك لە كۆشكەكەیدا بۆ باڵوێز و ئەندامانی باڵوێزخانە ڕێكی بخات و هەندێك لە وەزیرەكانیش ئامادەی بن.

میوانداریەکە کرا و یاری تۆپی سەرمێزی تێدا کرا، ئاهەنگێکی زۆر خۆش بوو، کەشێکی نیازپاکی و کرانەوە لە نێوان ئامادەبووانی هەردوولادا دروستبوو. لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا باڵوێز داوای لە مەلیك کرد سەردانی باڵوێزخانە بکات و حەزی خۆی دەربڕی بۆ ئەنجامدانی ئاهەنگێکی چاخواردنەوە بۆ مەلیك لەگەڵ یاریکردنی تۆپی سەرمێز. مەلیکیش بە سوپاسەوە داواکارییەکەی قبووڵ کرد. دوای هەفتەیەك مەلیك چووە میوانداریەکە و منیشی لەگەڵ بووم. باڵوێز و ئەندامانی باڵوێزخانە لە پێشوازیماندا بوون. وەزیری دەرەوە تەوفیق ئەلسویدی و سەرۆکی تەشریفات عەبدوڵلا دەملوجی پێشتر ڕۆشتبوون بۆ ئەوەی لە پێشوازی مەلیکدا بن. پێشوازییەکی گەرم لە مەلیك کرا، دوای ئەوە دەستکرا بە یاری سەرمێز و وێنەگرتن بۆ یادگاری و بە ئەرشیف کردنی ئەو سەردانە دۆستانەیەی مەلیك.

کچێکی سووروسپی زۆر جوان دەیویست لە مەلیك نزیك بێتەوە و بە دزییەوە وێنەیەکی لەگەڵ بگرێت، وێنەگرەکە خۆی لە نێو دارەکاندا شاردبۆوە و خۆی بە دار و گەڵا داپۆشی بوو، ئەمە سەرنجی ڕاکێشام، سەیرم کرد کچەکە ئاماژە بۆ وێنەگرەکە دەکات لە کاتێکدا مەلیك ئاگای لێنەبێت وێنەیان بگرێت. لەو کاتەدا مەلیك خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ ئەوانی تردا، کچەکە دەستی مەلیکی گرت و بەرەولای خۆی ڕایکێشا، وێنەگرەکە لەو کاتەدا وێنەیانی گرت. ڕامکرد بۆ لای وێنەگرەکە و هاوارم کرد بە سەریدا: ئایا پرست بە مەلیك کرد بە تەنیا لەگەڵ ئەو کچەدا وێنەی بگریت؟ وتی: "نەخێر" کاتێك باڵوێز دەنگی بیستم و سەیریکرد

تووڕەبووم لەگەڵ کۆمەڵێك لە کارمەندانی باڵوێزخانە هاتن بۆ لام، کە ڕاستی مەسەلەکەیان زانی ئەوجا کامێراکەی لە وێنەگرەکە وەرگرت و کردیەوە و فیلمەکەی لێدەرهێنا و سووتاندی. ئیتر هەرچی ئاهەنگەکەیە تێکچوو و بزە لەسەر لێوی تەواوی ئامادەبووان تۆرا، دوای ئاهەنگی چاخواردنەوە باڵوێزخانەمان بەجێهێشت و هەمووان هەستمانکرد بەهۆی ڕەفتاری وێنەگر و ئەو کچەوە ئاهەنگەکە شکستی هێنا.

لە نێو ئۆتۆمبێلەکە لە دڵی خۆمدا وتم: بشێت ئەو ڕەفتارەی من مەلیکی تووڕە نەکردبێت؟! بەڵام لە ڕاستیدا من ڕاستگۆ و دەستپاکانە مامەڵەم لەگەڵ ئەو دۆخەدا کرد و پێم وابوو پیلانێك هەیە لە وێنەگرتنی لەگەڵ کچێکدا کە نەدەزانرا کێیە و ڕەنگە لە لاپەڕەی گۆڤارێکی جیهاندا بڵاوبکرایەتەوە بۆ ناشیرینکردنی ناوبانگی مەلیك. بۆیە هەر لە ئۆتۆمبێلەکەدا پێمگوت: "گەورەم داوای لێبوردن دەکەم لەو ڕەفتارەم، کە ئاهەنگەکەی تێك دا". ئەو پاڵنەرانەم بۆ ڕونکردەوە وایلێکردم بەو تووڕەییە لێپێچینەوە لەگەڵ وێنەگرەکەدا بکەم.

وتی: "نا، فوئاد دەستت خۆشبێت، کارێکی باشتکرد، من سوپاست دەکەم". ئەتوانم بڵێم من هۆکاری شکست هێنانی هەوڵەکانی بوژاندنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان باڵوێزخانەی عێراق و مەلیك غازی بووم، بەڵام پەشیمان نیم لەوەی کە کردم، چونکە من ئەرکی خۆم بەجێهێنا لەو هەستە دڵسۆزانەیەم بۆ غازی. دواتر بیستمەوە باڵوێزی بەریتانیا کە قسەی لەسەر ئەو بابەتە کردبوو، وتبووی: "غازی هەندێك پاسەوانی بە

توانای لەگەڵدایە". دوای ئەوە چەند جارێکی تر هەوڵدرا غازی میوانداری بکرێتەوە بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا، بەڵام ڕەتیکردەوە و پێم وابێت ئەم بابەتە کۆتایی هێنانی کاری منی وەك پاسەوانی مەلیك هێنایە پێشەوە.

ئەو ڕۆژانەم لە بیرە سێر کلارك کیری باڵوێزی بەریتانیا لە عێراق بەغدادی بەجێهێشت و بیتەرسۆن هاتە جێگەی. کلارك گواسترایەوە بۆ چین، کلارك پەیوەندییەکی خۆشی لەگەڵ مەلیك غازیدا هەبوو، کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی منداڵی غازی ئەو دەمەی لە بەریتانیا خوێندبووی.

بە بۆنەی کۆتاییهاتنی کارەکانی وەك باڵوێز لە عێراق، مەلیك غازی ئاهەنگێکی چاخواردنەوەی لە کۆشکی ئەلزهور ساز کرد، باڵوێز لەلایەن تەوفیق ئەلسویدی وەزیری دەرەوە و سەرۆکی تەشریفاتی کۆشکەوە پێشوازی لێکرا و ژنەکەشی لەگەڵ بوو، ژنەکەی چوو بۆ لای شاژن بۆ ئەوەی دووبەدوو چاوی پێبکەوێت، چونکە شاژن بەشداری ئەو جۆرە دانیشتنانەی نەدەکرد و دوورە پەرێزیی دەکرد. ئەگەر لە بیرم بێت شاژن لەو سەردانەدا بۆ یادگاری دیارییەکی بەخشییە ژنەکەی کلارك. باڵوێز هەموو ئەندامانی باڵوێزخانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. چا خورایەوە، کلارك مەلیك غازیی بردە ئەولاوە و لە ئامادەبووان دووری خستەوە و دوای نزیکەی چارەکە سەعاتێك ئەوجا هاتنەوە. باڵوێز خوا حافیزی کرد و ڕۆیشت. دوای ڕۆیشتنی باڵوێز، وەزیری دەرەوە حەزیکرد بزانێت باڵوێز چی بە مەلیك وتووە؟ غازی وەڵامی دایەوە: "ببوورە پێی وتم حەز دەکەم

وەك بالّویز قسە لەگەڵ مەلیكدا نەكەم، ئەو ڕۆژانەم لە بیرە كە منداڵ بووین لە باخچەكانی لەندەندا پێكەوە پیاسەمان دەكرد و وەك دوو هاوڕێ ڕاستگۆیانە و ڕاشكاوانە قسەمان لەگەڵ یەكتر دەكرد. ببوورە پێت بڵێم: دروستكردنی وڵات –شانیشینێك– لە دروستكردنی ماڵێك دەچێت. كاتێك خانوویەك دروست دەكەیت دەبێت بە جۆرێك دروستی بكەیت بەرگەی گەرمای هاوین و سەرمای زستان بگرێت، دوای تەواوكردنی خانووەكە، دەبێت بیر لە باخچەی چواردەوری خانووەكە بكەیتەوە. تۆ ئێستا لە وڵاتێكدای عەرەب و كورد و شیعە و توركمانی تێدایە. دوای ئەوە دەبێت سەیرێكی باخچەكە بكەیت. بۆیە ئامۆژگاریت دەكەم واز لە مەسەلەی كوەیت و ئەو مەسەلانەی تر بێنە پەیوەندییان بە دەرەوەی عێراقەوە هەیە. پێم وابوو مەبەستی فەلەستین بوو، خەریكی بنیاتنانی عێراقبە"!

هەر هێندەم لە بیر ماوە لەو ئامۆژگارییەی كلارك بۆ غازی لە دوایین چاوپێكەوتنی نێوانیان. لە بیرەوەرییە خۆشەكانی تر لە ساڵی ١٩٣٨ كاتێك ئەڵمانیا نەمسای داگیركرد، دكتۆر گەروبا وەزیری ئەڵمانی ڕێگەپێدراو لە بەغداد ئاهەنگێكی ڕێكخست، سێ بلیتی داوەتنامەی ناردبووە كۆشك، بەو پێیەی لە كۆشكدا سێ فەرمانگەی سەرەكی هەیە: سەرۆكایەتی تەشریفات و سەرۆكایەتی دیوانی شاهانە و سەرۆكی پاسەوانان. مەلیك غازی پێیگوتم: لەگەڵ ئەلشەریف حسەینی كوڕی ناسردا بچم بۆ ئاهەنگەكە، كە لە یانەی ئەلعەلەوییە ڕێكخرابوو. وەك نوێنەری كۆشك لەگەڵ شازادە حسەیندا ڕۆیشتم، زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێكردین، بیرمە وەزیری ڕێگەپێدراو و ئەندامانی بەشی

دیبلۆماسی بە ڕیز وەستابوون و سلاویان بۆ گرتەوە. لە ئاهەنگەکەدا شازادە حسەین لەگەڵ ژنی وەزیری ئەڵمانیدا پێکەوە سەمایان کرد. من سەمام نەدەزانی و بیرم نایەت بە هەموو تەمەنم هەڵپەڕکێ و سەمام کردبێت. بۆیە بە تەنیا دانیشتم و سەیری خەڵکەکەم دەکرد کە هەموو سەمایان دەکرد، ژنی وەزیری ڕێگەپێدراوی ئەمریکی هات بۆ لام، دیارە بەزەیی پێمدا هاتبووەوە. لە ڕاستیدا دەبێت پیاو داوا لە ژن بکات لەگەڵیدا سەما بکات، بەلام ئەو ژنە خۆی هات بۆ لام و پرسی "بۆچی سەما ناکەیت؟" وتم: سەما نازانم وتی: "ئەگەر سەما نازانیت کەواتە بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە؟" وتم: وەك پاسەوانێك بە فەرمانی خاوەنشکۆ هاتووم بۆ ئێرە". داوای لێکردم سەمای لەگەڵ بکەم، بەلام داوای لێبوردنم لێکرد، داوای لێبوردنەکەی بە سووکایەتی زانی. ئەمجا ژنی وەزیری ئەڵمانی هات بۆ لام و داوای لێکردم لەگەڵ ژنی ئەمریکیدا سەما بکەم، کە زانییان بەڕاستی سەما نازانم. بۆیە ژنی وەزیری ڕێگە پێدراوی ئەمریکی داوای لێکردم لە بارەگای خۆیان سەردانی بکەم بۆ ئەوەی فێری سەما و زمانم بکات، بێگومان نەدەچووم، ئەوەی لە ئاهەنگەکە لێم ڕووی دا بۆ مەلیکم گێڕایەوە، لە بیرمە مەلیك غازی پێیگوتم: "فوئاد، خەڵکی چاودێریت دەکەن، ئەگەر بڕۆیت پێت دەڵێن فوئاد بۆتە سیخوڕ بەسەر مەلیکەوە". گوتم: گەورەم هەرگیز ناڕۆم.

## دوایین چاوپێکەوتنی نێوان مەلیک غازی و بەکر سدقی

بیرمە دوایین چاوپێکەوتنی نێوان مەلیک غازی و بەکر سدقی، شەوێك بەر لە کوژرانی بەکر سدقی بوو، کاتێك دوای نیوەڕوانێك هات بۆ تەل ئەلملح و داوای مۆڵەتی سەفەری کرد بۆ ئەو داوەتنامەیەی بۆی نێردرا بوو بۆ ئامادەبوونی لە مانۆڕێکی سەربازی لە تورکیا، دەیویست لەوێوە بچێت بۆ ئەڵمانیا بۆ بینینی ئەدۆلف هیتلەر. دیار بوو مەلیك حەزی نەدەکرد بەکر سدقی ئەو سەفەرە بکات، بۆیە پێیگوت: "بەکر مەڕۆ، چونکە دۆخەکە لە بەرژەوەندییت نییە".

پێیگوت:

"بەکر، مستەفا کەمال ئەتاتورك لەو کاتەوەی کودەتای کردووە، لە تورکیا نەچۆتە دەرەوە". بیرمە موحەممەد عەلی جەوادیش ئامادەی دانیشتنەکە بوو. بەکر وەڵامی دایەوە:

"گەورەم! شاکر وادی و ئیسماعیل ئاغاش لەگەڵمدان و دڵنیام هیچ ڕوونادات" ئەمجا وتی: "دوو سەتڵ عەمبەم بۆ ئەتاتورك کڕیوە یەکێکیان بە ناوی تۆوە و ئەویتریان بە ناوی خۆمەوە "دیارە ئەتاتورك زۆر حەزی لە عەمبە بووە".

ئەوجا تێگەیشتم مەلیك غازی ڕێگەی بە بەکر سدقی داوە بە ناوی ئەوەوە دانوستان بکات دەربارەی پڕچەککردنی سوپای عێراق و پەیوەندیکردن بە وڵاتانی میحوەرەوە. تا ئەوەی هەردووکیان جیابوونەوە و دووبەدوو گفتوگۆیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا غازی نەیتوانی دوودڵی خۆی

بشارێتەوە لە دەرچوونی بەکر سدقی لە عێراق لەو کاتەدا. بەکر سدقی دوو نامەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، یەکێکیان بۆ هیتلەر و ئەویتریان بۆ مۆسۆلینی، دەربارەی دانوستان لەگەڵ وڵاتانی میحوەر بە ناوی مەلیك غازییەوە، سەبارەت بە پەرەپێدانی سوپای عێراق بۆ دوو فەیلەق و پڕچەککردنی بە کەرەستەی سەربازی نوێ. لەوانە پڕچەککردنی بە (٢٠٠) فرۆکەی جەنگی. شایانی باسە ئەو سەردەمە دکتۆر فرتز گەروبا وەزیری ڕێگەپێدراوی ئەڵمانیا بوو لە بەغداد، چالاکی دیبلۆماسی زۆری هەبوون، ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە کرانەوە بەسەر ئەڵمانیادا لە هەموو بوارە بازرگانی و ڕۆشنبیرییەکاندا و پەیوەندییەکی باش لە نێوان بەکر سدقی و دکتۆر گەروبا هەبوو، لە دوای کودەتای بەکر سدقی لە بواری سەربازیدا چالاکییەکانی زیاتر بوون، وەزارەتی بەرگریش دەستیکرد بە دانوستان لەگەڵ کۆمپانیا ئەڵمانییەکان سەبارەت بە واژۆکردنی گرێبەستی چەککڕین، کە فرۆکە و موشەکی دژە ئاسمانیی لەخۆدەگرت. لە کاتی خۆیدا بیستمان پەیوەندییە سەربازییەکان کڕینی چەکی تێپەڕاندووە بۆ ڕاوێژکاری سەربازی و بەکر سدقی لە ڕێگەی گەرۆباوە داوای ڕاوێژکارێکی سەربازیی کردبوو، بە ناونیشانی جیۆلۆجی هاتە بەغداد و ناوی (هانتێر) بوو، بەکر سدقی زۆر لەگەڵیدا دادەنیشت و هەستا بە ڕووپێوییەکی سەربازی بۆ باکووری عێراق و لێکۆڵینەوە لە ئەگەری هێرشکردنە سەر بەغداد لەلایەن ئێرانەوە لە ڕێگەی ناوچەی باکوورەوە و وەستانەوە لە بەرامبەریدا. هەموو ئەمانە کاتێك ڕوویاندەدا لیژنەی دەستەی سەربازی بەریتانی لە بەغداد بوون.

هەروەها (فۆن شیراخ)ی وەزیری لاوانی ئەڵمانیا، بەهۆی ڕۆڵی گەورەی لە ڕێکخستن و ئامادەکردنی گەنجانی ئەڵمانیا، لەلایەن هیتلەرەوە جێگەی ڕێز و بایەخ بوو، لە سەردانێکیدا بۆ بەغداد لە کۆشکی تەل ئەلملح لە ئاهەنگێکی چاخواردنەوەدا چاوی کەوت بە مەلیك غازی. منیش لەگەڵ هەرچی پاسەوانەکانی ترە لەو ئاهەنگەدا ئامادەبووم، سەردانەکە ساڵی ١٩٣٨ بوو. ئەو چاوپێکەوتنە لە ڕۆژنامە بیانییەکاندا زۆر وروژێنرا و زۆریان لەسەر ئەو سەردانە کورتە نووسی. هەرچەندە سەردانێکی داخراو بوو نەزانرا چی تێدا وتراوە ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە ئاماژەی کردبوو بە ئاراستەکردنی عێراق بۆ ئەنجامدانی گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا لە بوارە جیاوازەکاندا. کە گرنگترینیان بواری سەربازی بوو. وێڕای دروستبوونی جۆرێك لە پەیوەندی دۆستانە لە نێوان هیتلەر و مەلیك غازیدا، هیتلەر ئۆتۆمبێلێکی مارسیدسی بە تایبەت بۆ مەلیك غازی ناردبوو کە تا ئێستاش لە باخچەی ئەلزەورا پارێزراوە و فەرمانی دابوو بیرەی ئەڵمانی تایبەت بۆ غازی بنێردرێت و لەسەر هەر بوتڵێك پیتی یەکەمی ناوەکەی کە (غ) بوو چاپکرابوو.

مەلیك غازی نیشتمانپەروەرێکی ئازادی عێراقیی بوو، ئومێدەوار بوو بە نزیکبوونەوەی لە ئەڵمانیا، دەستی بەریتانیا لە عێراق کورت بکاتەوە و دەسەڵاتیان بەسەر زۆرێك لە پیاوانی دەوڵەتدا کەم بکاتەوە. هەرچی کابینەیەکی عێراقی کە دروست دەبوو هەمووی بە دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی باڵوێزخانەی بەریتانیا، دوای ماوەیەك دەڕووخا.

لە سەروبەندی کوشتنی بەکر سدقیدا، مەلیك غازی ئێوارەکەی بە پەلە داوایکردم، یەکسەر چووم بۆ کۆشکی ئەلزهور. کە چوومە نێو کۆشکەوە دەبینم مەلیك غازی و شاژن لە نهۆمی سەرەوە دێنە خوارەوە و نیشانەی تێکچوون و شپرزەیی لە دەموچاویدا دیارە، وتی: "فوئاد دەزانی بەکر کوژرا"؟! نیشانەی ناڕەحەتییەکی گەورەی پێوە دیاربوو. ڕاستی سەرەتا وامزانی نەمردووە و برینداره، پرسیارم کرد: مردووە؟ وتی: "بەڵێ تەواو". لەو کاتەدا شاژنە عالییەم بینی بەرە و لای ئێمە دێت و دەیزانی چی ڕوویداوە. ڕەنگە گوێی لە قسەکانی غازی بووبێت، پێدەچوو زۆر بە تەنگی غازییەوە بێت، نەوەك دوای بەکر سدقی نۆرەی ئەم بێت. ڕووی تێکردم و وتی: "فوئادی برام، ئاگات لە مەلیك غازی بێت". وتم: هیچ ناڕەحەت مەبە، سوپا لە خزمەتی مەلیکدایە. بە ناڕەحەتیێکەوە وتی: "متمانەم بە سوپایەك نییە سەرۆك ئەرکانەکەی بکوژرێت".

وێڕای ناڕەحەتی بۆ کوژرانی بەکر سدقی، مەلیك زۆر شپرزە و شڵەژاو بوو. ئەوەی زیاتر سەغڵەتی کردبوو دوو نامەکە بوو لە جانتاکەی بەکر سدقی، کە نێردرابوو بۆ هەریەك لە هیتلەر و مۆسۆلینی.. مەلیك داوای لێکردم پەیوەندی بکەم بە ئەمین ئەلعومەریەوە کە فەرماندەی مەوقع بوو، ڕاستەوخۆ دوای کوژرانی بەکر سدقی ئەو کاروباری موسڵی گرتەدەست. کە پەیوەندییەکەم وەرگرت ڕاستەوخۆ مەلیك قسەی لەگەڵ ئەمین ئەلعومەریدا کرد و پرسیاری ئەو جانتایەی کرد بە بەکر سدقی بووە، داوای لێکرد بە دوایدا بگەڕێت و ئەگەر دیتییەوە نەیکاتەوە و بیهێنێت خۆی ڕادەستی مەلیك غازیی بکات. دووبارە داوای لێکردمەوە

پەیوەندی بە ئەمین ئەلعومەرییەوە بکەمەوە دەربارەی جانتاکە، بەڵام ئەلعومەری پێیگوتم: "جانتاکە دیار نییە و نەدۆزراوەتەوە". وێڕای گەڕانی ئەو شوێنانەی پێش کوشتنی و پاش کوشتنی بەکر سدقی لێبووە، بەڵام جانتاکەیان نەدۆزیوەتەوە. لە کاتژمێر دووی شەو لە ڕێگەی هەواڵگریە تایبەتەکانییەوە بە مەلیك غازی ڕاگەیەنرا، مستەر تۆمسۆنی ئەفسەری هەواڵگری بەریتانیا لە ڕێگەی ڕووباری گوێڕەوە پەڕیوەتەوە بەرەو موسڵ، ئەو کات ئیتر مەلیك تووشی بێئومێدی بوو لەوەی جانتاکە بدۆزرێتەوە.

## بیرەوەرییەکانم لەسەر بەکر سدقی

لە بیرەوەرییەکانم لە بارەی بەکر سدقی، سەرەتای دامەزراندنم بە ملازمی دووەم، فەریق بەکر سدقی فەرماندەی ناوچەی ڕۆژهەڵات بوو لە کەرکوك، ئەو کاتە هێشتا فیرقەکان پێکنەهێنرابوون. دەمانبینی هەمیشە دێت بۆ سەرپەرشتیکردنی مەشقکردنەکانمان، زۆر گرنگی دەدا بە بابەتی مەشقی سەربازی. ئەو ئەفسەرە عێراقییانەی بەکر سدقییان ناسیوە گەواهی ئەوەی بۆ دەدەن لە توانا و زانستە سەربازییەکاندا ئەفسەرێك بووە بە پلەی یەکەم. زۆر گرنگی بە مەشق و هونەرە سەربازییەکان دەدا. هەمان کات لایەنی بیردۆزەیی و ڕۆشنبیری پشتگوێ نەدەخست. بۆیە هەموو ڕۆژێکی دووشەممان کۆیدەکردینەوە و بابەتێکی زانستی یان ڕۆشنبیریی پێ دەوتینەوە، ئیتر ئەگەر پەیوەندیی بە زانستی سەربازی یان هەر زانستێکی ترەوە هەبایە، بەو پێیەی بەشێکە لە ڕۆشنبیری گرنگ

و پێویستە بۆ تەواوکاری کەسایەتی ئەفسەر، یان خۆی بابەتەکەی پێدەوتینەوە یان ئەفسەرێکی ڕادەسپارد وانەکە ئامادە بکات و بیڵێتەوە.

لە هەموو وانە وتنەوەکاندا بەشداری بەرچاوی هەبوو لە گفتوگۆ و کۆمێنت و بەدواداچووندا. ڕایهێنابین لەسەر ئاهەنگێکی شەوانی هەموو ڕۆژێکی سێشەممان لە یانەی سەربازی. کەشێکی دۆستانەمان لە نێوان ئەفسەراندا دروستدەکرد وەك ئەوەی یەك خێزان بین. لە کەشوهەوای مەشق و ڕاهێنانەوە دەمانگواستەوە بۆ کەشوهەوای کرانەوە و شادی. لە بیرمە پارێزگار و هەندێك گەورە فەرمانبەرانی کەرکوکی بانگهێشت دەکرد. قسەیەکی خۆشی ئەو ڕۆژگارانە، شەوێك لە شەوانی یانەی سەربازی کەرکوك کۆمەڵێك ئەفسەر وەك هەمیشە لە سەر مێزێك دانیشتبووین قسە و باسمان دەکرد، لەپڕ فەریق بەکر سدقی هات لامان دانیشت و دەستیکرد بە نوکتە و قسەی خۆش، یەکێك لە ئەفسەرەکان بە پلەی ڕائید کە ناویم لە بیر نەماوە ڕوویتێکرد و وتی: "گەورەم نهێنیی تۆ لەگەڵماندا چییە، کە پێدەکەنیت و قسەی خۆش دەکەیت و نوکتە دەگێڕیتەوە، ئێستا چەندە بەشوش و ئێسك سووکی، بەڵام سبەینێ لە کاتی دەوامی فەرمیدا دەگۆڕێیت و لێمان دەبیتە بەراز" هەرچی دانیشتوانە دایانە قاقای پێکەنین.

بەکر سدقی لە کاتانێکی نادیار و چاوەڕوان نەکراودا دەهاتە پشکنینمان و لە پڕ لە نێو خۆماندا دەمانبینییەوە سواری ئەسپەکەیەتی و دەمانپشکنێت. یان لە ناکاو دەچوو بۆ یەکە دوورەکان لە کاتانێکی

چاوەڕوان نەکراودا. بۆیە هەمیشە هەستمان دەکرد لە کاتی مەشق و لە هەموو کاتێکی تردا لەگەڵماندایە. لە کاتی ئەرك و دەوامدا زۆر جدی بوو، بەڵام لە کاتی دەرەوەی ئەرك و دەوامدا دەبوو بە کەسێکی تر.

ئەفسەرەکانی ژێردەستی خۆشدەویستن و پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵیان هەبوو. گرنگی زۆری دەدا بە دروستکردنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ ئەفسەرانی پلە نزمدا. بە تایبەت ئەوانەیان تازە دادەمەزران، یان تازە دەگوازرانەوە. بۆ خۆی هەڵدەستا و دەچوو بەرەوڕووی ئەفسەرە تازەکان، یان ئەوانەی پێشتر لەگەڵی بوون. لە مێزێکدا لەگەڵیان دادەنیشت و قسە و گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن و لە ژیان و کێشە و گیروگرفتەکانیانی دەپرسی. زۆر جار داوای بوتڵە بیرەیەکی بۆ خۆی و بۆ ئەفسەرە پلە نزمەکە دەکرد بۆ ئەوەی ئەو شەرمە لە نێوانیان هەڵگرێت و کەشێکی دۆستانە دروستبکات، چونکە لە ڕاستیدا کارێکی ئاسان نەبوو پەیوەندییەکی دۆستانە لە نێوان دوو ئەفسەر، یەکێکیان بە پلەی ملازمی دووەم و ئەوی تریان بە پلەی لیوا یان فەریق، دروست ببێت. چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ ئەفسەراندا چەندبارە دەکردەوە بۆ ئەوەی بەدواداچوون بۆ کێشەکانیان بکات و هەوڵی چارەسەریان بدات، بڕوای زۆر بەوە هەبوو دەبێت باری دەروونی ئەفسەران جێگیر بێت. (ئێمەی ئەفسەرانی پلە نزم) وێڕای توندی و جدییەتی ئەو پیاوە، بەڵام هەستمان بە ئاسوودەییەکی دەروونی دەکرد، چونکە وەك سەرکردەیەك دەیپاراستین و پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ هەموو ئەفسەرێکدا هەبوو.

هەمووان دەمانزانی ئەگەر کارێکی ناڕەوا لەگەڵ ئەفسەرێکیدا بکرایە، بەکر سدقی ئامادەیی تەواوی هەبوو دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لە سوپا پێشکەش بکات.

نمونە لەسەر ڕەوشتجوانیی زۆرە، دەڵێن خەلیل زەکیش کە ئەفسەرێکی گەورەی سوپای عێراق بوو، ئەم سیفەتانەی تێدا بووە. بەڵام بەداخەوە هەلی ئەوەم بۆ نەڕەخسا بیناسم. لە ڕاستیدا بەکر سدقی پاشخانێکی ڕۆشنبیری بەرز و ئەزموونێکی کەسیی زۆری هەبوو کە وای لێکردبوو ببێتە خاوەنی ئەو ڕەوشتە. کە دەبێت لە هەر سەرکردەیەکی مەزندا هەبێت. لە بیرمە کاتێك لە مەشقی جەنگی شاخاویدا بووین لە سەربازگەی ئاغجەلەر، قوتابیانی گوندی عەسکەر کە گوندەکەی بەکر سدقی و جەعفەر ئەلعەسکەری بوو سەردانیان کردین، ئێمە لە نزیك گوندەکە هەڵمان دابوو، بەکر سدقی ناردی بە شوێن خزمەکانی و خزمەکانی جەعفەر ئەلعەسکەری و کۆمەڵێك لە خەڵکی گوندی عەسکەر و هەرچی ئەفسەرانی سەربازگەیە، وانەیەکی بۆ وتینەوە دەربارەی ڕۆڵی ڕۆشنبیری و زانست لە پێشخستنی گەلاندا. لە بیرمە دەیگوت "سەیرکەن" قسەکەی بۆ ئێمەی ئەفسەران و قوتابیان و مامۆستایان و ئامادەبوان بوو، سەیرکەن ئەوانە هەموو کوڕە مامی جەعفەر ئەلعەسکەریی یەکێك لە دامەزرێنەرانی سوپای عێراقن.

بەڵام ئەوانە، ئامارەی دەکرد بۆ خزمەکانی خۆی، کوڕی مامەن، من ئێستا فەریقم لە سوپای عێراق، ئەگەر ئێمە ئەم ڕێگەیەمان نەبڕیایە" ئەوا

نەدەگەیشتینە ئەم پلەیە. ئەوان ئێمە و زۆرێك وەك ئێمەیان هێنایە دونیاوە. ئەمجا هانی ئامادەبووانی دا کە ڕێگەی زانست و زانیاری بگرنەبەر، ویستی هەندێك پارە بەسەر قوتابیان و باوکیاندا دابەش بکات بەڵام نەیبوو، بۆیە لە بودجەی سەربازگە قەرزێکی وەرگرت و دابەشیکرد بەسەریاندا.

دوای ڕۆیشتنی بۆ ڕێزلێنان لەو گوندەی جەعفەر ئەلعەسکەری و بەکر سدقی تیادا لەدایکبووبوون، فەرماندەی فەوجەکان بڕیاریان دا هەرچی قوتابیانی گوندەکەیە دەستێك جلی خاکییان بۆ بکەن. هەرزوو بەرگدرووەکانی سەربازگە ئەندازەی قوتابییەکانیان گرت و لە شێوەی جلی کەشافە دەستێ جلیان بۆ هەموو قوتابیانی گوندی عەسکەر دروو. هەریەکە و جووتێك پێڵاویشمان بۆ کڕین و لەگەڵ جلەکانیان بۆمان ناردنەماڵەوە.

بەکر سدقی زۆر دەستبڵاو و بەرچاو تێربوو، پارەی لە گیرفاندا نەدەمایەوە، جارێکیان داوای مۆڵەتێکی دوو مانگی کرد بۆ ئەوەی بچێت لە دەرەوەی عێراق پشوویەك بدات، هەندێك لە ئەفسەران چوون بۆ بەڕێکردنی لە وێستگەی شەمەندەفەری کەرکوك، یەکێك لەوانەی لەگەڵی چوو بەڕێی بکات، جەمیل پاشا ئەلراوی پارێزگاری کەرکوك بوو، بەڵام بە لامانەوە سەیر بوو دوای دوو هەفتە هاتەوە و پەیوەندی بە دەوامەوە کردەوە، کاتێك لێیان پرسی بۆچی؟ بە ڕاشکاوی وتی: "وەڵا پارەکەم تەواوبوو". نەیدەتوانی لە دەرەوەی شوێنی وەزیفەکەی بژی بۆیە

گەڕایەوە.

لە بیرمە لە فەوجی حەوت بووم، وەك فەرماندەی فەسیل بە شێوەیەکی کاتی گوازرامەوە بۆ جبەخانەی پیادەی ناوچەی ڕۆژهەلات بۆ مەشقکردن بە سەربازە تازەکان، لە کاتی تووڕەبووندا لە سەربازێکم دا بەناوی (ضمد) باوکی سەرکاری ئەحمەد ڕەشید پاشا بوو، خوێن لە سەری هات، بردرا بۆ نەخۆشخانە و دایکی چووە لای فەرماندەی ناوچە کە خوالێخۆشبوو فەریق بەکر سدقی بوو، سکالای لەسەر کردم، فەرماندەی جبەخانەی مەشقکردن، موقەددەم مەحموود حیلمی بوو، داوای لێکردم سواری گالیسکەکە ببم و لەگەڵ ضمددا بچم بۆ بارەگای ناوچە، لەگەڵ ضمددا چووم، ئەو کەسەی بردمانی ناوی حاتەم بوو زۆر تووڕەبوو و وتی: "دەبینیت ئێستا چۆن دونیا بەسەرتدا دەڕووخێنم" لە ڕاستیدا هاوارکردنیم بەسەرمدا قبووڵ نەکرد، دارێکم بە دەستەوە بوو بۆی دابەزیم، کابرا ڕایکرد و من بە دوایدا و گالیسکەکەش بە دواماندا، تا لە نزیك بارەگای ناوچە پێی گەیشتم و تێروپڕم لێدا، سەربازێکی زۆر لەسەرمان کۆبوونەوە و لە ژێر دەستم دەریانهێنا و بردیان بۆ نەخۆشخانەی سەربازی و هەموو گیانی برین بوو، منیش چووم بۆ بارەگای ناوچە و چوومەلای بەکر سدقی و لە حاڵەتی تووڕەبووندا بووم، لە بیرمە کەسێك لە بارەگای فرقە کاری دەکرد ناوی موقەددەم عەبدولوەهاب (ابودگە) بوو، بەکر سدقی بانگی کرد و پێیگوت: "فوئاد ببە شەربەتێکی مێوژی بەرێ، کەی بە تەواوی تووڕەبوونەکەی نەما ئەوجا بیهێنەوە بۆ لام". کە هاتمەوە سەر خۆم دووبارە چوومەوە بۆ لای

بەکر سدقی، پرسیاریکرد: بۆچی لەو سەربازەت داوە؟

– گەورەم، لەبەر ئەوەی ڕێنومایییەکانی مەشقکردنی بە باشی جێبەجێ نەدەکرد.

ناردی بە شوێن سەربازەکەدا و لێی پرسی: "ملازم بۆچی لێی دایت؟"

– گەورەم لێی نەداوم.

بەکر سدقی وتی: بەڵام سکاڵاتان لێکردووە و دایکت هاتووە سکاڵا دەکات.

سەربازەکە وتی: "نەخێر گەورەم ئەو مامە و لێی نەداوم، بەڵکو تفەنگەکە لە دەستی خۆم پەڕی و کێشای بە سەرمدا و خوێنی لێهات، ئەمجا ئەگەر لێیشی دابم، ئەو وەکو بابم وایە، بەهەرحاڵ بەکر سدقی لیژنەی لێکۆڵینەوەی هەر لەسەر پێکهێنام.

بەڕەحمەت بێت هەر لەو کاتەدا پێیگوتم: "تۆ ئەفسەرێکی باشیت، بەڵام مامۆستایەکی خراپیت". ئەمجا وتی: "لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هۆکار نیت، دەبوو ئەفسەرێکی بە تەمەن بنێردرابا بۆ ئەرکی مەشقپێکردن کە هەم ئارامگرتن و هەم بیندرێژی دەوێت، تۆ هێشتا توانای دانبەخۆداگرتنت کەمە"، دوای کۆتاییهاتنی لێکۆڵینەوەکە، فەرماندەی فەوجی ڕاسپارد هەندێك ئامۆژگاریم بکات.

سەبارەت بە کوشتنی بەکر سدقی، موقەددەمی فڕۆکەوان موسا عەلی کە فەرماندەی بنکە بوو لە ناوچەی موسڵ، بەمجۆرە ڕوداوەکەی بۆ

خاوەنشکۆ مەلیك غازی گێڕایەوە کە منیش ئامادەی ئەو دانیشتنە بووم: "موحەممەد عەلی جەواد لە موسڵ پەیوەندی کرد بە بەکر سدقییەوە و پێکەوە هاتن بۆ یانەی هێزی ئاسمانی، کاتێك هەردووکیان لە باخچەکەی یانە دانیشتبوون بۆ خواردنەوەی عەسرەچایەك، دەبینم مەحموود هیندی ئاماژەی دا بە عەریفێك، وەك ئەوەی بیناسێت و پێیگوت: "ئەوە بەکر سدقییە". کاتێك عەریفەکە نزیك بووەوە وایانزانی داواکاری هەیە – عەریزەیەکی پێیە – و پێشکەشی بەکر سدقیی دەکات، بەڵام وا دەچوو لە ژێریدا دەمانچەیەکی شاردبێتەوە. هەر کە لێی نزیك بووەوە، ڕووی دەمانچەکەی کردە بەکر سدقی، موحەممەد عەلی جەواد هێرشی کردەسەری، گوێم لە عەریفەکە بوو، دەیگوت: "گەورەم تۆ وازبێنە من تەقە لە بەکر سدقی دەکەم". هەر کە زانیی موحەممەد عەلی جەواد هەوڵدەدات دەمانچەکەی لە دەست دەربێنێت، تەقەی لە ئەویش کرد و کوشتی.

سەبارەت بە لێکۆڵینەوە دەربارەی کوشتنی بەکر سدقی، دەستەی لێکۆڵینەوە گەیشتنە موسڵ، دەستەکە بە سەرۆکایەتی ئەنتوان لۆقا بوو، بۆ ماوەیەکی کاتی پلەیەکی سەربازیی درایە تا ئەو کاتەی لێکۆڵینەوەکان تەواو دەبن. لەو دەستەیەوە هەندێك ڕەفتاری نابەجێ ئەنجامدرا لە بەرامبەر هەندێك ئەفسەردا، وێڕای پشتگوێ خستنی تەواو بۆ پێگەی ئەمین ئەلعومەری، ئەلعومەری هەر لە سەرەتاوە داوایکرد دەستەی لێکۆڵینەوە بگۆڕدرێن. بەڵام داواکارییەکەی جێبەجێ نەکرا، پێدەچێت وەزارەتیش لەگەڵ دەستەی لێکۆڵینەوەدا بووبن. لیوا ڕوکن ئەمین

ئەلعومەری لەگەڵ ئەفسەرەکانیدا لە دژی دەستەی لێکۆڵینەوە وەستانەوە و دەستەکە لە ئەرکەکەیاندا شکستێکی گەورەیان هێنا و سەرکۆنە کران و گەڕێندرانەوە بۆ بەغداد. دوای ئەوە لیوا ڕوکن ئەمین ئەلعومەری پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەغداد پچڕاند و تەنها بە بروسکە پەیوەندی لەگەڵ سەربازگەی وەشاشدا دەکرد، واتە لەگەڵ عەقید (سەعید ئەلتکریتی) و (فەرماندەی فرقەی کەرکوك، لیوا ئەمین زەکی). لە ڕاستیدا پەیوەندییەکانی نێوان سەعید ئەلتکریتی و لیوا ڕوکن ئەمین ئەلعومەری ئەوە بوو چارەسەرێکی مامناوەند بۆ ئەو دۆخە مەترسیدارە بدۆزرێتەوە، چونکە کەسانێك هەبوون لایەنگری حیکمەت سلێمان بوون و بە ئازار بوون بۆ کوشتنی بەکر سدقی، کەسانێکیش هەبوون لایەنگری نووری ئەلسەعید بوون، سوپا بەسەر خۆیدا دابەش بووبوو و مەلیك لە لایەکەوە هیچ حەزی لە نووری ئەلسەعید نەبوو و لە لایەکی ترەوە فشارێکی زۆر لەسەر ڕووخاندنی کابینەکەی حیکمەت سلێمان هەبوو و لەگەڵ بیرۆکەی کۆنترۆڵکردنی موسڵ نەبوو بە ڕێگەی سەربازی، دەیگوت: "چۆن سوپا و هێزێك بنێرین شەڕ لەگەڵ سوپاکەی خۆماندا بکات؟" هەرچەندە مەلیك لە کۆتاڕۆژەکان بەر لەوەی کێشەکە چارەسەر بێت، بەرپرسیارێتی تەواوی دەخستە ئەستۆی ئەمین ئەلعومەری بەوپێیەی سەرکردەی سەربازی موسڵ و لە ڕووی سەربازییە پەیوەندی نێوان بەغداد و موسڵ پچڕا بوو.

مەلیك ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ئەو ڕێککەوتنە سەعید ئەلتکریتی و ئەمین ئەلعومەری کردیان کە پێکهێنانی حکومەتێکی بێلایەن بوو. لەبەر

چەند هۆیەك ناوی جەمیل ئەلمەدفەعی پێشنیارکرا بۆ پێکهێنانی کابینەکە، لەو کەسانە بوو مەلیك متمانەی زۆری پێبوو، وەلائی زۆری بۆ مەلیك هەبوو، لەلایەن زۆربەی چینە سەربازیی و مەدەنییەکان قبووڵکراوبوو. ئاراستەکە وابوو جەمیل ئەلمەدفەعی بهێنرێت بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ڕابوردوو دابداتەوە. بۆیە بروسکەی بۆ کرا بێتەوە بۆ عێراق، بە درێژایی ئەو ماوەیە لە لوبنان بوو گەڕایەوە بەغداد، ڕاسپێردرا بە پێکهێنانی کابینەکەی بۆ ئەوەی ئەو دۆخە شپرز و شڵەژاوە چاکبکاتەوە. لە ڕاستیدا کەسایەتی جەمیل ئەلمەدفەعی سەرکەوتوو و گونجاو بوو بۆ ئەو دۆخە. پیاوێکی سەنگین و بێلایەن بوو، ڕق و کینەی نەدەزانی، هەرواش بوو، توانی لە دوای ئەو هەموو دۆخە خراپە بارەکە ڕاست بکاتەوە و بیخاتەوە سەر ڕێچکە خۆی، هەرچی ئەفسەر و پلە نزمەکان (ضباط الصف) ئەوانەی لایەنگری بەکر سدقی بوون و گواسترانەوە بۆ بەسرە بگەڕێنێتەوە، بەڵام دوای ماوەیەك نووری ئەلسەعید توانی ببێتە سەرۆك وەزیران، هەرچەندە مەلیك حەزی لێنەبوو، بەڵام لە ژێر دۆخێکی فشاراویدا ناچار بوو ڕایسپێرێت بۆ پێکهێنانی کابینەکەی، ئەلمەدفەعیش ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێت لەو بارودۆخەدا من لە بەغداد نەبووم، چونکە کاری من وەك پاسەوانی مەلیك کۆتایی هاتبوو.

وەك دەزانین، بەکر سدقی بۆچوونی نەرێنیی هەبوو لە بەرامبەر سیاسەتی بەریتانیا و حەزی بە لای سیاسەتی وڵاتانی میحوەر بوو. هەستماندەکرد بەکر سدقی بە ئامانج گیراوە. ئینگلیزەکانی توورەکردبوو،

لەو ماوەیەش بە تایبەتی قسەی یەکەمی لە سوپادا دەکرد، زۆر هانی مەلیك غازیی دەدا دژی بەریتانییەکان و تەنانەت ئاراستەکردنی سیاسەتی ولاتیش، لە سەردەمی ئەودا ڕێککەوتننامەی نێوان عێراق و بەریتانیا پێشێلکرا، کاتێك عێراق چەککڕینی لە بەریتانیا ڕەتکردەوە و مەلیك غازی ڕەزامەندی دەربڕی بۆ کڕینی پۆلێك فڕۆکەی (بریدا)و پێنج فڕۆکەی بۆمبهاوێژ لە جۆری سافۆی لە ئیتاڵیا، لە قاڵبدان و پەکخستنی تەواوی دەسەلاتەکانی دەستەی سەربازی بەریتانی، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە ناحەزان و نەیاران لە لایەنگرانی نووری ئەلسەعید بەردەوام هەوڵیاندەدا بە هەر شێوەیەك بێت بەکر سدقی لەناو ببەن. بۆیە پێشبینی کوشتنیمان دەکرد، بەلام بە بڕوای من بەکر سدقی خۆی لەو بابەتە نەدەترسا، ڕەنگە باوەڕی وابووبێت یان ناکوژرێت یان هەوڵدان بۆ کوشتنی سەرکەوتوو نابێت. ئەوەندەی من بزانم پاسەوانێکی کەم لە ماڵەکەیدا بوون. بۆیە ئەگەر یەکێك لە بەغداد یان لە ماڵەکەی خۆیدا بیویستایە بیکوشتایە هێندە کارێکی گران نەبوو. تەنانەت کاتێك کوژرا پاسەوانە تایبەتەکەشی لەگەڵ نەبوو. لە یانەی سەربازی هێزی ئاسمانیش کە تیایدا کوژرا هیچ پاسەوانێکی تایبەت نەبوو. ئەگەر بەکر سدقی لەو کاتەدا پاسەوانی لەگەڵ بایە بە بڕوای من نەدەکوژرا. بە بیرم دێت تەنها یەك عەریف پاسەوانی بوو، زۆریش دڵسۆزی بوو و پێی سەرسام بوو، پێدەچێت لەو ڕۆژانەدا ڕێگەی دابێت بچێتەوە بۆ سەردانی کەسوکاری، کە گەڕایەوە و بەکر سدقیی بە مردوویی بینی بەرگەی دۆخەکەی نەگرت و خۆکوژی کرد، نەمرد و برایە نەخۆشخانەی سەربازی و چاکبووەوە بەلام

هەر خۆی کوشتەوە.

بە بۆچوونی من یەکێك لەم سێ دەستەیە تۆمەتباربوون بە کوشتنی بەکر سدقی، کە دەشێت لە سێ ناسنامەدا خۆیان پیشان بدەن:

١. ئەفسەرە ناسیۆنالیستە بە پەرۆشەکان بۆ ناسیۆنالیستی عەرەبی.

٢. ئەو کەسایەتییە شارستانیی و ئەفسەرانەی ناسراوبوون بە هاوسۆزییان لەگەڵ باڵوێزخانەی بەریتانیا، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاشکرا و بە بەرچاوی خەڵکییەوە بەکرێگیراوبوون بۆیان.

٣. ئەو ئەفسەرانەی هیچ مەبەستێکی سیاسییان نەبوو، تەنها لەبەر هۆکاری کەسیی بەرکەوتنیان لەگەڵ بەکر سدقیدا هەبوو و دەیانویست تۆڵەی لێبکەنەوە.

ئەمە واقیعی ئەو کوتلەیە بو پلانیان دانا بۆ کوشتنی بەکر سدقی و جێبەجێیان کرد، هەرلایەنە و مەبەستی خۆی هەبوو لە قوتاربوون لێی.

بێگومان بەریتانیا بە پلەی یەکەم لە پشتی لەناوبردنی بەکر سدقییەوە بوو، بەهۆی بەکرێگیراوە سەربازی و شارستانییەکانی لە عەرەب و کورد، ڕوونترین بەڵگە لەوەی بەریتانیا لە پشتی کوشتنەکەوە بووە، وتەکەی (کابتن هۆڵت)ی سکرتێری ڕۆژهەڵاتی باڵوێزخانەی بەریتانیا بوو، کاتێك ئەویش لەگەڵ مەلیك غازی ئامادەی ئاهەنگی کردنەوەی فڕۆکەخانەی بەسرە بوو، وتی: زۆر ئاساییە ئەو هەموو ئەفسەرە و زوبات صفە زۆرەی لایەنگری بەکر سدقی لە دوای کوشتنی گواسترانەوە بۆ بەسرە. لەو

کاتەی مەلیك فرۆکەخانەکەی کردەوە، گوێم لە تەحسین عەلی پارێزگاری بەسرە بوو کە لە ڕیزی ئەوان و لە پشتی خاوەنشکۆوە وەستا بوو، وتی: "پێویست بوو ئەمڕۆ بەکر سدقی لێرە ئامادە بووایە، چونکە ئەو پلانی بۆ فرۆکەخانەکە دانا و شوێنەکەی دیاریکرد، ئەو بوو زۆر حەزی دەکرد بەسرە فڕۆکەخانەی هەبێت". بەڵام هەرزوو کابتن هۆڵت وەڵامی دایەوە و هەرچی گوێیان لێبوو تووشی پەستیی و تووڕەیی کرد و وتی: "حکومەتی بەریتانیا بڕیاری دا بەکر سدقی لەناو ببات و بکوژێت. نیو ملیۆن دیناری بۆ کوشتنی دانا. بەڵام کوشتنی تەنها ۷۰۰۰۰ هەزار دیناری تێچوو، هەرچی پارەکانی ترە گەڕێنرانەوە بۆ خەزێنەی بەریتانیا". تەحسین عەلی پارێزگاری بەسرە زۆر قەڵس بوو لەو قسەیەی کاپتن هۆڵت.

زۆر بەڵگەی تر هەیە لەسەر ڕۆڵی ئینگلیزەکان لە کوشتنی بەکر سدقی. لەوانە: هەموو کەسایەتییە سیاسییە ناسراوەکان بە ئاشکرا هاوکار و هاوسۆز بوون لەگەڵ ئینگلیز و دژ بە بەکر سدقی و حکومەتەکەی حیکمەت سلێمان بوون، هەر هەموویان عێراقیان جێهێشت و نامە و چالاکییەکانیان بەو دواییانە بە کتێب بڵاوکرانەوە و بە ڕوونی باسی ئەو هەوڵانە دەکەن کە لە ناوەوە و دەرەوە دەدران لە دژی حکومەتەکەی حیکمەت سلێمان. باشم لە بیرە دوای ڕووخانی کابینەی ئینقلاب، مەلیك غازی پێیگوتم: حەز دەکات لەگەڵ حیکمەت سلێماندا دابنیشێت، بەڵام حیکمەت لە ماڵەکەی خۆیدا لە ژێر نیمچە مانەوەیەکی بە زۆردا بوو، هێشتنەوەی لە ماڵدا بۆ پاراستنی گیانی بە دوو شێوە لێکدرایەوە، یەکەم: دەشێت بە ئامانج گیراو بێت بە تایبەت باڵوێزخانەی بەریتانیا لە

دژی بوون، دووەم: لە ڕووی سیاسییەوە چالاکتر بووبوو، ئەمەش ئەو شتە بوو باڵوێزخانەی بەریتانیا لێی دەترسا. بۆیە دوای کوژرانی بەکر سدقی و کەوتنی کابینەکەی، حیکمەت سلێمان لە ماڵ نەدەهاتە دەرەوە، ئەمەش وایکرد ئاسان نەبێت مەلیک غازی بە ئاشکرا ببینێت، بە مەلیکم وت: من دەتوانم بیهێنمە کۆشك. وتی: "چۆن؟" وتم: ماڵی حیکمەت سلیمان بە تەنیشت ماڵی ماجید مستەفای خاڵمەوەیە، دەتوانم بە شەو بە ئۆتۆمبێلێکی تر بیهێنم. مەلیك ڕەزامەندی دەربڕی و بیرۆکەکە جێبەجێکرا. مەلیك چاوی بە حیکمەت سلێمان کەوت و نازانم چی لە نێوانیاندا باسکرا، دوای چاوپێکەوتنەکە گەڕاندمەوە بۆ ماڵی خاڵم ماجید مستەفا. دەبینم هەندێك نوسراو بە زیادەڕەوییەوە باس لەو بابەتە دەکەن. وەك ئەوەی چەندین چاوپێکەوتن لە ڕێگەی منەوە لە نێوان مەلیك غازی و حیکمەت سلێماندا ئەنجامدرابێت، ئەوەی ڕاستبێت و ئەوەندەی من بزانم مەلیك تەنها ئەو یەك جارە لەگەڵ حیکمەت سلێماندا کۆبووەوە و چاویان بە یەکتر کەوت.

ڕۆژی دوایی هەریەك لە سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری جەمیل ئەلمەدفەعی، بە چاوپێکەوتنەکەیان زانیبوو، جەمیل ئەلمەدفەعی هات بۆ ژووری پاسەوانەکان و دەستی گرتم و بردمییە دەرەوە، پرسیاری لێکردم: "کێ دوێنێشەو لای مەلیك بوو؟". وتم: گەورەم ئەگەر بڵێم کەسی لا نەبوو درۆم کردووە، ئەگەر دەتەوێت بزانیت کێی لابووە برۆ لە خۆی بپرسە....

من ئەو کاتە ئەفسەر بووم بە پلەی ملازم، پێیگوتم: "کوڕم هیچی تێدا

نییە تەنها دەمانەوێت بزانین کێ لای گەورەمان بووە". وتم: گەورەم ئەگەر هیچی تێدا نییە بۆچی خۆت ناچی پرسیاری لێبکەیت؟ درێژەم پێدا و وتم: گەورەم ئێوەی ئەفسەرانی پلەباڵا ئێمە فێری ڕەوشتی سەربازی و ڕێزگرتن لە نهێنییەکان و وەفاداریی و متمانە و دڵسۆزی دەکەن، ئێستا وات دەبینم دەتەوێت ببمە سیخوڕ؟ بۆیە گەورەم داوات لێدەکەم فەرمان بدە لێرە بگوێزرێمەوە بۆ ئەرك و وەزیفەیەکی تر، نابمە سیخوڕ بۆ هیچ کەسێك، ئەگەر دەتەوێت تەنانەت لە سلکی سەربازیش دوورم بخەرەوە. دوای ئەوە سلاوێکی سەربازیم بۆ گرتەوە. تەنها ئەوەندەی وت: "کوڕم پیرۆزباییت لێدەکەم بۆ ئەم ئەخلاقە بەرزە". پێمگوت: سوپاس گەورەم.

وتی: "چەند حەزم دەکرد کوڕێکی وەك تۆم هەبایە". وتم: گەورەم ئێمە هەموومان کوڕی تۆین. بە گەرمی دەستی لە ملم کرد. بەڕاستی جەمیل ئەلمەدفەعی هەڵوێستی مرۆڤانەی زۆری لەگەڵ مندا هەبوو، کە دواتر دێمە سەریان.

## پوختەی بۆچوونم لەسەر مەلیك غازی

سەدان بیرەوەری خۆش و شیرینم هەیە لەسەر مەلیك غازی، چەندە مێشکی خۆم هەڵێنجێنم ناتوانم لەسەر باشە و چاکەی بنووسم، غازی لە خواردن و جلوبەرگدا، کەسێکی سادە بوو، لە مامەڵەکردندا زۆر بێفیز بوو، ڕاستگۆ بو لەگەڵ خۆی و خەڵکیدا، کەسێکی ڕق لە دڵ نەبوو، تا ئەوپەڕی ڕاشکاو بوو، لە هەر کوێ پێویستی کردبا بوێر بوو، عێراق و عێراقییەکانی زۆر خۆشدەویست، دوور بوو لە هەرچی دەمارگیرییەکی ڕەگەزی و

تایفەگەری، بەڵام وەكو باوكی ژیر و زیرەك نەبوو. لە یارییەكانی سیاسەت تێنەگەیشتبوو و هونەرەكانی نەدەزانی، ڕقی بۆ ئینگلیز سنووری نەبوو، بە پەیمانشكێن لێیانی دەڕوانی بە تایبەت ئەوەی لەگەڵ (ئەلحسێن)ی باپیریدا كردبوویان، زۆر هەستیار و بێ متمانە بوو لە بەرامبەر ئەو سیاسییانەی لەگەڵ باوكیدا هاتبوونە عێراق، جگە لە دووانیان نەبێت، كە موحەممەد ئەلسەدر و موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی بوون. زۆر حەزی لە قسەی خۆش و كرانەوە و گەڕان بوو. وەك خۆی دەیگوت خۆی بە (زیندانییەكی بەڕێز) دادەنا، بەڵام گومان لەوەدا نییە دوژمنانی زیادەڕەوییان كرد لە وێنەكێشانی لایەنە دیاریكراوەكانی ژیانی تایبەتییدا. ناحەقییان لە بەرامبەردا كرد و هەوڵیان دا چاكە و باشییەكانی، كە لەو كاتەوەی لە كۆلێژی سەربازی هاوڕێ بووین تیایدا بەدیم كردبوو لەكەدار بكەن.. هەمیشە ڕێز و خۆشەویستی ئەو پیاوە گەورەیە لە دڵمدا دەمێنێتەوە.

پاسەوانی تایبەتی مەلیك غازی/ لیوای خانەنشین فوئاد عارف.

## كۆتا سەرنجەكانم

لە سەردەمی مەلیك غازی بزووتنەوەیەكی چەكداری لە ناوچەی بارزان و بلێ ڕوویدا، كە بە بزووتنەوەی خەلیل خۆشەوی ناسرا، لە ساڵی ١٩٣٥ ملازمی دووەم بووم لە فەوجی سنووری ڕەواندوز و خەلیل خۆشەوی هێشتا ڕابەرایەتی هەندێك لە بارزانییە چەكدارەكانی دەكرد لە ناوچەكە. كە پاشماوەی بارزانییەكان بوون لە دوای دروستبوونی بزووتنەوەكەیان، لە ناوچەكانی بارزان و مێرگەسوور و ڕەواندوز و لە دژی حكومەتی عێراق دەجەنگان. پێشتر هێزێك پێكهێنرا بوو بە ناوی (هێزی شێربارز)، شێربارز وشەیەكی لێكدراو بوو لە (شێروان مەزن و بارزان). بریتیبوو لە فەوجی سنووری یەك لە بلێ و فەوجی سنووری سێ لە ڕەواندوز و فەوجی حەوتەم لە ئەربیلەوە هێنرا بوو بۆ مێرگەسوور. لەگەڵ ٢٤ مەفرەزەی پۆلیسی غەیرە نیزامیدا، واتە ئەو عەشایەرانەی لە بەرامبەر بەشداریكردنیان لەگەڵ هێزە نیزامییەكاندا پارەیان وەردەگرت و پێیان دەوترا (چەتە)، دانیشتووانی چەند گوندێكمان لە گوندێكدا كۆدەكردەوە و سەنگەرمان بەدەوریاندا دادەنا لەبەر هۆكاری ئاسایش و كۆنترۆڵكردنی ناوچەكە و بڕینی ئازوخە و تفاق لە خەلیل خۆشەوی و دارودەستەكەی. ئەم ئەفسەرانەم لەگەڵ بوون: ملازم ئامیق مستەفا فەرماندەی سریە و ملازم عەبدولوەهاب عەلی (موقەددەمی لیوا)و ملازم عەبدولكەریم فەیسەڵ. دوای ماوەیەك كرامە فەرماندەی حامییەی پیران، لەو ناوچەیە بە هەمان شێوە گوندنشینەكانمان بە یەكەوە كۆكردەوە. لە ڕاستیدا زۆر بەزەییم بەو خەڵكە ڕەش و ڕووتەدا دەهاتەوە. بۆیە ئەو ئازوخەیەی بۆ

من دانرا بوو وەك شەكەر و چا، هەر كە دەچووم سەردانیانم دەكرد، بەبێ ئەوەی لە مافی سەرباز و سوپا بخۆم (ببەم) بەسەریاندا دابەشم دەكرد.

بەهۆی هەڵوێستم لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە و هاوسۆزیم لەگەڵیان وەك كوردێك، زمانیان لێدابووم گوایە زەخیرەكانی وەك برنج و نیسك و نۆك دەگۆڕمەوە لەگەڵ ئەو سەوزانەی لەو ناوچانە دەچێنران لەسەر بنەمای سوودی دوو لایەنە، ئێمە پێویستمان بەو سەوزانە هەبوو، بەڵام ئەو كارە لەسەرمان نووسرا و بە سەرپێچی حیسابكرا. وێڕای ئەوە نەمهێشت یەك سەرباز دەستدرێژی بكاتە سەر خەڵكەكە، یان بچنە نێو ڕەز و باخەكانیان، داوام لە خەڵكەكە كرد دوكان و بازاڕەكانیان بكەنەوە بۆ ساغكردنەوەی كاڵاكانیان بە ئێمەی سەرباز، زۆر دڵخۆش بوون بەو پرۆژەیە و خۆشەویستییانم بەدەست هێنا. زۆر ئاسایی بوو چاو لە هەواڵدان و زمان لێدانم نەقوچێنرێت. دوای ماوەیەك فەرمانێكم پێگەیشت كە ڕەوانەی ئەنجومەنی عورفی كراوم لە ڕێگەی بروسكەیەكەوە دەیگوت: "حامییەكە ڕادەستی ملازم داوود نیعمە بكە و لەگەڵیا بگەڕێرەوە بۆ شێروان مەزن". بەڵام خوالێخۆشبوو ئەمین ڕەواندوزی كە پلەی نەقیب و فەرماندەی سریە بوو نامەیەكی بۆ ناردم دەڵێت ئاگات لە خۆت بێت، دەربارەی زەخیرە لەگەڵ یاخیبووان –وەك حكومەت دەیگوت– لێكۆڵینەوەت لەگەڵ دەكەن.

ملازم داوود نیعمە عەسرەكەی گەیشت و منیش خۆم ئامادەكرد بچم بۆ شێروان مەزن، كە شەو داهات پیاوێك بە ناوی عەبدوڵڵا كە یەكێك لە

سەرۆك هۆزەکانی شێروان بوو، هات بۆ لام و بە دەست ئاماژەی بۆ کردم، زانیم بۆ کارێکی زۆر گرنگ بانگم دەکات، کە لێی' نزیك بوومەوە وتی: "ئەحمەد بێدود و چەندین چەکدار لە جەماعەتی خەلیل خۆشەوی دەیانەوێت چاویان پێتبکەوێت" ئەحمەد بێدود سەنگ و قورسایی خۆی هەبوو لە نێو چەکدارانی بزووتنەوەی کورددا، واتە بزووتنەوەکەی خەلیل خۆشەوی، وتی: "لەسەر کانییەکەی نزیك گۆڕستانەکە چاوەڕێت دەکەن".

لە دڵی خۆمدا بیرمکردەوە: بڕۆم، نەڕۆم؟. ئەگەر بڕۆم هەر خودی سەربازەکانم بەسەرمەوە دەبن بە شاهید کە من پەیوەندیم بەو بزووتنەوەوە هەیە، ئەگەر نەڕۆم، ئەمە لە نەریتی کوردەواریدا شتێکی عەیب و شەرمهێنەرە. بە عەبدوڵڵا بەگم وت: لەگەڵم دێیت؟ وتی: نەخێر، ترسا لەوەی هاتنەکەی کێشەی بۆ دروستبکات. ئەمجا بیرم کردەوە هەندێك سەرباز لەگەڵ خۆمدا ببەم، هەروەها ترسام لەوەی سبەی ئەوانیش لەسەرم ببن بە شاهید. بۆیە دوابڕیاری خۆمدا کە بە تەنیا بڕۆم، دەمانچەکەم هەڵگرت و نزیکەی کیلۆمەترێك ڕۆیشتم، دەبینم ئەحمەد بێدود لەو تاریکییەدا چاوەڕێم دەکات، سڵاوم لێکرد و ویستم فێڵێکیان لەگەڵدا بکەم و پێمگوت: ئێوە سوپا گەمارۆی داون و دەورتان گیراوە. ئەحمەد وتی: "لەو کاتەوەی لە سەربازگە دەرچوویت تا گەیشتنت بۆ ئێرە دوو چەکداری ئێمە چاودێریت دەکەن بێئەوەی بە خۆت بزانیت. پێمگوت: بۆچی لە دووی منت ناردووە؟

– هاتووین خۆمان ڕادەست بکەین لەسەر دەستی تۆ و حکومەت، ماوەی ساڵێك دەبوو زۆر زەحمەت بوو یەك کەس توانیبای خۆی ڕادەست بکاتەوە، کۆمەڵێك چەکیشیان پێبوو، بیرم کردەوە ئەو شەوە دەبێت چی بکەم؟ داوام لێکردن چەکەکانیان هەڵگرن و هەڵیانگرت، ئەمجا عەبدوڵڵا بەگم بانگکرد پارەم دایە بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ بێنێت تا دەگەڕێمەوە بۆ حامییە بۆ لێکۆڵینەوە لە دۆخەکە. ئەگەر ڕەزامەندی درا لەسەر گەڕانەوەیان، ئەوا کەسێك دەنێرم بۆ ئاگادارکردنەوەیان و وشەی نهێنی نێوانمان وشەی (بەخێرهاتن) دەبێت، بەڵام ئەگەر وشە نهێنییەکە (هەر ماون لێرە) بێت مانای ئەوەیە ڕەزامەندی لەسەر هاتنەوەیان نەدراوە و یەکسەر هەڵبێن و ئەو ناوە بەجێبهێڵن، چونکە سوپا هێرشیان دەکاتە سەر و گەمارۆیان دەدات.

بروسکەیەکم نارد بۆ سەرکردایەتی شێربارز کە لیوا موحەممەد ئەمین زەکی پاشا بوو، بەڵام ئەنجومەنی عورفی بە سەرۆکایەتی عەقید ئیسماعیل حەقی ئاغا بوو، موقەددەم ڕوکن فەهمی سەعید موقەددەمی لیوای بارەگای هێزی شێربارز بوو، لە بروسکەکەدا ئاگاداری سەرکردایەتیم کردەوە ئەحمەد بیدۆد و کۆمەڵێك لە پیاوەکانی دەیانەوێت بە چەکەکانیانەوە لەسەر دەستی من و لەسەر شەرەفی حکومەت خۆیان ڕادەست بکەنەوە، ئەگەر ڕەزامەندی وەرگیرا تکایە ئاگادارم بکەنەوە، چەند مەرجێکم لە بروسکەکەدا دانابوو بەم شێوەیەی خوارەوە:

مەرجی لێبوردن لێیان چییە؟ لە حاڵەتی لێبوردنیان لە کوێ نیشتەجێ

دەکرێن؟ ئەگەر ڕەزامەندییان لەسەر وەرنەگیرا تکایە ئاگادارم بکەنەوە.
ئەگەر ڕەزامەندیتان لەسەر لێبوردنیان دا و دوای ئەوە بەڵێنەکەتان شکاند بە هەر هۆکارێك، من بە یەکێك لە پیاوانی خەلیل خۆشەوی دابنێن.
لە ڕاستیدا هەم ئەمین زەکی و هەم ئیسماعیل حەقی ئاغا و هەم فەهمی سەعید ئەفسەرانێکی ژیر و تێگەیشتوو و بە ویژدان بوون. دوای نیو کاتژمێر وەڵامی بروسکەکە هاتەوە، نوسرا بوو سوپاسی ئەو هەڵوێستە دەکەن، مادام ئەو پیاوانە دەیانەوێت لەسەر دەستی تۆ و لەسەر شەرەفی حکومەت خۆیان ڕادەست بکەنەوە، ئامادەین لە هەر شوێنێك خۆیان بیانەوێت نیشتەجێیان بکەین لەگەڵ مسۆگەرکردنی هەرچی پێداویستییەکانی ژیانیانە بەو مەرجەی یەکەمجار چەکەکانیان ڕادەست بکەن. یەکسەر ناردم بە شوێن عەبدوڵڵا بەگدا بچێت بۆ لای ئەحمەد ئاغا و پیاوەکانی و پێیان بڵێت بەخێرهاتن، دوای کەمتر لە یەك کاتژمێر ئەحمەد و پیاوەکانی گەیشتنە سەربازگە، داوود نیعمە و ئەو سەربازانەی لەگەڵی بوون سەریان سوڕما لە گەیشتنی ئەو (یاخیبووانە) بۆ سەربازگە، بە ملازم داوود کە هاتبوو من ببات بۆ شێراون و سەربازگەکەم لێوەرگرت، بەهۆی ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر من درابوون، بە گاڵتەوە پێمگوت: ئەو کوردانە هاتوون پاسەوانیم بکەن.

دوای نیو کاتژمێر بروسکەیەکی ترم پێگەیشت هاتنت بۆ شێروان هەڵوەشێنرایەوە، تکایە لە شوێنی خۆت بمێنەوە و لە ڕێگەی ئەو پیاوانەوە خۆیان ڕادەست کردووە پەیوەندی بکە بە هاوڕێکانیانەوە، بەڵکو ئەوانیش خۆیان ڕادەست بکەنەوە.

بە داوود نیعمەم وت: تۆ سبەینێ ڕەوانە دەکرێیت و من لەگەڵت دێم. سەری لە دۆخەکە سوڕمابوو، منیش باسی بابەتەکەم بۆ کرد. ئەوانەی خۆیانیان ڕادەست کردەوە، دامەزرێنران و خرانە سەر کار، بە دوایاندا ئەوانی تریش هاتنەوە و ناوچەکە دۆخێکی تا ڕادەیەك ئارامی بۆ دروستبوو.

لەگەڵ هاتنی پایزدا، هەستمان کرد بەرەی جەنگ تا دێت بچووك دەبێتەوە. هێزی شیرباز هەڵوەشێنرایەوە و یەکەکان گەڕێنرانەوە بۆ سەربازگەکانیان، بەڵام من لەگەڵ فەسیلەکەمدا لە مێرگەسوور مامەوە. یاریدەدەری پۆلیس حەمزە شاسوار کرایە فەرماندەی مەفرەزەکانی پۆلیس. بەڕێوەبەری ناحیەش ئەمین ئەفەندی خەڵکی کەرکوك بوو.

هەر کە زستان هات، بروسکەیەکمان گەیشتێ، ڕێنومایییەکانی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان پۆلیس و ئیدارەی ناوچەکەی تێدا بوو. ڕێنومایییەکان دەیانگووت: "ئەگەر دوو ئەفسەر لە ناوچەکەدا بوون یەکێکیان لە سوپا و ئەوی تریان لە پۆلیس بوو، بەرپرسی یەکەم لە سوپا دەبێت و دووەم دەبێتە یاریدەدەری ئیداریی ئەگەر پلەکەی لە پلەی ڕائید کەمتر بوو، بەڵام ئەگەر ئەفسەری پۆلیس پلەی لە ڕائید بەرەو سەرەوە بوو، ئەو دەبێتە بەرپرسی باڵا و ئەفسەری سوپا ئەگەر پلەی لەو کەمتر بوو دەبێتە یاریدەدەری سەربازیی. ئەگەر پلەی ئەفسەری سوپا نەقیب بەرەو سەرەوە بوو وەك فەرماندەی سەربازی یەکەم لە ناوچەکەدا دەمێنێتەوە.

من بووم بە بەرپرسی یەکەمی سەربازی و حەمزە شاسوار بوو بە

یاریدەدەری ئیداریم، بروسكەیەكمان لە پۆلیسی ناحیەی كانی ماسی وەرگرت، ئاگاداری كردینەوە خەلیل خۆشەوی و هەندێك لە پیاوەكانی، كاتێك ویستوویانە لە ڕووباری زێی گەورە بپەڕنەوە، داوایان لە شوانێك كردووە بەلەمێكیان بۆ پەیدا بكات بۆ ئەوەی پێی بپەڕنەوە، هەر كە شوانەكە ڕۆیشتووە بۆ پەیداكردنی بەلەم هەواڵی شوێنی خەلیل خۆشەویی بە پۆلیس ڕاگەیاندووە. لە كاتی هەوڵدانی بۆ پەڕینەوە لە ڕووباری زێ تەقەی لێكراوە و كوژراوە. من بەشداریم لەو ڕوداوەدا نەكرد، بروسكەیەكم بۆ هات پرسیاری كردبوو: "بەشداریت لە كوشتنی خەلیل خۆشەویدا كردووە"؟ بە نەخێر وەڵامم دایەوە، چونكە لە ڕاستیدا بەشداریم لەو ئۆپراسیۆنەدا نەكردبوو، بەڵام هەر كە بروسكەیەكی هاوشێوە بە حەمزە شاسوار گەیشت و پرسیاری بەشداریكردنی لە كوشتنی خەلیل خۆشەویدا لێكردبوو، بە "بەڵێ" وەڵامی دایەوە، بۆیە وەك پێزانینێك بۆ كارەكەی، پلەی بۆ ڕائید بەرزكرایەوە.

پێدەكەنی لەوەی من ڕاستگۆیانە وەڵامم داوەتەوە، ئەوەی ڕاست بێت حەمزە شاسوار بەشداری كوشتنی خەلیل خۆشەوی نەكردبوو، بەڵام تەنها بۆ ئەوەی پلەیەك و ڕێزلێنانێك وەرگرێت، بەو جۆرە وەڵامی دایەوە و ئەوەی ویستی دەستیكەوت.

جارێكیان بیستم گوێرەكەیەكیان لە گوندی بیدۆد سەربڕیوە، چووین بۆ گوندەكە، بەڵام كە گەیشتینە گوندەكە چۆڵ و كەسی تێدا نەبوو. لەسەر كانییەكە دانیشتین و بە یەكێك لە سەربازەكانم وت: ترێمان بۆ بچنە،

ترێكەمان خستە ناو كانییەكە مانگە شەوی چواردە بوو، ڕاستی ڕێگەپێدراو نەبووین بە شەو مەفرەزە دەربكەین، ترێكەمان خوارد و گەڕاینەوە بۆ گوندی پیران، دوای ئەوە ئەحمەد بێدود خۆی ڕادەست كرد، بۆی باس كردم ئەو شەوە بە تەواوی ئێوە گەمارۆ درابوون، بەڵام ئەحمەد نەیهێشتبوو تەقەمان لێبكەن، ئەگەر ئەحمەد بێدود بیویستایە بە ئاسانی ئەو شەوە هەموومانی دەكوشت.

پێم وایە ڕەفتارەكانم لە ناوچەكەدا و ڕێگە نەدانم بە سەربازەكانم خراپە لەگەڵ خەڵكەكە بكەن، وایكرد خۆشیان بوێم و ڕێزم بگرن، ئەگەر كەسێكی تر جگە لە من لەو شەوەدا بچووایەتە سەر ئەو كانییە دەیانكوشت.

بیرمە ئەو كاتە عومەر عەلی ملازمی یەكەم بوو، لە یەك فەوجدا بوین، ئەو لە من كۆنتر بوو، كاتێك ویستی بچێت بەرەو (خێرەزوك) دەیویست من لە ناوچەی پیران دابنێت، ئەو فەرماندەی من بوو، بە پشت بەستن بە ولاخ لە گواستنەوەكانماندا گەیشتینە چیای پیران. چوار قاتر كە باریان بەتانییە تایبەتەكان بە عومەر عەلی بوو، ونبوون. بێگومان لە پشتی ئەو ونبوونەوە بەرپرسیارەتییەكی گەورە هەبوو. تكای لێكردم لەوێدا بمێنمەوە، بۆ ئەوەی حەزیرەیەك لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ گەڕان بە شوێن قاترەكاندا، عەلی عومەر ڕۆیشت و زۆر درەنگ كەوت و گەڕانەوەی درێژەی كێشا، كۆنترین عەریفم بانگ كرد و پێمگوت دڵگرانم لە نەگەڕانەوەی عومەر عەلی، بەرپرسیارێتی فەسیلەكەم پێسپارد و بڕیارم دا بڕۆم بە دوای

عومەر عەلی و هاوڕێکانیدا، ڕاستی من ئەفسەرێکی لەخۆبایی بووم. بە تەنیا ڕۆیشتم و ڕێگەیەکی سەختم گرتەبەر، تەنها دەمانچەیەکم پێبوو. نەوەستام تا عومەر عەلیم دیتەوە، دوای ئەوەش قاترەکانمان دیتەوە. داوای لێکردم بگەڕێمەوە بۆ پیران تا ئەو کاتەی قاترەکان دەهێنێتەوە. لە ڕاستیدا شەرمم کرد داوای لێبکەم، دووان لە سەربازەکانم لەگەڵدا بنێرێتەوە، چونکە چوار سەربازی لەگەڵ بوو. هەستمکرد ڕێگەکە سەلامەت نییە و چەکدارانێك بەردم تێدەگرن و چاویان لەسەرمە، بەڵام من بە دەمانچەکەم تەقەم لێکردن و ئەوانیش بە تەقە وەڵامیان دامەوە، ئەگەر مەبەستیان بووایە دەیانکوشتم، چونکە بە تەنیا بووم.

کە گەیشتمەوە فەسیل، بەڕێکەوتین بەرەو پیران، دوای گەیشتنمان عومەر عەلی پرسیاری کرد لەوەی دەنگی تەقەی بیستووە، باسم بۆ کرد لە ڕێگە چی ڕوویداوە. عومەر عەلی بۆ بینینی خولێکی تایبەت نێردرا بۆ هیند و ملازمی یەکەم کەریم فەیسەل هاتە شوێنی لە (خێرەزوك)و من بە فەرماندەی ڕەبیەی پیران مامەوە. سەربازگەیەکی تورکی لەسەر سنووری عێراق – تورکیا لە بەرامبەرمان بوو، فەرماندەی سەربازگەکە ناوی موزەفەر بەگ بوو، موزەفەر بەگ نامەیەکی بۆ ناردین کە حەز دەکەن سەردانمان بکەن. دڵخۆشبووین بە هاتنیان، چونکە ئێمە لە باری خۆراکەوە بارودۆخمان زۆر باشبوو، خواردنی وشکەمان زۆر بوو، من بۆ خۆم زۆرم حەز لە شیکپۆشی بوو، بۆیە داوام لە هەرچی سەربازانی فەسیلەکەم کرد، جوانترین جلوبەرگ و جلوبەرگی پشکنین بپۆشن، داوام لە (جۆرج زیا عکام) بەڵێندەری حانوت کرد و لە گیرفانی خۆم پارەم

پێدا خواردنەوە و خواردنی لە قوتووکراومان بۆ بێنێت، بیرمە ریکۆردەرێك و کاسێتێکی زۆرمان هەبوو. هەرکە موزەفەر بەگ لەگەڵ سەربازەکانیدا گەیشتن زۆر بە گەرمی پێشوازیمان لێکردن. ئێوارەکەی سەربازەکانی گەڕانەوە و تەنها چوار سەرباز لەگەڵیدا مانەوە. شەو لای ئێمە مانەوە و تا درەنگانێکی شەو قسە و باسی ئاساییمان کرد، پرسیاری نرخی ریکۆردەرەکەی کرد دیار بوو زۆر پێی سەرسامە و بە نیشانەی دەوڵەمەندیی دادەنا. ئەمجا باسی دۆخی خراپی خۆیانی کرد، دیاربوو لە دۆخێکی خراپدا بوون و جلوبەرگەکانیان وەك پێویست نەبوون و قەد و قیافەتیان ڕێکوپێك نەبوو.

دەرکەوت موزەفەر بەگ لە هاوڕێیانی فەریق ساڵەح ئەلجبورییە و خوێندنی سەربازی عوسمانییان پێکەوە تەواوکردووە. دوای ماوەیەك کاتێك ئێمە چووین بۆ سەردانی سەربازگەکەیان زانیم چەندە لە دۆخێکی سادەدان، خواردنیش تەنها هەنگوین و کەرێیان پێشکەش کردین، ئەویش لە خەڵکی کوردی گوندنشینەکانی نزیك سەربازگەکە هێنابوویان. کە باسی خەلیل خۆشەوی دێتە پێشەوە، ڕوداوێکی پێکەنیناوی باس دەکەم، لە پیران هەواڵێکمان گەیشتێ دەستەکەی خەلیل خۆشەوی لە شوێنێکدا کۆبوونەتەوە، وێڕای مەترسی زۆر بەیانییەکی زوو حەزیرەك سەربازمان برد و چووین بۆ سەر لوتکەی چیای پیران.

هەر کە تۆزێك سەرکەوتین دراینە بەر بەرد، وامانزانی گرووپەکەی خەلیل خۆشەوی بەردمان تێدەگرن، بەردەکان زۆر زل و گەورە بوون،

بەڵام هەرزوو زانیمان کۆمەڵێك ورچ لە سەرەوەن و بەردمان بۆ گلۆر دەکەنەوە. ڕووی تفەنگەکانمان تێکردن، بیرمە ورچێك بەرەوڕووم هات و هێرشی بۆ هێنام، ئەگەر یەکێك لە سەربازەکان لە دواوە تەقەی لێنەکردایە لە دەستی ڕزگار نەدەبووم. دوای کوشتنی لاشەکەیمان هێنایەوە بۆ سەربازگە و گرومان و پێستەکەیمان پڕ لە خوێ و کا کرد، واتە مۆمیامان کرد و لە دەروازەی سەربازگەکەدا دامانناَ، سەگەکان لێی دەترسان، کاتێك موحەممەد ئەمین زەکی سەردانی کردین حەزی لێکرد و منیش بە دیاری پێشکەشمکرد.

ئەوەی پەیوەندی بەو ماوەیەوە هەبێت، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان حەزم لە سیاسەت نەبووە و نەچوومە نێو هیچ پارتێکەوە، کە لە ساڵانی سییەکاندا پارتی هیوا دامەزرا، ماوەیەکی کەم چوومە نێو پارتی هیواوە و هەرزوو وازم هێنا، ئەوە یەکەم و کۆتا ئینتیمای حزبی بوو لە ژیانمدا. لە پێش و لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا، تورکیا و عێراق و ئێران، چالاکی سیاسیی کوردییان بە خۆیانەوە بینی، هەندێك لە چالاکییەکان مۆرکی چەکدارییی وەرگرت، وێڕای سەرهەڵدانی تەکەتولاتی سیاسیی کوردی بە مۆرکێکی ناسیۆنالیستی، خەباتیان دەکرد بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی گەلی کورد. لەو کوتلە سیاسییانە (کۆمەڵەی برایەتی، ١٩٣٨) بوو، کە وەك ڕێکخراوێکی سیاسیی بە سەرۆکایەتی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمودی حەفید کاری دەکرد، ڕێکخراوەکە ئامانجە نەتەوایەتییەکانی کوردی ڕاشکاوانە دیاری کردبوو.

ساڵی ١٩٣٩ چالاکی ڕۆژنامەوانیی و ڕۆشنبیری کوردی دەرکەوتن، کە زیاتر مۆرکێکی نەتەوایەتی لەخۆگرتبوو، چەندین ڕۆشنبیری کورد لە دەوری گۆڤاری گەلاوێژ کۆبوونەوە کە تەژی بوون بە گیانی نەتەوایەتی پێشکەوتوو. پێم وایە چالاکییەکانی گۆڤاری گەلاوێژ وایکرد ژمارەیەك لە ئەفسەران و ڕۆشنبیرانی کورد پارتێکی نهێنی بەناوی پارتی هیواوە دابمەزرێنن. ئەوەی ڕاست بێت سەرەتای پارتی هیوا سەرەتایەکی لاواز بوو، بەڵام لەلایەنە نەتەوایەتی و پێشکەوتووەکەیدا بوێر بوو، بۆیە هەرزوو پەرەی سەند و پێگەیەکی جەماوەری بەرفراوانی لە کوردستاندا بۆ دروستبوو، ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی سوپا بە ئەفسەر و سەربازەوە هاتنە ڕیزەکانییەوە، لەگەڵ خاوەن پیشە جیاوازەکان لە پزیشکان و ئەندازیاران و مامۆستایان و سەرۆك هۆزەکان ڕووبەری چالاکییەکانی بەرفراوان بوو، گۆرەپانی عێراقی تێپەڕاند بۆ ئێران و تورکیا و سوریا و پەیوەندی لەگەڵ قەوارە سیاسییە کوردییەکانی ئەو وڵاتانەشدا بەست، بە مەبەستی هەماهەنگی کاری سیاسی. ڕەفیق حیلمی بوو بە سەرۆکی پارتەکە وێڕای بەرگریکردن لە گەلی کورد و ئامانجە نەتەوایەتییەکانی، ئامانجی دوژمنایەتیکردنی ویستی شۆڤێنی نازی بوو. ئەو پێشکەوتن و چالاکییانەی حزب بە دڵی داگیرکەری ئەو سەردەمە نەبوو، کە دەسەڵاتی عێراقی دەکرد، بۆیە هەستا بە دروستکردنی ناکۆکی لە نێوان ئەندامە چەپ و ڕاستەکانی پارتەکەدا. تا ڕادەیەك ناکۆکی نێوان ئەندامان و سەرکردایەتی پارتەکە بە ئاشکرا دەبینرا و لە شاردنەوەدا نەمابوو. بەو جۆرە داڕووخان لە نێوخۆدا دەستیپێکرد، ڕەنگدانەوەی لەسەر ئەو

کۆنفراسە هەبوو  کە لە مانگی شوباتی ١٩٤٤ لە کەرکوك بەسترا. بەهەرحاڵ حەز ناکەم درێژە بەم بابەتە بدەم، بەڵام حەزمکرد تەنها بیرۆکەیەك لەسەر ئەو بارودۆخەی بەر لە کاتی دروستبوونی پارتێك بدەم کە لەو کاتەدا تیایدا ئەندام بووم.

من لە ڕێگەی ئەفسەری شەهید عیززەت عەبدولعەزیزەوە چوومە ریزەکانی پارتی هیواوە، لەو کاتەدا کۆمەڵێك ئەفسەری هاوڕێی کوردم، چووبوونە نێو پارتی هیواوە، لەوانە میرحاج و مستەفا خۆشناو و ڕەشید جەودەت، لە کەسانی غەیرە سەربازیش کاکە حسەین خانەقا و کاکە حەمەی خانەقای برای و چەندینی تریش.

## شۆڕشی مایسی ١٩٤١

شۆڕشی مایس لە ڕووی مەبدەئەوە بزووتنەوەیەكی بوێری دژ بە سیاسەتی داگیركاری و دەستتێوەردانی بەریتانی بوو لە كاروباری عێراق، كە چیتر جێگەی قبوولكردن نەبوو. هەروەها هەوڵێك بوو بۆ پاككردنەوەی عێراق لە كلكی داگیركەران، ئەوانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوەبوو، هێندە وەلائیان بۆ باڵوێزخانەی بەریتانیا هەبوو، نیو هێندە وەلائیان بۆ دەوڵەت و نیشتمانی خۆیان عێراق نەبوو. بۆیە دەبینین تەواوی گەل بە عەرەب و كوردەوە لەگەڵ شۆڕشەكەدا بوون، ئامادەبوون بە ماڵ و گیان قوربانیی لە پێناودا بدەن. لە ڕاستیدا شۆڕشی مایس لووتكەی ئاڵنگاریی بوو بۆ یەكێك لە زلهێزترین وڵاتانی دونیا، كە بەریتانیا بوو. بەهۆی دەستتێوەردانە سەربازیی و شارستانییەكانییانەوە لە كاروباری عێراق، (وەسی) لە دۆخێكدا بوو پیاو بەزەیی پێدا دەهاتەوە. هەر كە شۆڕش بەرپا بوو، هەڵهات بۆ دیوانیە، ئەمجا گەڕایەوە بۆ بەغداد، جارێكی تر هەڵهاتەوە بۆ حەبانیە، ئەمجا هەڵهات بۆ بەسرە و لەوێوەوە بۆ دەرەوەی عێراق. دوای ئەوە بە پشتیوانی هێزەكانی بەریتانیا گەڕایەوە بۆ عێراق و باڵوێزخانەی بەریتانیا بوو بە پەناگەی بەكرێگیراوان. ژمارەیەك لە هاونیشتمانیانی بەریتانیا و ئەو خەڵكە عێراقییانەی لە سزا دەترسان، خۆیان لە باڵوێزخانەی بەریتانیا حەشار دا و هەندێكیش چوونە كۆمیسیۆنی ئەمریكی و دوای ئەوە ژن و منداڵی بەریتانییەكان گواسترانەوە بۆ حەبانیە و لەوێوە بۆ بەسرە و لەوێوە بۆ دەرەوەی

عێراق. هەندێك کەسایەتی عێراقی نمونەی نووری ئەلسەعید و داوود ئەلحەیدەری هەڵهاتن بۆ فەلەستین، چونکە عەبدولئیلاه و دارودەستەکەی هەڵهاتبوون بۆ ئەوێ. ئەو کات ئێمە لە سەربازگەی شوعەیبە بووین، خەڵکی لە بێسەروبەریدا دەژیان و ئیدارە زۆر لاواز بوو، بوێر نەبوو لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی شۆڕش، هێندەی نەخایاند بەسرە بێ پارێزگار کەوت، فەرماندەی حامییە عەقید ڕەشید جەودەت، پارێزگار ساڵەح جەبری گرت و بە قۆڵبەستراوی ڕەوانەی بەغدادی کرد، دەستەیەك لە پیاوماقوڵانی شار هەستان بە بەڕێوەبردنی شار و توانییان تاڕادەیەك ئارامی بۆ بگەڕێننەوە.

کاتێك شۆڕشی ڕەشید عالی ئەلگەیلانی بەرپا بوو، یاریدەدەری فەرماندەی فەوج بووم لە لیوای دوو لە سەربازگەی موسەییەب. فەوجەکەمان لەگەڵ لیواکەماندا بەڕێکەوتن بۆ بەسرە و لە شوعەیبە جێگیر بووین. عەقید ڕەشید جەودەت، فەرماندەی حامییەی بەسرە بوو، دوای دابەزینی سوپای بەریتانیا لە بەسرە، بۆ ئەوەی ورەیان نەڕوخێت، داوایکرد سوپا بگەڕێتەوە و لە بەسرە نەمێنێتەوە، ئاسان نەبوو ببینین هێزەکانی بەریتانیا لە بەرامبەر سوپای عێراق ڕاوەستاون، بۆیە گەڕاینەوە بۆ موسەییەب.

بەهەرحاڵ وەك هێزێکی یەدەك، لە نێو باخەکانی موسەییەبدا جێگیربووین، بیرمە ڕۆژێکیان دوو فڕۆکە بەسەرماندا هاتن، یەکێکیان زۆر نزم بوو بە تفەنگ تەقەمان لێکرد و خستمانە خوارەوە، بەڵام لێی نزیك

نەبووینەوە، هەرچی چەك و تەقەمەنییەکی تێدا بوو تەقینەوە. فڕۆکەکە لە جۆری (ولنکتن) بوو. دەبینم ژنێکی خەڵکی ئەو ناوە گاز لە پەنجەی فڕۆکەوانەکە دەگرێت، کە جەستەیەکی بێ گیان بوو، ئەنگوستیلەکەی لە پەنجە دەردەهێنێت. هەروەها نامەیەکمان لە گیرفانی یەکێك لە ئەفسەرانی فڕۆکەکە، کە پشتی سووتا بوو، دەرهێنا بۆ ژنەکەی نوسیبوو: "بەمزوانە مۆڵەت وەردەگرم و دەگەڕێمەوە"!

دوای ڕوداوەکانی مایسی ١٩٤١ بڕیار درا لیوای دوو کە منی لێبووم لە موسەییەبەوە بگوازرێتەوە بۆ سەربازگەی ئەلرەشید و عەقید جەمیل فەتاح فەرماندەی لیوا بوو، دوای ماوەیەکی کەم جموجوڵێك لە کوردستان بە ڕابەرایەتی شێخ مەحمودی حەفید دەستیپێکرد، بڕیار درا لیواکەمان بچێت بۆ سلێمانی، بەر لە جووڵانی فەوجەکەمان لە موسەییەب، یەکێك لە سرییەکانی لیوا، کە لە سەددەی هیندیە جێگیر بووبوون یاخیبوون، فەرماندەی لیوا عەقید جەمیل فەتاح فەرمانی پێکردم بڕۆم بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەم و سرییە یاخیبووەکە بگەڕێنمەوە بۆ فەوجەکە.

ئۆتۆمبێلێك گەیاندمییە سەددەی هیندیە و سرییەکە هەرکەس بۆ خۆی بوو سەربازەکان هەرکەس بۆ خۆی تەقەیان دەکرد، فەرماندەی سرییە وازی لێهێنابوون و هەڵهاتبوو بۆ سەربازگەی لیوا، ناوی ملازم (ئەدوار عبدولئەحەد) بوو، دەبینم ئەسپەکەی هەر لەوێیە، یەکسەر سواری ئەسپەکەی بووم و پڕ بە دەمم هاوارمکرد، هەمووان بێدەنگ بوون، فەرمانم دا: سرییە بە دوو ڕیز لە بەردەمم کۆببنەوە. هەموو کۆبوونەوە،

ئەمجا فەرمانم پێکردن: وریابن، چەك لەسەر شان، بۆ لای ڕاست وەرگەڕێن، بەڕێکەون بەرەو سەربازگە. هەموویانم هێنایەوە و وەك ئەوەی هیچ لە سەربازگەدا ڕووینەدابێت. دوای ئەوەی لیواکەمان گواسترایەوە بۆ بەغداد، منیش گواسترامەوە بۆ فەرماندەی سرییەی ئینزیباتی فیرقەی سێ لە سەربازگەی ئەلڕەشید و زیندانی سەربازی کەوتە ژێر فەرمانی من، ئەوانەی گیرابوون بە کەلەپچە هێنران بۆ زیندان، مامەڵەیەکی جوانم لەگەڵ کردن و لە دادگای سەربازی پشتیانم گرت، بەو پێیەی تەنها شاهید بووم لەسەر ئەو بابەتە. ئەمەش وایکرد سزاکەیان کەمبکرێتەوە بۆ سزایەکی ئینزیباتی ئاسایی، لە جیاتی ئەوەی بە یاخیبوویان دابنێن.

لە ڕاستیدا ڕێژەی هەڵهاتن لە فەوجەکاندا بەرز بوو، وەك نارەزاییەك لە بەرامبەر ئاشتبوونەوە و ڕاگرتنی شەڕ و شکستهێنانی بزووتنەوەی مایس و هەڵهاتنی سەرکردەکانی بۆ ئێران. بەهەرحاڵ بڕیار درا لیواکەمان بگوێزرێتەوە بۆ سلێمانی، بەر لەوەی بەڕێبکەوین بۆ سلێمانی، نەزیف ئەلشاوی وەزیری بەرگری سەردانی سەربازگەی ئەلڕەشیدی کرد. دوای ئەوە لیوا ڕوکن موحەممەد ئەمین ئەلعومەری سەرۆك ئەرکانی سوپا، ئاگاداری کردم لەگەڵ فەوجەکەمدا نەچم بۆ سلێمانی، بەڵکو دەبێت سەردانی بەڕێوەبەری ئیدارە بکەم لە وەزارەتی بەرگری بۆ وەرگرتنی فەرمانی گواستنەوەم بۆ شوێنێکی تر، داوای لە فەرماندەی فەوج کرد کەسێکی تر لە شوێنم دابنێت.

ڕۆژی دواتر چوومە بارەگای سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا و فەرمانی

دامەزراندنم بە فەرماندەی سرییەی ئینزیباتی فیرقەی سێ – وەك باسمکرد– وەرگرت. لەوێدا مامەوە و لەگەڵ لیوای دوودا نەچووم بۆ سلێمانی. زیندانی سەربازی لە سەربازگەی ئەلڕەشید سەر بە ئینزیباتی فیرقەی سێ و لە چوارچێوەی دەسەڵاتی مندا بوو، بەڵام لە ڕاستیدا ملازمی یەکەم یوسف ئەلنەقیب بەڕێوەبەری زیندانی سەربازی بوو لە سەربازگەی ئەلڕەشید. ژمارەی ئەو ئەفسەرانەی بەشداری جووڵانەوەی مایسی ١٩٤١یان کردبوو، زۆر بوون و زۆربەشیان پلەیان باڵا بوو، بە کەلەپچەکراوی هێنران لە یەکەکانی لیوا لە سەربازگەی ئەلڕەشید زیندانی کران. زیندانێك تایبەت بە – ضباط الصف – هەبوو لە چوارچێوەی زیندانی سەربازی کە ڕاستەوخۆ پەیوەست بوو بە فەرمانگەکەی منەوە. زۆربەی ئەفسەرەکان لە سوپادا فەرماندەم بوون و بەشێکیشیان هاوڕێم بوون. بۆیە ئاسایی بوو وێڕای ڕێنوماییەکان لەسەریان لەگەڵیاندا توند نەبم. هەستمدەکرد ئەو ئەفسەرانە دەبێت ڕێزیان لێبگیردرێت. لەبەر ئەوەی پێش هەموو شتێك دژی داگیرکەر بوون، بۆیە لە ناخی دڵەوە هاوسۆز بووم لەگەڵیان و بەردەستم بۆ دانان و پاسەوانیم لەسەریان سووك کردەوە وەك ئەوەی لە هوتێلێکدا میوان بن.

جارێکیان دادگای سەربازی بۆ دادگایی کردنیان، داوای دووان لەو ئەفسەرانەی کرد، کە هەریەك لە نەقیبی ڕوکن عامر حەسەك و نەقیب حەمود بەرجەس ئەلسەعدون بوون، خۆم بردمن بۆ دادگا، بەڵام دادگا دادگاییەکەیانی دواخست، لە گەڕانەوەدا کات هێشتا بەیانی بوو، وتیان: "پێویستمان بە خۆشوشتنە" وتم: بڕۆن بۆ ماڵەوە خۆتان بشۆن و نانی

نیوەڕۆ بخۆن و پشوویەك بدەن و ئەوجا بێنەوە، لە چێشتخانەی غەزال لە ناوچەی (رأس القريه)ی شەقامی ئەلسەعدون چاوەڕێتان دەکەم! سەرەتا وایانزانی سوعبەتیان لەگەڵ دەکەم، وتیان: "چۆن ڕێگەمان دەدەیت بڕۆین و ئێمە تۆمەتبارین بە تۆمەتێك سزاکەی لەسێدارەدانە، ئەگەر هەڵهاتین و نەگەڕاینەوە چی"؟! وتم: من بەناوی هاوڕێیەتییەوە ڕێگەتان دەدەم بڕۆن، ئەگەر ئێوەش هێندە لاواز بن لە ڕێزگرتن لە بەهاکان، ئەوا دەتوانن نەگەڕێنەوە.

ڕۆیشتن، بەڵام لە کات و ساتی خۆیدا لەو شوێنەی دیاریمان کردبوو، کە کاتژمێر حەوتی ئێوارە بوو ئامادەبوون. لە کاتێکدا پەتی سێدارە لە گەردنیانەوە زۆر دوور نەبوو.

بیرمە ڕائید ڕوکن موحەممەد حەسەن ئەلتورەیحی بەهۆی ئاسانکارییەك کە بۆی کرابوو، لە زیندان هەڵهات. لیژنەی لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکاری هەڵهاتنەکەی پێکهێنرا، دوای هەڵهاتنی تورەیحی ناچار بووین چاودێری لەسەر بەندکراوەکان توند بکەینەوە. ڕەنگە بپرسن ئەگەر پێشتر ناسیاویم هەبوبێت لەگەڵ ئەو چوار ئەفسەرەی لە سەردەمی عەبدولئیلاه لە سێدارە دران، ئەوانیش سەلاحەدین سەباغ و فەهمی سەعید و مەحموود سەلمان و کامل شبیب بوون. لە ڕاستیدا کامل شبیب هاوڕێی ماجید مستەفای خاڵم بوو. لەو کاتەوە دەمناسی کە یاریدەدەری فەرماندەی کۆلێژی سەربازی بوو و منیش قوتابی بووم تیایدا، کە بوومە ئەفسەر و کارم لەگەڵ کرد، زۆری خۆشدەویستم و هەستم بە خۆشەویستیی دەکرد.

## لەگەڵ عەقید فەهمی سەعید

پەیوەندیم لەگەڵ عەقید فەهمی زۆر تایبەت بوو، سنووری سەردەستە و ژێردەستەی تێپەڕاند بوو، لەبەر چەند هۆیەك، وێڕای سادەیی و بێ فیزیی. یەکەمجار لە ماوەی جووڵانەوەکانی خەلیل خۆشەویدا ناسیم کە لە بەشی پێشوودا هەندێکیم باسکرد. ئەو کاتە خوالێخۆشبوو فەهمی سەعید موقەددەم ڕوکنی لیوا بوو لە هێزی شیربارز، منیش وەك فەرماندەی فەسیل لە فەوجی سێ کارم دەکرد. کە گەیشتینە شێروان، سرییەکەی ئێمە لە دەوروبەری سەرای و بارەگای هێزی شیربارزیش لە نێو سەرای جێگیربووین، شەوێکیان لە هەر چوار لاوە سەرای درایە بەر دەستڕێژی گوللە، خێرا جلی سەربازیم لەبەرکرد و ڕەشاشە لویسەکەم هەڵگرت و چوومە سەربانی سەرای، بۆ ئەوەی شوێنی تەقەکان دیاری بکەم. دەبینم موقەددەم فەهمی سەعید بە تەنیا لەوێیە، پرسی: تۆ کێیت؟ وتم: فوئادم. وتی: دەزانیت تفەنگی فیکەرز بەکاربهێنیت؟ کە چەند دانەیەکی لە سووچەکانی سەربان جێگیر کرابوون و ئەو دەیزانی تەقەیان پێبکات. وتم: نەخێر گەورەم، من دەتوانم تفەنگی لویس بەکاربهێنم و تفەنگێکیشم پێیە. وتی: "تەقە لە شوێنی بریسکەکان بکە و منیش بە فیکەرز تەقە دەکەم".

کاتێك هەردووکمان بە تەنها لە سەرەوە لە بەرگریدا بووین، فەرماندەی هێزی شیربارز عەمید ئەحمەد ڕوشدی پاشا هاتە سەرەوە و کاتێك ئەو هەڵوێستەی ئێمەی بینی زۆر دڵخۆشبوو.

ئەو ڕوداوە سەرەتای پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لە نێوان من و فەهمیدا دروستکرد. بەردەوام لە خێوەتەکەمدا سەردانی دەکردم و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ گەڕان، بێئەوەی گوێ بداتە جیاوازی پلەی نێوانمان. لە قسەکردن لەگەڵمدا خۆی زۆر سادە دەکردەوە، بە تایبەت دوای ئەوەی زانی ماجید مستەفا خاڵمە و خەڵکی سلێمانیم. دواتر زانیم بە خزمایەتیش بە یەك دەگەین، بە درێژی باسی پەیوەندی نێوان خۆی و ماجید مستەفای بۆ کردم و بۆچوونی چییە لەسەری، بە تایبەت لە ئەستەنبوڵ پێکەوە خوێندبوویان، فەهمی سەعید بە مانای تەواو سەرباز و مرۆڤ بوو، زۆر دڵگرانبووم بۆ ئەو چارەنووسەی پێی گەیشت، من و ماجید مستەفای خاڵم دوای مردنیشی، پەیوەندیمان لەگەڵ منداڵەکانی هەر بەردەوام بوو.

## شازادە زەید دەستوەردان دەکات لە کۆتاییهێنانی قەزییەیەك لە بەرژەوەندی من

لە ساڵی ١٩٤٤ هێشتا پلەم نەقیب بوو، ڕۆیشتم پەیوەندی بکەم بە ئەرکە تازەکەمەوە لە کەرکوك کە جێگری فەرماندەی فەوجی پاسەوانی فیرقەی دوو بوو. لە کاتی ڕۆیشتنمدا هەندێك لە هاوڕێیان هاتن بۆ وێستگەی شەمەندەفەر بۆ بەڕێکرنم. لە نێوان ئەوانەی هاتبوون خوالێخۆشبوو شەوکەت عەقراوی بوو، کە ئەو کاتە وەك ژمێریار لە کۆمپانیای چنینی ئەهلی کاری دەکرد، ماجید مستەفای خاڵم ئەو کات نەشتەرگەری بۆ کرابوو لە دەرەوەی عێراق و لە نەخۆشخانە خەوێنرا بوو. دەموچاوی شەوکەتم زۆر تووڕە و بێزار هاتە پێشچاو، پرسیارم کرد،

چیتە؟ وتی: "دوێنێ لەماڵی نەشئەت سەنەوی بووم و ئەرشەد ئەلعومەری کە ئەو کات وەزیری دەرەوە و وەزیری بەرگری بوو بە وەکالەت هات بۆ ماڵیان و قسەی زۆری بە خاڵت وت".

لە نێو شەمەندەفەرەکەدا هەر بیرم لە قسەکەی دەکردەوە، تا دەهات زیاتر تووڕە دەبووم، چونکە خاڵم زۆر خۆشدەویست و لە جێگەی باوکمم دانابوو، ئەمجا نەخۆش و دوور لەوڵات و کەسوکار بوو، کەس نەبوو بەرگری لێبکات، لە نێو شەمەندەفەرەکە کاغەز و پێنوسم دەرهێنا و نامەیەکم بۆ ئەرشەد ئەلعومەری نووسی، تیایدا نووسیم: من نزیکترین کەسم لە ماجید مستەفاوە، ئەو ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە، بیستوومە قسەت پێگوتووە، بۆیە من لە جیاتی ئەو وەڵامت دەدەمەوە. نامەیەکی زۆر توندم بۆ نووسی، کە ناشێت ئەفسەرێکی بچووک بۆ وەزیری بەرگرییەکەی بینووسێت، سبەینێ کە گەیشتمە کەرکوک چووم بۆ فەرمانگەی پۆستە و نامەکەم بۆ پۆستکرد. ئەو وەزیری بەرگری بوو بە وەکالەت و منیش ئەفسەرێك بە پلەی نەقیب، ناو و ناونیشانی تەواوی خۆمم لەسەر نامەکە نووسی. دوای ئەوە چووم پەیوەندیم بەو فەوجەوە کرد کە تازە پێکهێنرا بوو.

دوای سێ ڕۆژ پاسەوانی فەرماندەی فیرقە، لیوا عەبباس فەزڵی هات بۆ لام و وتی: "فەرماندەی فیرقە داوات دەکات". چووم، هەر کە بینیمی وتی "چیت کردووە؟".

وتم: سەرقاڵم بە پێکهێنانی فەوجەکەوە. وتی: "فەوجی چی؟! تۆ

نامەت بۆ جەنابی وەزیر نوسیووە؟". وتم: بەڵێ. ڕاستی مەسەلەکەم تێگەیاندووە. فەرماندە هەر لەوێدا پەیوەندیکرد بە جێگری ئەرکانی سوپا فەریق ئیسماعیل سەفوەت و پێیگوت: دان بەوەدا دەنێت کە ئەو نامەکەی نووسیوە. ئەمجا فەرمانی پێکردم هەر ئێستا سەردانی وەزارەت بکەم، زانیم دۆخەکە تێکچووە و لەبار نییە بۆ من، بەڵام دەبێت چی بکەم؟ چووم بۆ بەغداد و گەیشتمە ئەو شەقامەی لا دەداتەوە بۆ وەزارەتی بەرگری، بەر لەوەی بگەمە دەرگای سەرەکی وەزارەت، ئۆتۆمبێلێك لە تەنیشتم وەستا، کەسێك بانگی لێکردم: "فوئاد وەرە سواربە!". دەبینم شازادە زەیدە، لەگەڵیدا سواربووم دەڕۆیشتەوە بەرەو کۆشك، بە درێژی باسی کێشەکەم بۆ کرد، بۆیە شازادە زەید بە تەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ ئەرشەد ئەلعومەری گرت و پێیگوت: "فوئاد لای منە، ئێستا گەیشت و دێت بۆ لای تۆ، خۆشەویستی ئێمەیە، بابەتەکەی لەسەر بگۆڕە". ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە کاریگەری زۆر باشی هەبوو لەسەر دەروونی ئەرشەد ئەلعومەری، شازادە زەید پێیگوتم: "فوئاد بڕۆ بۆ لای سەرۆك ئەرکانی سوپا، وەزیر پێیگوتووم زۆر لێت تووڕە بووە، بەڵام تووڕەییەکەی ڕەویوەتەوە و هیچی لە دڵدا نەماوە بەرامبەرت".

کە چووم بۆ لای یاریدەدەری سەرۆك ئەرکانی سوپا فەریق ئیسماعیل سەفوەت، دەبینم زۆر سەری سوڕماوە، وتی: "وەڵا بۆم لێکنادرێتەوە، دوێنێ جەنابی وەزیری بەرگری بانگیکردم، کاتێك چووم بۆ لای، دەبینم بە نێو ژوورەکەدا هەر دێت و دەچێت و نامەیەکی بەدەستەوەیە و هاوار دەکات: هەر ئێستا فوئادم دەوێت، زیندانی دەکەم، دەمەوێت بیکوژم"!

کە پرسیارم کرد چی لە نامەکەدا نووسراوە؟ وتی: "ناتوانم پیشانتی بدەم فوئاد چی لەسەرم نوسیووە". تا پێمگوت: "چۆن فوئاد دەکوژێت! فوئاد ئەفسەرە لە سوپای عێراق، خۆ ئەو چاوەشی شارەوانی نییە و تۆش ئەمینداری پایتەخت، جەنابی وەزیر ئەگەر هەر قسەیەکی خراپی پێت وتووە دەتوانیت دادگایی بکەیت. بەڵام کەمێك پێش ئێستا بانگیکردم و دەیەوێت لێت ببورێت، بە تەواوی گۆڕابوو، دووجار پەیوەندی پێوەکردم و لە تۆی پرسی و وتی بزانە چ داواکارییەکی هەیە بۆی جێبەجێ بکەین! تەنانەت پێی ڕاگەیاندم کە پێتی بڵێم تۆی خۆشدەوێت".

یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا پرسیاری کرد: "مەسەلە چییە؟" وتم: وەڵا گەورەم نازانم. مۆڵەتم وەرگرت و دوای ئەوە گواسترامەوە بۆ دیوانیە، دڵنیام ئەگەر شازادە زەید نەبووایە سزایەکی قورس دەدرام. یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا پێیگوتم: "نامەوێت لە کەرکوك بمێنیتەوە، چ شوێنێکت دەوێت بتگوازمەوە بۆی؟" لەسەر داوای خۆم گواسترامەوە بۆ دیوانیە و کرامە یاریدەدەری فەرماندەی فەوجی فیرقەی یەك.

لەو پیاوەتییانەی شازادە زەید لەگەڵی کردووم و یادم ناچن، ساڵی ١٩٤١ ماجید مستەفای خاڵم لەگەڵ خێزانەکەیدا لە تورکیا بوو، لە گەڕانەوەیدا بۆ عێراق، خاڵم لە حەلەب ڕاگیرا و بە تەنیا لە شەمەندەفەرەکە هێنرایە خوارەوە و نێردرایەوە بۆ تورکیا و خێزانەکەشی

نێردرانەوە بۆ عێراق. دیاربوو باڵوێزخانەی بەریتانیا حەزیان نەدەکرد ماجید مستەفا بگەڕێتەوە بۆ عێراق، بە تۆمەتی ئەوەی لە تورکیا لەگەڵ باڵوێزی ئەڵمانیا ڤۆن بایدن کۆبووەتەوە. چووم بۆ لای شازادە زەید و تەواوی باسەکەم بۆ گێڕایەوە چی بە خاڵم کراوە، ئەمە خراپەیە لە بەرامبەر مافی کەسیی خۆی و خێزانەکەی و ئەوان هاوڵاتی عێراقین.

پێیگوتم: "لەبەر ئەوەی ماجید خاڵی تۆیە، من هەموو هەوڵێکی بۆ دەدەم، سبەی بۆ نانی ئێوارە میوانی باڵوێزی بەریتانیام، ئەگەر نان هات پێی دەڵێم نان ناخۆم تا ڕەزامەندی دەرنەبڕیت لەسەر گەڕانەوەی ماجید مستەفا بۆ عێراق و دوای نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ بکە". دوای نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ کرد تا ئێستاش ژمارەی تەلەفۆنەکەیم لەبەرە ژمارە (٢٠) بوو.

### بەسەرهاتم لەگەڵ جەمیل ئەلمەدفەعی

وەك یاریدەدەری فەرماندەی فەوج دەستبەکار بووم، فەرماندەی فەوج عەقید ئەحمەد عیززەت داوود بوو، فەوجەکەمان چوو بۆ ناوچەی میرزا ڕۆستەم لە پارێزگای سلێمانی. زستان هات، نزیکەی ٢٥٠ سەر ئەسپ و قاترمان پێبوون و پێویستیان بە ئالیك هەبوو. هیچ کەس لە خەڵکی ناوچەکە ئامادە نەبوون ئالیکمان پێ بفرۆشن، چونکە ئاغاکان هەڕەشەیان لە جوتیارەکان کردبوو نابێت ئالیکمان پێبفرۆشن، ئاژەڵەکان هەڕەشەی تۆپینیان لەسەر بوو.

پەیوەندیم کرد بە خدر ئاغای برازای عەبباس ئاغای مەحموود ئاغای

سەرۆکی هۆزی پشدەرەوە، خدر ئاغا ئەو کاتە بەڕێوەبەری ناحیەی بنگرد بوو، وەك بزانم زۆر لە پۆستەکەی ڕازی نەبوو. لەگەڵ خدر ئاغادا چووین بۆ فەرماندەی فەوج بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی، ئەمجا پێکەوە چووین بۆ گوندی (چۆم خرکە) گوندەکەی عەبباس ئاغا، داوامان لێکرد ئالیکمان پێبفرۆشن. گەیشتینە قەڵادزێ، وەکیلی قائیمقام حەمزە شاسوار بوو. دوو پۆلیسی لەگەڵ ناردین و چووین بۆ ماڵی عەبباس ئاغا، کە باسەکەمان لەگەڵی کردەوە، وتی کارێکی عەیبە ئالیکتان پێ بفرۆشین و تۆ نەفسەری لەو فەوجەدا، بۆیە هەرچەندمان پێویست بوو بە خۆڕایی داینێ و خەڵکیشی نارده سەر گوندەکانی دەوروبەر چەندمان دەوێت ئالیکمان بدەنێ. بە چپە قسەم لەگەڵ عەبباس ئاغا دەکرد، پۆلیسێك بە پلەی عەریف لەوێ بوو قسەیەکی درۆی بە حەمزە شاسوار گەیاندبوو. وا بزانم حەزیدەکرد ببێتە قائیمقام، ئەویش لای خۆیەوە پارێزگاری سلێمانیی لێئاگادار کردبووەوە، کە فوئاد عارف لە (چۆم خرکە) پەیوەندی بە عەبباس ئاغاوە کردووە و دەیەوێت ناوچەکە لە دژی حکومەت بورووژێنێت. پارێزگار لای خۆیەوە پەیوەندی بە وەزارەتی ناوخۆوە کردبوو، ئەوانیش بە وەزارەتی بەرگرییەوە، کە لە قەڵادزێ گەڕامەوە زۆر دڵخۆشبووم بە ئەنجامەکانی پەیداکردنی ئالیك بۆ ئەسپ و قاترەکانمان. بە فەرماندەی فەوجم وت: من دەچم بۆ سلێمانی. ڕاستی نیازم ئەوە بوو تفەنگێکی ڕاوی وەك دیاری بۆ حەمزە شاسوار بکڕم، وەك پێزانینێك بۆ ڕەزامەندی و میواندارییەکەی. لە یادمە چووم بۆ لای عەزیز بەگ کە تفەنگی ڕاوی دەفرۆشت. وتی: "تا مۆڵەت لە بەڕێوەبەری

پۆلیسەوە نەهێنی، پێتی نافرۆشم". چووم بۆ لای عەلی حیجازی، بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی، کاتێك مەبەستی سەردانەکەمی زانی، پێکەنی و تەلەفۆنی بۆ فەرماندەی حامییەی سلێمانی عەقید ئەحمەد عیززەت داوود کرد، گوێم لێبوو دەیگوت: "فوئاد دانیشتووە و داوای مۆڵەتی کڕینی چەك دەکات، دەیەوێت تفەنگێکی ڕاو بە دیاری بۆ حەمزە شاسوار بکڕێت". فەرماندەی حامییە قسەی لەگەڵ کردم و بە تووڕەییەوە وتی: "هەر ئێستا لە حامییە ئامادە دەبیت". چووم بۆ حامییە، وتی: "دنیا لەسەرت تێکچووە، هەردوو وەزارەتی ناوخۆ و بەرگری تۆیان دەوێت". ئەمجا وتی: "پشکنەری گشتی پۆلیس، دەروێش لوتفی و ئەفسەری ڕوکن لە فیرقە بەڕێگەوەن بۆ ئێرە دێن، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەت لەگەڵ بکەن سەبارەت بەوەی هانی هۆزەکانت داوە لە ناوچەی سلێمانی لە دژی حکومەت ڕاپەڕن". ڕۆژی دواتر ئەفسەری ڕوکن لە کەرکوکەوە گەیشتە سەربازگەی میرزا ڕۆستەم بۆ لێکۆڵینەوە و بە دوای ئەویشدا عەمید دەروێش لوتفی پشکنەری پۆلیسی گشتی گەیشت و چوو بۆ قەڵادزێ بۆ لێکۆڵینەوە لە هەمان بابەت.

پرسیارم لە فەرماندەی فەوج کرد ئەدی خۆت منت نەنارد بۆ دابینکردنی ئالیك بۆ ئاژەڵەکان و منیش دابینم نەکرد؟ وتی: "بەڵێ، بەلام نازانم مەسەلە چییە؟". ئەمجا پرسیارم کرد: ئایا دەتوانم ڕاستەوخۆ لەگەڵ فەرماندەی فیرقە قسە بکەم. فەرماندەی فیرقە ئەو کات موحەممەد ئەمین زەکی بوو، کە بارەگاکەی لە کەرکوك بوو، دوای ئەوە بوو بە سەرۆکی ئەرکانی سوپا.

بە تەلەفۆن لە حامییەوە قسەم لەگەڵ فەرماندەی فیرقە کرد کە لە یانەی سەربازی بوو، پێمگوت: گەورەم ئەمڕۆ سێ فەرمانی گواستنەوەم پێگەیشتووە و نازانم مەسەلە چییە؟ بە تووڕەییەوە پێیگوتم: "تۆ هەموو گیانت کێشەیە". داوام لێکرد لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکات، چونکە ناتوانم و نازانم چۆن ئەو فەرمانانە جێبەجێ بکەم! پێمگوت: ئەگەر من بەو ڕادەیە کەمتەرخەمم، بفەرموو زیندانیم بکە " بەو شێوەیە گفتوگۆی نێوانمان کۆتایی هات.

دوای دوو کاتژمێر ئەفسەری ڕوکنی فیرقە پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "تۆ بۆ ماوەی دە ڕۆژ مۆڵەتی و وەرە بۆ کەرکوك". چوومە لای فەرماندەی فیرقە، وتی: "ڕاپۆرتت لەسەر دراوە و بە پێی دەسەڵاتی خۆم، تۆم گواستووەتەوە بۆ موسڵ، بەڵام گواستنەوەت بۆ بەسرە ئەوە لە دەسەڵاتی من نییە، بەڵكو لە دەسەڵاتی وەزارەتی بەرگرییە". وتی: "وەزارەت بە تۆ و مەسەلەی تۆوە تەواو سەرقاڵە. ئەگەر دەتەوێت سەردانی سەرۆکی ئەرکانی سوپا بکە و پرسیار لە مەسەلەکەت بکە، بەڵام نەڵێیت سەردانی ئەوم کردووە".

بە ڕێکەوت ئەو شەوەی لە کەرکوك بووم، تەقە لە ماجید یەعقوبی پارێزگاری سلێمانی کرا، خودا شاهیدە هیچ ئاگام لەو بابەتە نەبوو. ئەو شەوە لە شەمەندەفەردا بووم بۆ بەغداد، بەیانییەکەی سەردانی سەرۆك ئەرکانی سوپا فەریق حسەین فەوزیم کرد و باسەکەم بۆ گێڕایەوە و پێمگوت: ئەگەر تاوانبارم دادگاییم بکەن و سزام بدەن بەو جۆرەی

پێویست دەکات، ئەگەر تەنها زمان لێدانێکی درۆیە هیوادارم مافم لەوەی مافی خواردووم وەریگرنەوە. سەیر دەکەم سەرۆکی ئەرکانی سوپا باسی سەردەمی (عوسمانی) دەکات و یادگاریی و سەرسامیی سەردەمی عوسمانیم بۆ دەگێڕێتەوە، پێمگوت: گەورەم من نەهاتووم چاوم پێتبکەوێت تا باسی سەردەمی عوسمانیم بۆ بکەیت. وتی: "وا دیارە حەز ناکەیت گوێم لێبگریت فەرموو بۆ دەرەوە". هاتمە دەرەوە و تەنانەت ئەو چایەی بۆم داواکرابوو نەمخواردەوە. عەمیدی ڕوکن تۆفیق حسەین ناسراو بە تۆفیق ئەرکان، بەڕیوەبەری هەوالگری گشتی سەربازی حۆشی دەویستم، لە کۆلێژی سەربازی مامۆستامان بوو، چووم بۆ لای، پێیگوتم: "وەزارەت ئەم ڕۆژانە بە تۆوە سەرقاڵە".

بە درێژی باسی بابەتەکەم بۆ کرد، چۆن تەقەکردن لە مەجید یەعقوبی زیاد لە پێویست گەورە کراوەتەوە. بەڕاستی من نازانم چی بکەم و چۆن هەستم و دانیشم.

کاتێك پاسەوانی مەلیك غازی بووم، ڕۆژێکیان جەمیل ئەلمەدفەعی پێیگوتم: "فوئاد ئەگەر پێویستت بە هەر شتێك بوو سەردانم بکە". ئەو کاتە سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری بوو. پەیوەندیم کرد بە پاسەوانەکەی ڕائید عەبدولقادر یاسین ئەلتکریتی و هاوڕێی سەردەمی پاسەوانیم بوو لەگەڵ مەلیك غازی، پێمگوت دەمەوێت چاوم بە جەمیل ئەلمەدفەعی بکەوێت، دوای پێنج خولەك پەیوەندی پێوە کردمەوە و وتی: "بەگ دەڵێت با هەر ئێستا بێت". چوومە لای پاسەوانەکەی و

یەکسەر بردمییە لای، زۆر تووڕەبووم و بە تووڕەییەوە قسەم لەگەڵ کرد، لەسەر کورسییەکەی هەستا و دەستی خستە سەر شانم و وتی: "کوڕم دانیشە". دانیشتم ئەمجا بانگیکرد "شەربەتێکی مێوژی بۆ بێنن". هاتمەوە سەر خۆم، جەمیل ئەلمەدفەعی لە ژوورەکەیدا دەهات و دەچوو، منیش دانیشتبوم، داوایکرد قاوەیەکی بۆ بێنن. لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد: من تەنها ئەفسەرێکی بچووکم پێویست بەم هەموو تووڕەبوونە ناکات لەبەردەمی سەرۆك وەزیران و کەسایەتییەکی وا گەورەدا.

جەمیل ئەلمەدفەعی ڕووی تێکردم و وتی: "فوئاد پێم نەوتی هەر کێشەیەکت هەبوو وەرە بۆ لای خۆم". پرسیاری لێکردم: "مەسەلەی تۆ لەگەڵ مەجید یەعقوبیدا چییە؟". پێمگوت: بەخوا گەورەم ئاگام لە هەوڵدانی کوشتنی نییە، ئەوەی هەیە هاتوم چارەسەری کێشەی زمان لێدانم و گواستنەوەکەم بکەم، ئەمەشی هاتە سەر و هێندەی تر کێشەکەی قورستر کردمەوە. وتی: "بڕوات پێدەکەم". بە درێژی باسی هۆکاری ڕۆیشتنم بۆ قەڵادزێ بۆ کرد، چۆن توانیم ئالیك بۆ وڵاخەکان پەیدا بکەم، کە ئەگەر وا نەبووایە هەموویان لە برسان دەتۆپین. لەبەر پچڕانی هاتوچۆ بەهۆی هاتنی وەرزی زستان و خەڵکەکەش ئامادە نەبوون ئالیکمان پێبفرۆشن. وتی: "بڕوای تەواوم بەو قسانە هەیە کە دەیکەیت". ئەمجا وتی: "ئەگەر من لێرە نەبورمایە کارەکە ئەنجامی خراپی بۆت دەبوو". وتی: "چیت دەوێت؟". وتم: دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی. پەیوەندیکرد بە نەزیف ئەلشاوی، جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپاوە، چونکە سەرۆکی ئەرکانی سوپا لەوێ نەبوو، پێیگوت: "فوئاد ئەفسەرێکی

باشە و نامەوێت هیچ خراپەیەکی لەگەڵ بکرێت". ناردمی بۆ لای، کە چووم بۆ لای نەزیف ئەلشاوی وتی: "بەخوا دەزانم ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر تۆ دراون درۆن، لەگەڵ ئەوەشدا بچۆ بۆ لای سەرۆك ئەرکانی سوپا". چوومەوە بۆ لای هەرچەندە دەریکردبووم، بەڵام پێدەچوو هەڵویستی لە بەرامبەرم گۆڕا بێت، قەناعەتی کردبوو کە ڕاپۆرتەکان ڕاست نین و فەرمانی سەرۆك وەزیرانی جێبەجێکرد و فەرمانێکی بەم شێوەیە دەرکرد:

"ملازمی یەکەم فوئاد عارف ئیستیخدام دەکرێت بۆ یاریدەدەری فەرماندەی فەوجی دوو، لیوای حەوتەم، فەرماندەی حامییەی سلێمانی".

ئەمە وایکرد نەك هەر لە سلێمانی بمێنمەوە، بەڵکو ڕۆژانە (٣٥٠) فلسم بۆ خەرج بکرێت بەو پێیەی میلاکی حامییە نیم.

من خۆم بە قەرزداری جەمیل ئەلمەدفەعی دەزانم، ئەگەر ئەو مەسەلەکەی یەکلا نەکردایەتەوە ئەنجامەکەی زۆر خراپ دەبوو، چونکە ڕاپۆرتەکان زۆر خراپ لەسەرم نووسرابوون.

## پەیوەندیم لەگەڵ چوار ئەفسەرە شەهیدە کوردەکە

پەیوەندیم لەگەڵ قودسی و خەیروڵڵا ئاسایی بوو، بەڵام عیززەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو، دۆستایەتی بەهێزم لەگەڵیان هەبوو. عیززەتم بەر لە مستەفا خۆشناو ناسی و من و عیززەت وەك برا بووین لە یەك خێزان، بەڵکو لە برا زیاتر خۆشمدەویست و دایکیم وەك دایکی خۆم سەیر دەکرد، بەڵام مستەفا لە ئێمە منداڵتر بوو. هەمیشە لە یانەی سەربازی کۆدەبووینەوە و کاتەکانمان بە قسەی خۆش و باسکردنی یادگارییەکان بەسەر دەبرد. هەردووکیان تا بڵێی کەسی چاك و خاکی بوون.

بیرمە کاتێك مستەفا خۆشناو لە ساڵی ١٩٤٣ پلەی ملازم بوو، کرێ خانوو زۆر گران بوو، پێکەوە بیرمان کردەوە خانوویەکی بۆ دابین بکەین. پێمگوت: برۆ بۆ کەمپی ئەرمەنیان لە نزیکی سەربازگەی ئەلڕەشید. وتی: "جا چۆن ئەرمەنیان خانوویەکم لە نێو خۆیاندا دەدەنێ؟" وتم: تۆ برۆ حەقت نەبێت، موختارێك لەوێ دەناسم. ناوی (ئاوانیس سەمەرچیان) بوو، زۆر ڕێزی لێدەگرتم. لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی تورکیا بوو، هەڵهاتبوو لای کۆمەڵێك عەرەبی دەشتەکی نیشتەجێ بووبوو، دوایی بوو بە قەساب، دوای ئەوە بوو بە بەڵێندەری چێشتخانەی ئەفسەرانی ئینگلیز لە حەبانیە، دۆخی ئابووریی باش بوو، چەندین پارچە زەویی کڕی و بەسەر ئەرمەنیانی ئاوارەدا دابەشیکردن و نیشتەجێی کردن، زۆر خزمەتی ئەرمەنیانی کرد، ئەوانیش زۆر خۆشیاندەویست و ڕێزی زۆریان لێدەگرت.

ساڵی ١٩٤١ فەرماندەی سریەی ئینزیباتی سەربازی بووم لە فیرقەی سێ، لە سەربازگەی ئەلڕەشید، (ئاوانیس سەمەرچیان) هات بۆ لام و گلەیی ئەوەی کرد هەندێك لە سەربازە ئینزیباتەکان هەوڵی گێچەڵ بە خێزانە ئەرمەنییەکان دەکەن، لە کەمپی ئەرمەنیانی نزیك سەربازگەی ئەلڕەشید. چەند سەربازێکی ئینزیباتم دانا بۆ ڕێگەگرتن لەو دەستدرێژیی و ڕەفتارانە، پاشتر ناوچەکە بە تەواوی ئارام و پارێزراو بوو. بۆیە جارێکی تر خۆی و کۆمەڵێك لەگەڵیدا هاتنەوە و سوپاسیان کردم. لەوەوە دۆستایەتی لە نێوانماندا دروستبوو، بە مستەفا خۆشناوم وت بچیت بۆ لای سەمەرچیان و پێی بڵێت خزمی فوئادم و خانوویەکم دەوێت. سەمەرچیان پێی وتبوو ئێمە خانوو بە غەیری ئەرمەن نادەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا جارێکی تر وەرەوە بۆ لام، تا ئەو کاتەی خانوویەکت بۆ دابین دەکەم. سەمەرچیان هات بۆ لام و پێیگوتم: "داواکەت ڕەتناکەمەوە، بەڵام دەمەوێت لەڕووی ڕەفتار و ڕەوشتەوە مستەفا خۆشناوم بۆ تەزکیە بکەیت". پێمگوت: لەو ڕووەوە لێی دڵنیابە و وا بزانە یەکێکە لە خێزانەکەی من.

لە ساڵی ١٩٤٣ لە دانیشتنێکی دۆستانەدا بووین لەگەڵ هەریەك لە میرحاج و فەوزی سائیب و فەتاح شاڵی، سەرۆکی ئەرکانی سوپا فەریق ئیسماعیل نامیق بانگیکردم و بروسکەیەکی دامێ، کە لە لێکۆڵینەوەی تاوانەوە هاتبوو بۆ ئەوەی ناوەڕۆکەکەی جێبەجێ بکەم، بروسکەکە دەیگوت: بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی لە لێکۆڵینەوەی تاوان، لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی هەولێرەوە هاتوون، چەند شتێك هەیە لای

هەریەك لە مستەفا خۆشناو و موحەممەد ساڵەح موحەممەد، کە ئاسایشی دەوڵەت تێکدەدات، بۆیە پێویست دەکات ماڵەکانیان بپشکێنرێت، ماڵی موحەممەد ساڵەح موحەممەد لە سەربازگەی جەلەولا بوو، ماڵی مستەفا خۆشناو وەك باسمکرد لە کەمپی ئەرمەنیان بوو. هەر کە میرحاج بە بروسکەکەی زانی، زۆر تێکچوو بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی بە ماڵی موحەممەد ساڵەح موحەممەدەوە هەبوو.

ڕوون و ڕەوان وتی: "ئەگەر ماڵی موحەممەد ساڵەح بپشکێنرێت، بەڵگەنامەی زۆر مەترسیدار دەگیرێت". بۆیە منیش هەرزوو بروسکەیەکم نارد بۆ عەمیدی ڕوکن تۆفیق حسەین، کە مرۆڤێکی یەکجار باش بوو، هەر لەو سەردەمەی لە کۆلێژی سەربازی قوتابی بووم و ئەویش مامۆستامان بوو دەمناسی، بابەتی مێژووی سەربازی پێدەوتینەوە، پەیوەندییەکی خۆشم لەگەڵی هەبوو، زۆریشی خۆش دەویستم و منیش ڕێزی زۆرم لێدەگرت، داوام لێکرد ناوەڕۆکی بروسکەکەی لێکۆڵینەوەی تاوان جێبەجێ نەکرێت تا دڵنیا دەبینەوە لە ناوی موحەممەد ساڵەح موحەممەد، چونکە لە سوپای عێراقدا ئەفسەرانێکی زۆر بە هەمان ناو هەن، بەڵام ئەوە دڵی میرحاجی ئاو نەدا، بۆیە بە تەلەفۆن پەیوەندیم کرد بە خوالێخۆشبوو تۆفیق ئەرکان و پێمگوت: گەورەم، هیوادارم گرنگی بدەیت بە ناوەڕۆکی بروسکەکەم و نەهێڵیت ماڵی موحەممەد ساڵەح موحەممەد بپشکێنرێت. بە نەرمییەکەوە وتی: "کوڕم فوئاد! لە مەبەستت تێدەگەم، دڵنیابە تەنانەت ڕێگە نادەم بە سەرۆکی ئەرکانی سوپا یان وەزیری بەرگریش ماڵەکەی بپشکنن، تا تۆ لەو بارەیەوە

بروسکەم بۆ نەکەیت". دوای ئەوە بەپەلە چووم بۆ جەلەولا، ئاگاداری موحەممەد سالەحم کردەوە، ئەوجا بروسکەیەکم بۆی نارد بەڵێ مەبەستی بروسکەکەی لێکۆڵینەوەی تاوان ئەندازیار موحەممەد سالەح موحەممەدە، کاتێك پشکنینیان کردبوو لە ماڵی محەمەد سالەحدا هیچیان دەستنەکەوتبوو، کارەکە بە سەلامەتی کۆتایی هات.

سەبارەت بە مستەفا خۆشناو، داوام لە فەوزی سائیب کرد ئاگاداری بکاتەوە لەوەی ماڵەکەی دەپشکێنرێت، کاتێك پشکنەرانی تاوان لەگەڵ نوێنەری ئینزیباتی سەربازی و موختاری کەمپ (سەمەرچیان)دا چووبوون بۆ پشکنینی ماڵی مستەفا خۆشناو، (سەمەرچیان) بەر لەوە مستەفا خۆشناوی بە نهێنی ئاگادار کردبووەوە هەرچی قەدەغەکراوی لایە هەمووی بشارێتەوە، بۆیە نەتوانرا هیچ لە ماڵەکەیدا بگیرێت.

دەمەوێت بەو بۆنەیەوە ئەوە بڵێم لێکۆڵینەوەی تاوانی عێراقی لەو ڕۆژگارەدا هەرچەندە دەزگایەکی بچووك بوو، بەڵام زۆر چالاکبوون، چونکە بەریتانییەکان سەرپەرشتی کاروبارەکانیان دەکرد و یارمەتی زۆریانیان دەدا. چەندین جاری تر ئەفسەرانی هەڵگری بیرۆکە جیاوازەکان تووشی ئەو جۆرە پشکنینانە بوونەوە، لەوانە ئەفسەرە عەرەبە ناسیۆنالیستەکان. منیش لای خۆمەوە پەیوەندیم پێوەدەکردن و ئەوەی لەسەریان هاتبوو لە لێکۆڵینەوەی تاوانەوە پێم ڕادەگەیاندن، ئەمانە بوونە هۆی دروستبوونی پەیوەندییەکی توند و تۆڵم لەگەڵ ژمارەیەك لەو ئەفسەرانەی کە لە بیروباوەڕە جیاوازەکان بوون، تا بە تەواوی دڵنیا

نەبوومایە لە سەلامەتی هەڵوێستیان، ڕێگەم نەدەدا ماڵەکانیان بپشکێنرێت.

## لەگەڵ دەرچووانی کۆلێژی یەدەك

لە ساڵی ١٩٥٦ بە پلەی عەقید فەرماندەی فەوجی مەشق و ڕاهێنان بووم لە سەربازگەی ئەلمەنسوریە، لەوێوە گواسترامەوە بۆ کۆلێژی یەدەك – احتیاط – کە لە هەمان ساڵدا لە سەربازگەی ئەلڕەشید دامەزرا. فەرماندەی کۆلێژ عەمیدی ڕوکن حەمید سەیید عومەر بوو. کۆلێژەکە پێکهاتبوو لە دوو فەوج، یەکەمیان تایبەت بە دەرچووانی کۆلێژەکان من فەرماندەی بووم. فەوجی دووەم تایبەت بوو بە دەرچووانی پەیمانگاکان و خانەی مامۆستایان، فەرماندەکەیان عەقید عەبدولکەریم فەیسەڵ ئەلخەزرەجی بوو.

دۆخی ناوخۆی سیاسیی عێراق زۆر شلەژاو و ناجێگیر بوو، ئێزگەی (دەنگی عەرەب) ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە بەرزکردنەوەی گیانی حەماسەتی نیشتمانی و هاندانی ئۆپۆزسیۆن، بە تایبەت لە نێو گەنجانی خوێنگەرمدا. دەسەڵاتی فەرمانڕەوا هەستا بە پێکهێنانی خولی سەربازی بۆ ئەو قوتابییانەی پێیان وابوو کۆلێژی یەدەك درێژکراوەی ئەو خولانەیە، کە لە ڕاستیدا جگە لە سەربازگەیەکی زیندان هیچی تر نەبوو. لە کاتێکدا بڕوام بە ئامانجی کۆلێژی یەدەك ئەوە نەبوو کە ئەوان هەیانبوو.

ئەو قوتابییانەی لە خولەکەدا بوون، تەمەنیان گەورە بوو و هەندێکیان لە دەرچووانی ساڵانی پێشوی زانکۆ بوون، بە تایبەت ئەوانەی لە

فەوجەکەی مندا بوون. زۆر ڕاشکاوانە و بوێرانە مامەڵەم لەگەڵ دەکردن، زۆریان پێ سەیر بوو کاتێك لە بەرامبەریاندا وەستام و قسەم بۆ کردن و وتم: منیش لەو دۆخە سیاسییەی عێراق ڕازی نیم، بەڵام لە پاڵ ڕۆشنبیری مەدەنی و پسپۆڕیدا، ڕۆشنبیری سەربازیش گرنگە، بۆیە ئەمە هەلێکە خۆتان بە ڕۆشنبیری سەربازی دەوڵەمەند بکەن و بۆ خۆتان و ژیانی سوپاکەتان ئەزموون و تاقی بکەنەوە. بەو جۆرە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە وەلائیانم بەدەستهێنا. بە پێچەوانەی فەوجی دوو کە دەرچووی پەیمانگاکانی لەخۆدەگرت و فەرماندەکەی زۆر توند مامەڵەی لەگەڵ کردبوون، بۆیە قوتابیان لە دژی خۆپیشاندانیان کرد و لە فەوجەکەی گواسترایەوە. بیرمە لە نێوان قوتابییەکاندا هەندێك ناڕازی هەبوون، کە لێکۆڵینەوەی تاوان (ئاسایش) چاودێری دەکردن. ڕۆژێك لە ڕۆژانی کانوونی یەکەم لیستێکی درێژم بەدەست گەیشت بە گواستنەوەی (١٣٥) قوتابی بۆ سەربازگەی ڕەواندوز، سەرم لەم ڕێکارە سوڕما، ئەو کاتە بریکاری فەرماندەی کۆلێژ بووم. فەرماندەی کۆلێژی سەربازی نەخۆش بوو و لە نەخۆشخانەی سەربازی خەوێنرا بوو.

سەردانی سەرۆکی ئەرکانی سوپا، ڕەفیق عارفم کرد و هۆکاری گواستنەوەکەم لێپرسی، وتی: "هیچ نازانم و نووری ئەلسەعید ئەو فەرمانەی دەرکردووە". پێمگوت: ئەم ڕێکارە ناڕەزایی لە نێوەندی ڕۆشنبیراندا دروستدەکات و حەز دەکەم چاوم بە وەزیری بەرگری بکەوێت. پێیگوتم پەیوەندی بە لیوا غازی داغستانی جێگری سەرۆکی ئەرکانی سوپاوە بکەم. بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بچم بۆ بینینی نووری

ئەلسەعید، کە ئەو کات جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری بەرگری بوو. چوومە لای نووری ئەلسەعید و پێمگوت ئەم ڕێکارانە دەبنە هۆی ناڕەزایی و پشێوی، وتی: "لە لێکۆڵینەوەی تاوانەوە نووسراوێکمان پێگەیشتوە بە ئاژاوەگێڕ ناویان دەبات و دەڵێت خەریکی ئەوەن لە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەم بۆمبێك بخەنە ژێر سەکۆکەی مەلیك". وتم: بەڵێنت دەدەمێ هەموو ئەو قسانە درۆن. بیرمە غازی داغستانی پێیگوتم: "چۆن بەڵێنێکی وا دەدەیت؟" نووری ئەلسەعید لە پشتی چاویلکەکەیەوە سەیرێکی کردم و پێمگوت: جەنابی نووری پاشا بۆ خۆت بۆ نایەیت ڕووبەڕوو چاوت بەو قوتابیانە بکەویت؟ بۆچی بڕوا بە قسەی پۆلیسێك دەکەن لە لێکۆڵینەوەی تاوان، ئەی بۆچی بڕوا بە قسەی من ناکەن کە عەقید و فەرماندەیەکم لە سوپادا؟!

نووری ئەلسەعید وتی: "پێم دەڵێیت خۆم بێم سەردانی کۆلێژەکە بکەم؟ ئەی ئەگەر بێم لێرە و لەوێ هیچ ڕوو نادات؟!" دەترسا قوتابییەکان لە نێو کۆلێژدا خۆپیشاندان یان کاری توندوتیژی بکەن. پێمگوت: بە پێویستی دەزانم بۆ خۆت کۆلێژەکە ببینیت". لە ڕاستیدا نووری ئەلسەعید کاتێکی بۆ سەردان دیاری نەکرد. دوای چەند ڕۆژێك کە خەریکی پشکنینی کۆلێژ و بینینی بەڕێوەچوونی کاروبارەکان بووم، دەبینم نووری ئەلسەعید لە چێشتخانەکەدا خەریکی پشکنینی چێشتی ئەو ڕۆژەیە. سڵاوێکم بۆی گرتەوە و (ویداد عەجام) کە قوتابی کۆلێژی احتیاط و ئەو ڕۆژە ئێشکگری چێشتخانە بوو، ناردم قوتابییەکان کۆبکاتەوە.

نووری ئەلسەعید بەرکولێکی لە خواردنەکە کرد و زۆری بە دڵ بوو، تا ئەوەی وتی: "من لە ماڵی خۆمدا خواردنی بەم کوالێتییە ناخۆم.

کاتێك نووری ئەلسەعید تەقەی پێڵاوی سەربازە قوتابییەکانی بیست کە ڕایان دەکرد و زیاتر لە هەزار قوتابی بوون، کەوچکەکەی دانا و بە سەرسوڕمانەوە وتی: "چییە، مەسەلە چییە؟". وتم: نا گەورەم قوتابیان ڕا دەکەن بۆ ئەوەی کۆببنەوە و چاویان بە بەڕێزتان بکەوێت. دوای ئەوە ڕەئیس عورەفای کۆلێژ هات و وتی: "گەورەم قوتابیان ئامادەن". لەگەڵ خوالێخۆشبوو نووری ئەلسەعیددا هاتمە دەرەوە، قوتابیان هەموو دۆخی وریابوونیان وەرگرتبوو، قسەی بۆ کردن و قوتابیان بە ڕێزەوە قسەیان لەگەڵ کرد.

نووری پاشا چاوپێکەوتنەکەی زۆر پێخۆشبوو و بە دڵی بوو، بەڵێنی پێدان داواکارییە جۆراوجۆرەکانیان جێبەجێ بکات، ڕۆژی دواتر کە لە خێوەتەکەمدا بووم، خەریکبووم جلەکانم لەبەر دەکرد، دەبینم نووری ئەلسەعید و هەموو وەزیرەکانی هاتن، خێرا چووم بە پیرییانەوە. پرسیاری کرد: "قوتابییەکان کوان؟". وتم: لە چێشتخانەن نانی بەیانی دەخۆن. چاوی بە قوتابیان کەوت و پێیگوتن: "تەواوی ئەنجومەنی وەزیرانم هێناوە بۆ لاتان، بە ئازادی تەواو دەربارەی کێشە و گرفتەکانتان قسەیان لەگەڵ بکەن. ئەمجا وتی: "ئەگەر وەزیر کێشەکەتانی چارەسەر نەکرد، دوای ئەوە عەقید فوئاد ئاگادارم بکاتەوە ئامادەم بە خۆم چارەسەری بکەم". بەو جۆرە نێوانی من و قوتابیان هێندەی تر خۆشتر

بوو. هەندێك لە قوتابیان توانییان هەندێك لە داواكارییەكانیان چارەسەر بكەن لە ڕێگەی باسكردنی كێشەكانیانەوە كە پەیوەست بوو بە كار و وەزیفە و خێزانەكانییانەوە.

## پەیوەندیم لەگەڵ ئەفسەرانی ئازادیخواز

پەیوەندی دۆستانەم لەگەڵ زۆربەی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا هەبوو، عەبدولکەریم قاسم کە سەرۆکی ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز بوو، دۆستایەتیم لەگەڵیدا دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی خوێندن لە کۆلێژی سەربازی. هاوڕێ و دۆست بووین و لە ساڵی ١٩٣٢ پێکەوە کۆلێژمان تەواو کرد. هەرچەندە هەریەکەمان خراینە فەوجێك، بەڵام ناوە ناوە لە بەغداد یەکترمان دەبینی. کاتێك ساڵی ١٩٥٤ فەرماندەی فەوجی ڕاهێنان بووم لە سەربازگەی ئەلمەنسورییە، عەبدولکەریم قاسم بوو بە فەرماندەی لیوای نۆزدە لە هەمان سەربازگەدا و تا کۆتایی ساڵی ١٩٥٦ پێکەوە بووین، دۆستایەتی و خۆشەویستی نێوانمان لەو ماوەیەدا پتەوتربوو، زۆر جار کە بە مۆڵەت یان ڕۆژانی پێنج شەممە و هەینی دادەبەزین، دەبووینە میوانی لە ماڵی خۆی لە بەغداد. کاتێك تاهیر یەحیام ناسی، کە فەرماندەی کەتیبەی مودەرەعات بوو لە ئەلمەنسورییە و دۆستایەتی لە نێوانماندا دروستبوو. ئەو کاتەی عەبدولسەلام عارفم ناسی کە فەرماندەی فەوج بوو لە لیوای نۆزدە لە جەلەولا. بە تێپەڕبوونی ڕۆژ پەیوەندیم پەیدا کرد لەگەڵ زۆرێك لەو ئەفسەرانەی چووبوونە نێو ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە. هیچکات سڵیان نەدەکردەوە لەوەی لە دڵیاندایە لای من بیلێن لە ڕزگارکردنی عێراق لە ڕژێمی پاشایەتی و هێنانەدی ڕژێمێکی کۆماری دیموکراسیی. تا ئەو ڕادەیەی متمانەیان پێم هەبوو قسە لەگەڵ لیوا نەجیب ئەلروبێعیدا بکەم، کە فەرماندەی فیرقە

بوو لە بەعقوبە بۆ ئەوەی بێتە نێو ڕێکخراوەکە و بەشداری بکات لە هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە.

لە ڕاستیدا بڕیار و پەیمانم بە خۆم دابوو لە دوای ئەزموونم لەگەڵ پارتی هیوا، نەچمە نێو هیچ ڕێکخراوێکی سیاسییەوە. عەبدولکەریم قاسم هەڵوێستی منی لە ڕێکخراوەکە باش دەزانی. بۆیە داوای لێنەکردم بێمە ناویەوە، ئەگەر داوای لێکردبام بێگومان ڕەتم دەکردەوە.

بەر ئەوەی باسی ئەو ئەرکە بکەم، دەبێت باسی پەیوەندیم لەگەڵ نەجیب ئەلروبێعی و بۆچوونم لەسەری بکەم: عەقڵ نایبڕێت ئەفسەرێك بە پلەی عەقید بچێت قسە لەگەڵ فەرماندەی فیرقەیەك بکات بۆ ئەوەی بێتە ناو ڕێکخراوێکی سیاسیی و سەربازییەوە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمێك، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی پێشووتر یان متمانەیەکی دوولایەنە لە نێوانیاندا هەبێت.

بەر لەوەی خێزانەکەمان بگوازێتەوە بۆ سلێمانی، واتە بەر لە داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە، ماڵمان لە بەغداد بوو لە ناوچەی حەیدەرخانە و عاقولییە، دراوسێیەکی نزیکی ماڵی نەجیب ئەلروبێعی بووین و دۆستایەتییەکی خێزانی کۆنمان هەبوو، خێزانم دۆستایەتیی لەگەڵ خێزانیدا هەبوو، قەدەر وایکرد گەڕامەوە بۆ بەغداد و دوای دەرچوونم لە کۆلێژی سەربازی لە ساڵی ١٩٣٢ چاوم پێکەوتەوە، ئەو کات نەجیب ئەلروبێعی ملازمی یەك و ئەفسەری هەوالگری فیرقەی دوو بوو لە کەرکوك. دوای ئەوەی چووە کۆلێژی ئەرکان، یەکترناسینمان تازە

بووەوە و ساڵی ١٩٤١ پەیوەندی نێوانمان لەگەڵ حەسیب ئەلروبێعی برایدا زۆر بەهێز بوو، ئەو کاتە ڕائید روکنی فیرقەی یەك بوو لە بەغداد. منیش یاریدەدەری فەرماندەی فەوج بووم لە لیوای دوو، وە زۆر جار لە سەربازگەی موسەییەب سەردانی دەکردین. لە ڕاستیدا بە لای منەوە لە ئەفسەرەکانی تر باشتر بوو، ئەمەش پەیوەندی نێوانمانی بەهێزتر کرد و دۆستایەتی نێوان من و حەسیب ئەلروبێعی و نەجیب ئەلروبێعی برای پتەوتر بوو. زۆر جار یەکترمان دەبینی، کاتێك نەجیب ئەلروبێعی بوو بە فەرماندەی فیرقەی سێ لە بەعقوبە، پەیوەندیم لەگەڵی بەهێزتر بوو. نەجیب ئەلروبێعی لەو کەسانە بوو زۆر ڕێزی لە بەهای هاوڕێیەتی و مافی خێزانی و مافی دراوسێیەتی دەگرت، تا بڵێی پیاوێکی وەفادار و خاوەن بەهای بەرز بوو.

نەجیب ئەلروبێعی و حەسیب ئەلروبێعی برای و غازی داغستانی لە ساڵانی پەنجاکاندا لە دیارترین ئەفسەرانی سوپای عێراق بوون و بە باشترین ئەفسەران دادەنران، بۆیە هەر کامەیان نمونەی باڵا بوون بۆ هەموو ئەفسەرێك سوپای عێراق لەو کاتەدا، پێم وابوو ئەگەر یەکێك لەو سێ کەسە بەهۆی ناوبانگی باشیان لە نێو ناوەندی سەربازیدا، ڕابەرایەتی بزووتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز بکات، بە دڵنیاییەوە شۆڕشەکە سەرکەوتو دەبێت و زۆربەی ئەفسەران پشتگیری شۆڕشەکە دەکەن. بۆیە قسەم لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم و تاهیر یەحیادا کرد دەربارەی ئەو بابەتە و ئەوانیش هەرزوو ڕەزامەندییان دەربڕی. وا دەزانم حەزیان دەکرد نەجیب ئەلروبێعی بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپێردرێت، بەڵام قسەکردن لەگەڵی

کارێکی ئاسان نەبوو. دوای چەند ڕۆژێك چووم بۆ بەعقوبە، کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ گەیشتم و چوومە لای، زۆر بە خێرهێنام و پرسیاری لێکردم ئەگەر کارێکی تایبەتم هەیە؟ پێمگوت: لە ڕاستیدا بابەتێك هەیە دەمەوێت لەگەڵت باسی بکەم، بەڵام لە ماڵ نەك لە بارەگاکەت. بەسەرچاوی وت و بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ ژنەکەیدا کرد و پێیگوت: "دایکی بەراء کاك فوئاد نانی نیوەڕۆ لەگەڵ مندا دێنێتە ماڵەوە.

لە ماڵدا، ڕاست و رەوان و بێ پێچوپەنا مەبەستی هاتنەکەمم بۆ باسکرد، ئەویش دەیزانی من کەسێکی ڕاشکاو و حەزم لە ڕاستی وتنە.

پێمگوت: تۆ لە خێزانێکی بەڕێز و باشیت و ناوبانگت لە نێو مەدەنیاندا زۆر باشە و جیاوازی لە زۆرێك لە ئەفسەرانی تر، ئەو تایبەتمەندییانەت وایکردووە زۆرێك لە ئەفسەرانی گەنج حەز بکەن چارەنووسی خۆت پەیوەست بکەیت بە چارەنووسی ئەوانەوە و ببیتە سەرکردەی ئەو شۆڕشەی دەیانەوێت بەرپای بکەن بۆ گۆڕینی ڕژێمی حوکم لە عێراقدا، پێیان وایە تۆ ڕازی دەبیت ئەو بەرپرسیاریەتییە هەڵگریت و سەرکردایەتی کردنت بۆ ئەوان مسۆگەربوونی سەرکەوتنی شۆڕشەکەیە، هەرچی ترس و دوودڵییە لە دڵی خۆت دەرکە و دەست بخەرە نێو دەستیان و پشت بە خوا ببەستە. دوای تەواوبوونی قسەکانم نەختێك بێدەنگ بوو و ڕاستەوخۆ وەڵامی نەدایەوە.

دوای ئەوە وتی: "باوکی فەرهاد! منیش وەك ئێوە ڕازی نیم لەو دۆخە سیاسییەی تیایداین، هیوادارم بگۆڕدرێت، بەڵام لە ڕاستیدا متمانە بە

بەشێك لەوانە ناکەم دەیانەوێت شۆڕش بکەن". بیرمە پێیگوتم: "پێم وایە ئەگەر سیانیان پێکەوە دانیشن، دووانیان سیخوڕی وەسیی و وەزارەتی بەرگرین. بۆیە متمانەیان پێناکەم و هەر لێرەوە دەڵێم: سەرنەکەوتن بەشی ئەو شۆڕشەیە کە دەیانەوێت بەرپای بکەن". ئەمجا ئامۆژگاری کردم و وتی: "فوئادی برام تۆ مرۆڤێکی چاك و وەفاداریت، دەبێت ئاگات لە خۆت بێت، هیوادارم ئەم بابەتە لە بیری خۆت ببەیتەوە و وەك ئەوەی قسەت لەگەڵ من نەکردبێت".

خودا حافیزیم لێکرد و گەڕامەوە بۆ شارەبان، هەریەك لە عەبدولکەریم قاسم و تاهیر یەحیا چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بوون. بیرمە لە نێو سەربازگەکەدا پیاسەیان دەکرد، بە دوور و درێژی باسەکەم بۆ گێڕانەوە، عەبدولکەریم قاسم وتی: "ئەگەر ئەوە بۆچوونی ئەو بێت، ئێمە خۆمان ئەنجامی دەدەین".

ئەوەی سەیر بوو، دوای ئەوە ڕاستەوخۆ نەجیب ئەلروبێعی لە پۆستەکەی وەك فەرماندەی فیرقەی سێ گواسترایەوە بۆ وەزیری ڕێگەپێدراو لە جدە، منیش بۆ کۆلێژی ئیحتیات لە بەغداد وەك فەرماندەی فەوجی یەك، بەڵام ئەوە چۆن کرا نازانم!

ڕاستییەك هەیە نابێت باسی نەکەم، ئەو بابەتەی لەگەڵ نەجیب ئەلروبێعیدا باسمکرد، بابەتێکی زۆر مەترسیدار بوو، ترسی لە هەندێك ئەفسەر هەبوو کە لە نێو ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا بن، بەهەرحاڵ ناتوانم لەو مەسەلەیەدا سەرکۆنەی بکەم، چونکە مرۆڤ ئازادە

لە حیسابکردن و مەزەندەکردنەکانی بۆ هەر بارودۆخێك، بەڵام دەبێت ئەوەمان بیر نەچێت ئەلروبێعی هەستی خۆی نەشاردەوە لە بەرامبەر دەسەڵاتدا و بە ڕوونی و ڕاشکاوی قسەی لەسەر کرد، کە ڕازی نییە لە دۆخی سیاسیی وڵات. ئەمەش لێدوانێکی ئاسان نەبوو لەلایەن فەرماندەی فیرقەیەك لە سوپادا. ئەوەی بزانم لەسەر کەسایەتی نەجیب ئەلروبێعی پیاوێکی ورد و پێداگر بوو و پەلەی نەدەکرد لە کاروبار و بڕیاردا. باش دەیزانی ئەفسەرانێك هەن پەیوەندی توندوتۆڵیان هەیە بە وەزارەتی بەرگری و عەبدولئیلاهەوە، ئەمە لە لایەك. لە لایەکی ترەوە، لەوە دەچێت پەی بەوە بردبێت گەورە ئەفسەرانی ئازادیخواز ویستبێتیان بیکەنە ڕوویەك بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری سوپا لە ڕۆژی شۆڕشەکەدا، چونکە ناوبانگێکی سەربازیی و کەسایەتییەکی خۆشەویستی بوو، جگە لەوەی پلە سەربازییەکەی (لیوا) بوو، ئەمە وایکرد بڵێت "دەشێت بیانەوێت من بکەنە موحەممەد نەجیبی دوەم". مەبەستی لیوا موحەممەد نەجیب بوو، کە شۆڕشی ٢٣ی یۆلیۆیان لە میسر پێکرد و هێندەی نەبرد لایان دا، بەڵام لە ڕاستیدا من ئەو بۆچوونەی دوایی نەجیب ئەلروبێعیم بۆ عەبدولکەریم قاسم باس نەکرد.

لە ١٩٥٨/٧/١٠ کە ڕێکەوتی ڕۆژی پێنج شەممەی دەکرد، واتە بەر لە ڕاگەیاندنی شۆڕش بە چوار ڕۆژ، عەبدولکەریم قاسمم لە وەزارەتی بەرگری بینی و عەبدولسەلام عارفیشی لەگەڵ بوو. ئەو کاتە فەرماندەی لیوای نۆ بووم لە حیللە. عەبدولکەریم پرسیاری (ئەنوەر سامر)ی بەڕێوەبەری ئاسایشی ناوچەی حیللەی کرد، بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی حیللە، کەربەلا

و ناوچەکانی تریشی دەگرتەوە، پێمگوت: کەسێکی باشە. دوای ئەوە زانیم کە خزمی عەبدولسەلام عارفە. پێیگوتم: "لەو ڕۆژانە هەواڵی خۆش دەبیستیت". داوای لێکردم سبەینێ هەینی نانی نیوەڕۆ لە ماڵی ئەواندا پێکەوە بخۆین. وتم: باش، بەڵام لەبیرم چوو، ڕۆژی هەینی کاتێك لە بەغدادەوە دەگەڕامەوە بۆ حیللە، لای عەسرەکەی بیرم کەوتەوە بەڵام تازە هیچ... بەیانی ڕۆژی دوو شەممە ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ عەریفێك هات بۆ لام و وتی: "گەورەم گوێ لە ڕادیۆ بگرە" ڕادیۆم کردەوە ئەو کات زانیم شۆڕش کراوە. هەستام و لیوام کۆنترۆڵ کرد و دەوریاتی سەربازیم دەرکرد بۆ نێو شاری حیللە، فاضل بابانی پارێزگاری حیللە هات بۆ لام دەترسا لەوەی دەستدرێژییەکی بکرێتە سەر.

فەرماندەی حامییەی محاویل هات بۆ لام و وتی: "ڕێنومایيمان بۆ هاتوە دەڵێت فەرمان لە تۆوە وەربگرین". پێمگوت: لە ئێستادا لە شوێنی خۆت بمێنەوە. دوای ئەوە لیوا ڕوکن عومەر عەلی، فەرماندەی فیرقەی یەك لە دیوانیە تەلەفۆنی کرد و وتی: "ئەمە ئاژاوەگێڕییە"، پێمگوت: نەخێر ئاژاوەگێڕی نییە، چاوەڕێبە، باشتر وایە فەرمانەکان جێبەجێ بکەیت. لە ڕاستیدا دەیویست بزانێت هەڵوێستی من لە شۆڕشەکە چییە، منیش ڕاشکاوانە هەڵوێستی خۆمم بۆ ڕوونکردەوە و پێمگوت لەگەڵ شۆڕشەکەدام.

دوای کاتژمێرێك پەیوەندی پێوە کردمەوە و پشتگیری هەڵوێستەکەمی کرد، دیار بوو نەیتوانیبوو ڕووبەڕووی شۆڕش ببێتەوە، چونکە زۆربەی

سوپا لە دیوانیە لەگەڵ شۆڕشدا بوون، ئەمەش وایکرد لە هەڵوێستەکەی پەشیمان ببێتەوە. ڕۆژی دووەم عومەر عەلییان هێنا و ناردم بۆ بەغداد، لەوێوە ڕەوانەی دادگای سەربازی تایبەت کرا.

عەمیدی ڕوکن وەفیق عارف، برای ڕەفیق عارفی سەرۆك ئەرکانی سوپا، فەرماندەی لیوای موسەییەب بوو. عەقید فازڵ ئەلمەهداوی و ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵی بوون، کۆنترۆڵی لیواکەیان کرد و لیواکەیان جوڵاند بەرەو بەغداد، لە ڕێگا تووشی عومەر عەلی بووبوون، وەك بیستم دەست درێژییان کردبووە سەری. دوای ئەوە بە کەلەپچەکراوی پارێزگاری دیوانیەیان هێنا و بەدوایدا پارێزگاری ڕومادی. زۆر ڕێزم گرتن و بە باشی مامەڵەم لەگەڵکردن و ئەوجا ناردمن بۆ بەغداد، بەڵام پارێزگاری حیللە لە حیللەدا مایەوە تا دانانی عەمید ڕوکن عەبدولوەهاب شاکر بە پارێزگاری حیللە. پەیوەندیم بە سەرکردایەتی بەغدادەوە کرد و داوام لێکردن ڕێز لەو گیراوانە بگرن کە من ناردوومن بۆیان، بەیانی ڕۆژی پازدەی تەمموز چووم بۆ وەزارەتی بەرگری، چوومە لای عەبدولکەریم قاسم بیرمە لەو کاتەدا خەریك بوو ڕیشی دەتاشی، عەبدولسەلام عارفیش وەستا بوو قسەی دەکرد، لە ڕاستیدا زۆر بێتاقەت بووم بە کوشتنی مەلیك فەیسەڵی دووەم و بنەماڵەی شاهانە، دەستم کرد بە سەرزەنشتکردنیان، چونکە دەمزانی کوشتنی مەلیك لە بەرنامەی شۆڕشدا نەبوو. عەبدولسەلام پێکەنی و وتی: "بێزارە، چونکە ڕۆژانێك پاسەوانی مەلیك بووە". وتم: بەڵێ پاسەوانی مەلیك بووم و هەرگیز لێی پەشیمان نیم، کوشتنی فەیسەڵی دووەمی کوڕی غازی هیچ پێویست نەبوو. عەبدولکەریم

قاسمیش بە کوشتنیان زۆر بێتاقەت بوو، پشتگیری قسەکانمی کرد، ڕاستییەکە بۆ مێژوو دەیڵێم، پێیگوتم: "هەندێك شت لە دەرەوەی ویستی تاك و لە دەرەوەی بازنەی پلاندانان ڕوودەدەن". دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ حیللە و وەك پارێزگاری کەربەلا دەستبەکار بووم.

ئەوەی پەیوەندی بە کوشتنی مەلیکەوە هەبێت، کە لە بەرنامەی شۆڕشدا هەبووە یان نا. زۆر جار کە پێکەوە دادەنیشتین لە عەبدولکەریم قاسم و تاهیر یەحیا و عەبدولسەلام عارفم دەبیست، دەیانگووت: "شۆڕش بۆ ئەوە دەکەین ڕژێمێکی کۆماری بەدی بێنین و تیایدا شۆڕش دادگایی سەرانی ڕژێمی پێشوو بکات، لەوانە عەبدولئیلاه و نووری ئەلسەعید کە دیارترینیان بوون". دەیانگوت: "دەیاندەینە دادگا". بە درێژی پەیوەندیم لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم و ئەوانی تر لە ئەفسەرانی ئازادیخواز هەبوو، بۆ یەکجاریش گوێم لێنەبوو ئاماژە بدەن بە کوشتنی هیچ کەسێك لە پیاوانی سەردەمی پاشایەتی، بەڵکو ئامانجەکانی شۆڕش دادگاییکردنی ئەوانە بوو هەر لە عەبدولئیلاهەوە تا دەگاتە نووری ئەلسەعید و ئەوانی تر.

ئەو کوشتارەی بەسەر بنەماڵەی شاهانەدا هێنرا و ئەو چارەنووسەی پێی گەیشتن بە تایبەت فەیسەڵی دووەم بە ڕاستی شایانی نەبوون، لە بەر دوو هۆ، یەکەم: عێراقییەکان فەیسەڵیان خۆشدەویست لەبەر ئەوەی کوڕی غازی، ئەو مەلیکە نیشتمانپەروەرە بوو، دووەم: تەمەنی منداڵ بوو و شارەزایی کەم بوو، ویست و ئیرادەی لە دەستی عەبدولئیلاهی خاڵیدا بوو کە هەر بە منداڵی کەوتە دەستی ئەو، بە بۆچوونی من عەقید تەها

بامەڕنی کە فەرماندەی پاسەوانی شاهانە بوو دەیتوانی شکست بە شۆڕشەکە بهێنێت، ئەگەر وەسی عەبدولئیلاه دەستی لە کاروباری سەربازیی وەرنەدایە.

ئەو زانیاریانەی کاتی خۆی دەربارەی دوایین کاتەکانی ژیانی بنەماڵی شاهانە دەستم کەوتن: دوای دروستبوونی تەقە لە نێوان ئەو هێزانەی گەمارۆی کۆشکی رەحابیان دابوو، لەگەڵ پاسەوانەکانی کۆشك، عەقید تەها بامەڕنی بڕیار دەدات هاوکاری شۆڕش بکات و فەرمان بە سەربازانی پاسەوانی شاهانە دەکات چەك دابنێن، دوای ئەوەی ئاڕ بی جیپەك بەر نهۆمی دووەمی کۆشك دەکەوێت و گڕ دەگرێت، خێزانی شاهانە و ئەوانەی لەگەڵیان دەبن بە مەلیك فەیسەڵی دووەمیشەوە دێنە دەرەوە، ئاڵای سپی بەرز دەکەنەوە بۆ خۆبەدەستەوەدان، ئەفسەران و سەربازانی شۆڕش گەمارۆیان دەدەن بۆ ئەوەی بیانگرن و ڕادەستی سەرکردایەتی شۆڕشیان بکەن، بەڵام ڕائید عەبدولستار سەبع ئەلعەبوسی دەچێتە نێو باخچەی کۆشکەوە و لوولەی تفەنگەکەی دەکاتە خێزانی شاهانە و تەقەیان لێدەکات و مەلیك فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاه و شاژنە نەفیسەی دایکی عەبدولئیلاه و شازادە عابدیە دەکوژێت.

لە کاتی خۆیدا پرسیارم لە ڕائید عەبدولستار سەبع ئەلعەبوسی کرد، بۆچی تەقەی لە بنەماڵەی شاهانە کرد، لە کاتێکدا هیچ فەرمانێکی پێنەبوو بۆ کوشتنیان؟! وتی لەبەر ئەوەی تەقەی لێیان کردووە، ترساوە دۆخەکە پێچەوانە بکەوێتەوە، مەبادا سەربازەکان کاریگەر بوونایە بە

دیمەنی بنەماڵەی شاهانە، بۆیە ئەگەری هەرچی ئەو هۆکارانەم بڕی چەندە سادەش بوونایە، ببنە هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکە.

## دانانم بە پارێزگاری کەربەلا

سەبارەت بە هەڵبژاردنم بۆ پارێزگاری کەربەلا لەبەر ئەوە بوو پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ خەڵکی کەربەلا و نەجەفدا هەبوو کە دەگەڕایەوە بۆ پێش شۆڕش. لە ساڵی ١٩٤٧ ئەفسەری تەجنیدی کەربەلا و نەجەف بووم. خەڵکی ئەو دوو شارەم خۆشدەویست و ئەوانیش منیان خۆشدەویست و پەیوەندی دۆستایەتیم لەگەڵ زۆربەیاندا دروستکرد و شانازی پێوە دەکەم. کە لە بەڕێوەبەرایەتی تەجنیدی کەربەلا گواسترامەوە، دوای چەند ساڵێك بەرزکرامەوە بۆ پلەی عەمید، ژمارەیەکی زۆر کارت و بروسکەی پیرۆزبایيم لە خەڵکەکەیەوە پێگەیشت. لە ڕاستیدا ئەو ژمارە پیرۆزباییەم لە هیچ شوێنێکی ترەوە پێنەگەیشت کە تا ئێستاش شانازییان پێوە دەکەم.

عەبدولکەریم قاسم هەڵوێستی منی لەسەر خەڵکی ناوچەکە دەزانی، بە تایبەت پەیوەندیم لەگەڵ پیاوانی ئایینی بەڕێزدا، بۆیە بە باشیزانی ببمە پارێزگاری کەربەلا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری پیاوانی ئایینی بۆ شۆڕش. منیش توانیم بە نووسین پشتگیرییان بۆ شۆڕش بەدەست بێنم، لەوانە موجتەهیدی گەورە ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحەکیم و ئایەتوڵڵا عەبدولکەریم ئەلجەزائیری و ئایەتوڵڵا سەیید عەبدولحەسەن کاشیفولغیتاء و ئایەتوڵڵا عەبدولکەریم ئەلزەنجانی و ئایەتوڵڵا موحەممەد ئەلبەغدادی و بەڕێز تەقی

قەزوینی قائیمقامی قەزای نەجەف، کە ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە یارمەتیدانم بۆ بەدەستهێنانی ئەو پشتگیرییانە. هەرچی نووسراوەکانی پشتگیریم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ بەغداد، گەیشتمە وەزارەتی بەرگری بۆ بینینی عەبدولکەریم قاسم، بیرمە ئەو کاتەی گەیشتم عەبدولکەریم لە کۆبوونەوەدا بوو لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا، کات دەوروبەری نزیکەی شەشی ئێوارە بوو.

بە وەسفی تاهیری یاسەوانی عەبدولکەریم قاسمم وت: بڕۆ بە عەبدولکەریم بڵێ لە کۆبوونەوەکە بێتە دەرەوە، کارێکی گرنگ هەیە دەبێت بیزانێت. عەبدولکەریم لە کۆبوونەوەکە هاتە دەرەوە، کە بینیمی بەخێرهاتنی کردم و پێمگوت پشتگیری زانایانی کەربەلا و نەجەفم بەدەستهێناوە بۆ شۆڕش، ماچی کردم و سوپاسی کردم و دەستی توند گوشیم و وتی ئەو پشتگیرییانە زۆر گرنگن. باڵوێزی ئەمریکا لە کۆبوونەوەکەدا لێی دەپرسێت ئەگەر هەیە شۆڕش پشتگیری پیاوانی ئایینی لە باشوور بەدەستبهێنێت؟ عەبدولکەریم کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆبوونەوەکە، بە باڵوێزی ئەمریکا دەڵێت: "کاتژمێر هەشتی ئێوارەی ئەمڕۆ، ئێزگەی بەغداد بکەرەوە و گوێ لە پشتگیری زانایانی ئایینی بەڕێز بگرە بۆ شۆڕشەکەمان".

دوای کۆبوونەوەی عەبدولکەریم قاسم و باڵوێزی ئەمریکا، لەگەڵیدا دانیشتم و سدیق شەنشەلی وەزیری ئەوقافیش دانیشتبوو، عەبدولکەریم داوای لێکرد بە نامەی سوپاسگوزاری وەڵامی زانایانی ئایینی بداتەوە،

هەر کەس بە پلەی خۆیان و بە واژۆی عەبدولکەریم قاسمو نامەی پشتگیرییەکانیشیان لە ئێزگە بخوێندرێتەوە.

دوای پێکهێنانی کابینەی شۆڕش، شاندێکی فەرمی پێکهێنرا بۆ سەردانی جەمال عەبدولناسر، بە سەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف، جێگری فەرماندەی گشتی و جێگری سەرۆك وەزیران و ئەندامێتی هەریەك لە موحەممەد حەدید وەزیری دارایی و موحەممەد سدیق شەنشەل وەزیری ئەوقاف و عەبدولجەبار جەرمود وەزیری دەرەوە. ئەنجامی سەردانەکە واژۆکردنی پابەندبوون بوو بە پەیماننامەکانی نێوان میسر و عێراق و جەختکردنەوە لە پشتیوانی هەردوو وڵات بۆ یەکتر، بۆ بەرگریکردن لە هەر دەستدرێژییەك بکرێتە سەر هەر لایەکیان. لە ڕاستیدا سەردانەکە سەرکەوتوو و گرنگ بوو بۆ پشتگیری کردنی شۆڕشی ١٤ تەمموز، لە گەورەترین وڵاتی عەرەبییەوە کە جەمال عەبدولناسر ڕابەرایەتی دەکرد و سەنگ و قورساییەکی سیاسیی ڕوون و دیاری هەبوو لەسەر ئاستی جیهان. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێم: هەمانکات سەردانەکە زەنگێکی ئاگادارکەرەوە بوو لە مەترسی جیابوونەوە و لێکترازانی نێوان عەبدولکەریم و عەبدولسەلام. ڕەفتارەکانی عەبدولسەلام عارف سەرنجی شاندی عێراقی و چاودێران و خودی عەبدولکەریمی ڕاکێشا بوو، کاتێك عەبدولسەلام پێشنیاری بۆ عەبدولناسر کردبوو حەز دەکات لە خێرا ڕاگەیاندنی یەکێتیی نێوان عێراق و میسر، وەك ئەوەی عەبدولسەلام کەسی یەکەمی عێراق بێت و هیچ گوێ نەداتە عەبدولکەریم و ئەنجومەنی سیادە.

ئەوەی سەیر بوو عەبدولناسر بە دلگەرمییەوە پێشنیارەکەی وەرنەگرتبوو، داوای لە عەبدولسەلام کردبوو گرنگە یەکەمجار گرنگی بدرێت بە بەهێزکردن و پەرەپێدانی دۆخی شۆڕشەکە. کاتێك عەبدولسەلام لە سوریا وتاری دا و لە تەنیشت عەبدولناسردا ڕاوەستا بوو، بە هیچ جۆرێك ناوی عەبدولکەریمی نەهێنا، بە گوێی عەبدولکەریم گەیشتەوە، کە عەبدولسەلام عارف بە عەبدولناسری وتووە ئامادەیە عەبدولکەریم لەناو بەرێت ئەگەر لە ڕێگەی یەکێتییەکەدا وەستایەوە. بۆیە دوای گەڕانەوەی شاندەکە لە میسر هەستمان بە ساردییەك کرد لە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفدا.

وەك پێشتر باسمکرد، شاری کەربەلا و قەزاکانی بۆ من شوێنێکی نامۆ نەبوون، چوون لە ساڵی ١٩٤٧ بەڕێوەبەری تەجنید بووم تیایدا و دۆستایەتی و پەیوەندی خۆشم لەگەڵ زۆرێك لە خەڵکەکەیدا هەبوو، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە پەیوەندییەکی خێزانی کۆنمان هەبوو لەگەڵ بنەماڵەی کەمونەدا، کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی خوالێخۆشبوو باپیرم، دایکم و حەمید کەمونە برا و خوشکی شیری بوون، بۆیە حەمید کەمونە کە یەکێك لە پیاوماقوڵ و سەرۆك هۆزەکانی شارەکە بوو، خاڵی شیریم بوو.

کاتێك وەك پارێزگاری کەربەلا دەستبەکار بووم، هەستمکرد خەڵکەکەی تینووی دادپەروەریی و سەروەریی یاسان، باوەڕم وابوو پارێزگاری دەستپاك دەبێت سەرکەوتوو بێت لە کاری ئیداری خۆیدا و هیچ ڕێگەیەکی

تری نییە. هەندێك لەو کەسانەی پێشتر دەستڕۆیشتوو بوون، بارودۆخیان کەوتبووە لێژی و حیسابێکیان نەما، هەندێك خەڵکی نەناسراویش سەرکەوتن و بوون بە خاوەنی قسە لە شارەکەدا. خەڵکێك پەیدا بوون مافیان بە خۆیان دەدا لە هەموو شتێکدا قسە بکەن و سووکایەتی کردن سەریهەڵدا و بەهۆی سۆزی نیشتمانپەروەری گڕگرتووەوە یاسا لە بەرامبەر ڕەفتارە تاکەکەسییەکان لاواز بووبوو. دەمزانی شارەکە شارێکی پیرۆزە و تایبەتمەندی خۆی هەیە، دەبێت لەو لایەنەوە ڕەچاوی شێوازی ئیدارەدانی بکرێت. بۆیە یەکەم شت جەختم لێکردەوە و هەوڵم دا لە مێشکی خەڵکەکەیدا بیچەسپێنم، ئەوەبوو سوپا ئەم شۆڕشەی کردووە و هیچ کەس مافی ئەوەی نییە بە ناوی شۆڕشەوە خۆی بکات بە وەلی بەسەر خەڵکەوە و یاسا لە سەرووی هەموانەوەیە و کەس بۆی نییە موزایەدەی نیشتمانپەروەری بکات و هەرگیز ڕێگە بەوە نادەم. بە ئاشکرا خەڵکم تێگەیاند، بە توندی سزای هەر کەسێك دەدەم بیەوێت سزای خەڵکی بدات، یان بە ناوی شۆڕشەوە یا لە ژێر هەر ناو و ناونیشانێکی نیشتمانپەروەریدا سووکایەتییان پێبکات، پێویستە پۆلیس ڕۆڵ و پێگەی خۆی بزانێت لە ژیانی ڕۆژانەی شاردا. بۆ نمونە عەبدولحسەین کەمونە، کە لە سەردەمی مەلەکییەتدا پەرلەمانتار بوو، هات بۆ لام و وتی بە نیازە کەربەلا بەجێبهێڵێت و بچێت لە بەغداد بژیت، پرسیارم لێکرد بۆچی؟ وتی: "کۆمەڵێك هاتوون هەڕەشەیان لێکردووم، پەرلەمانتاری پێشوو موحەممەد عەبدولوەهابیشیان لەگەڵ بوو". پێمگوت: ڕازی نیم کەربەلا بەجێبهێڵیت، چونکە من لێرە لە کەربەلام و ئەرکی منە بتپارێزم و ناوی

ئەوانەم بدەیە هەڕەشەیان لێکردوی. ناوەکانی دامێ، پەیوەندیم بە بەڕێوەبەری پۆلیسەوە کرد و پێمگوت: ئێستا کاتژمێر دەیە، تا کاتژمێر دوازدە چاوەڕێ دەکەم، واتە تەنها دوو کاتژمێر ئەگەر ئەو کەسانە لە ماوەی دوو کاتژمێردا نەچن داوای لێبوردن لە عەبدولحسەین کەمونە بکەن و عەبدولحسەین کەمونە و مەهدی عەبدولوەهاب نەیەن پێم بڵێن لێیان ببورم ئەوا سزایان دەدەم".

دوای ماوەیەکی کەم بەڕێوەبەری پۆلیس ئەو گرووپەی هێنا کەهەڕەشەیان لە خەڵك دەکرد، هەر لەوێدا لە بەردەمیاندا سەرزەنشتی بەڕێوەبەری پۆلیسم کرد و پێمگوت: تۆ فەرمانەکان وەکو خۆیان جێبەجێ ناکەیت. من داوام لێنەکردی ئەمانە بێهنی بۆ لای من، بەڵکو داوامکرد بیانبەیت بۆ لای عەبدولحسەین و مەهدی عەبدولوەهاب بۆ ئەوەی داوای لێبوردنیان لێبکەن. بۆ ئەوەی ئەوان داوا لە دەوڵەت بکەن کە من لەم پارێزگایە نوێنەرایەتی دەکەم، لەم کۆمەڵە ئاژاوەگێرە خۆشبم. بەو جۆرە ناردمن بۆ لای هەردووکیان تا داوای لێبوردنیان لێبکەن. لە ڕاستیدا هەڵە تێگەیشتن هەبوو بۆ چەمکی شۆڕش و مانای ئازادی. بیرمە، خەڵکم لە کەربەلا و نەجەف کۆکردەوە لەسەر چەمکی شۆڕش و ئامانجەکانی و ئەو جۆرە مامەڵەیە دەبێت لە نێوان ئێمەی خەڵکی عێراقدا هەبێت، قسەم بۆکردن و پێمگوتن: من هی سەردەمی لەناوچووم. ئەو پلەی سەربازیەی لەسەر شانی من و سەرشانی زەعیم عەبدولکەریمە هی سەردەمی پێشووە و بە فەرمانی مەلیکی وەرگیراون و لە سەردەمی پێشوودا هەموومان خزمەتی عێراقمان کردووە، بەڵام دەبێت

لە ئەمڕۆوە سەرەتایەکی تازە دەست پێبکەین، ئەوەی دەیەوێت بە ناوی نیشتمانپەروەرییەوە موزایەدە بەسەر خەڵکی شارەکەی و خەڵکی وڵاتەکەیدا بکات سەری پان دەکەمەوە. هەروەها وتم: من نازانم کێ سەر بە چ کۆمەڵە و گرووپێکە، بەڵکو ئەوە دەزانم هەموومان رۆڵەی عێراقین و خزمەت بە عێراق دەکەین. هەمووان لە چەپڵەیان دا.

ناکۆکی نێوان بەرپرسانی ڕێکخراو و لایەنە سیاسییەکان دروستبوو، هەر ئەوانیش بوونە هۆی دروستبوونی پشێویی و لێکترازان لە نێوان جەماوەردا، بڕیاری گرتنی هەرچی بەرپرسانی ڕێکخراو و پارتە سیاسییە جەماوەرییەکانم دا لە پارێزگاکەدا و بڕیارم دا هەموویان لە یەك ژووردا ڕابگیرێن، پێمگوتن: هەمووتان پێکەوە لەم ژوورەدا دەمێننەوە ئەگەر دەتانەوێت دەمانچەتان دەدەمێ، بۆ ئەوەی یەکتر لەناو ببەن و خەڵکیش لە شەڕ و گێچەڵتان ڕزگاری ببێت، یان هەرچی ناکۆکییەکانە وەلاوەی بنێن.

هەرواش بوو، بەڕێوەبەری پۆلیس هات بۆ لام و پێدەکەنی و وتی: "کارەکە بەو جۆرە کۆتایی هات کە تۆ ویستت، لە نێو خۆیاندا ئاشتەواییان کرد...". فەرمانی ئازاد کردنیانم دا. بەو جۆرە ئیدارەی ناوچەکەم بەڕێوەبرد کە بەرژەوەندییەکانی دەیخواست، ئەویش گرتنەبەری ڕێگەی یاسا بوو، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی شارەکە، پێم وابوو پارێزگار نابێت لە هەموو شتێکدا بگەڕێتەوە بۆ سەرووی خۆی، دەبێت ئازاد بێت لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتەی پێی دراوە. بۆ نموونە

دوای شۆڕش، لە کاتژمێر ٣ی پاشنیوەڕۆ لە تەواوی عێراقدا قەدەغەی هاتوچۆ دەستی پێدەکرد، بەڵام کە مانگی موحەڕەمی پیرۆز هات، بە بڵندگۆ ئاگادارییەکم لە شاردا بڵاوکردەوە، کەربەلا و نەجەف، بەدەرکران لە قەدەغەی هاتوچۆ، بە بۆنەی هاتنی عاشورا و درووشمە ئایینییەکانەوە.

عەبدولکەریم قاسم پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "فوئاد چییە کەربەلا عێراق نییە؟" پێمگوت: نەخێر، کەربەلا شارێکی پیرۆزە و دەبێت رێز لە درووشم و تایبەتمەندییەکەی بگرین. بۆیە پێکەنی و ڕەزامەندی دەربڕی و ئاهەنگەکان بە ئاسایی بەڕێوەچوون. دەشێت هۆکاری سەرکەوتنم لە بەڕێوەبردنی پارێزگاکە، کاتێك دەڵێم (سەرکەوتنم) ڕاپۆرتێکی کەسیی نییە لەسەر خۆمی بدەم، بەڵکو ڕاستییێکە بە گەواهی خەڵکەکەی، کە چەند جار پێم گەیشتوون باسیان کردووە، سەرەڕای کەمی ئەو ماوەیەی پارێزگاری کەربەلا بووم، بارودۆخەکە زۆر ناسك بوو، ماوەی ململانێی نێوان شیوعییەکان و پیاوانی ئایینی و هێزەکانی تر بوو، دەتوانم بڵێم: هۆی سەرکەوتنم دەگەڕایەوە بۆ بێلایەنیم، تەواو بێلایەن بووم و تەنها نوێنەرایەتی دەوڵەتی عێراقم دەکرد، لە هیچ کەس نەدەترسام، وەك یەك ڕێگەم دەدا بە خۆپشاندانی شیوعییەکان و پیاوانی ئایینی.

بیرمە جارێکیان شیوعییەکان داوای مۆڵەتی خۆپیشاندانیان کرد و ڕەزامەندیم لەسەر داواکارییەکەیان دەربڕی، لە خۆپیشاندانەکەدا مامۆستایەکی کچ چووبووە سەر کورسییەك و عەباکەی فڕێ دابوو،

هەندێك لە خەڵكی ئەم كارەیان بە سووكایەتی بە پیرۆزییەكانی شارەكە زانی بوو، پیاوانی ئایینی لە مەزاری ئیمام حسەیندا كۆبوونەوە، بە خۆپیشاندانێك دەرچووبوون و داوای بەردبارانكردنی مامۆستا كچەكەیان دەكرد و هەندێك لە پیاوانی ئایینیش هاتبوون بۆ ماڵی ئێمە. ئەو كاتە عەبدولمەلیك ئەلرِاوی بەڕێوەبەری پۆلیس بوو، پەیوەندی پێوە كردم و دۆخەكەی تێگەیاندم، هەرزوو چوومەوە بۆ ماڵ دەبینم پیاوانی ئایینی لە ماڵدا دانیشتوون و تووڕەبوون لە چاویاندا دیار بوو، پێمگوتن: لە بنەڕەتدا پێویستی بەو خۆپیشاندانەی ئێوە نەدەكرد، ئەو مامۆستایە سەرپێچی ئوسوڵی كردووە، من وەك پارێزگارێك سزای دەدەم، یان دەیگوازمەوە بۆ دەرەوەی پارێزگا. لە ڕاستیدا من لە دڵی خۆمدا دەمویست تووڕەبوونەكەیان خاوبكەمەوە بۆ ئەوەی كێشەكە گەورەتر نەبێت، بەڵام لەناكاو یەكێك لە پیاوانی ئایینی هەستاو بە زمانێكی وتاری وتی:

– ژن شەیتانە.

– ژن خوشكی شەیتانە.

– ژن دوژمنی خوایە... هتد

وتم: ببوورە جەناب، ژن دایكتە، ژن خوشكتە، ژن خێزانتە، ژن كچتە، ئەگەر بەو جۆرە بێت تۆ دەیڵێیت، كەواتە تۆ كوڕی شەیتانی و برای شەیتانی و مێردی شەیتانی و باوكی شەیتانی، فاتیمەی زەهرا و زەینەب و هەموو خێزانەكانی پێغەمبەر هەموویان شەیتانن، لە كاتێكدا ژن دایك و خوشك و كچمانن، تۆ كوفر و گوناهت كرد بەرامبەر هەموو ئەوانە. تۆ لە

پێش ئەو مامۆستا کچە دەبێت بەردباران بکرێیت، بۆیە ئێستا نامەیەك بۆ ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحەکیم دەنووسم، هەموو ئەو قسانەی تۆی تێدا دەنووسم لە بەرامبەر ژندا وتووتە، تا بزانم بۆچوونی چی دەبێت لەسەر بابەتەکە. هەرچی پیاوانی ئایینی مەجلیسەکە پشتگیرییان کردم، کابراش لێی دانیشت و بێدەنگ بوو، دوای ئەوەی چوونە دەرەوە و بڵاوەیان بە خۆپیشاندەران کرد.

فرمێسکەکەی عەبدولرەزاق مەرجان

بەر لەوەی ببمە پارێزگاری کەربەلا، لە ساڵی ١٩٥٧ فەرماندەی حامییەی حیللە بووم، زۆرێك لە پیاوماقوڵانی شارەکەم دەناسی، لەوانە عەبدولڕەزاق مەرجان باوکی عەبدولوەهاب مەرجان، کە پیاوێکی بەڕێز و شکۆمەند بوو، بە تایبەت لە جلوبەرگدا، لە مامەڵەکردنیشی لەگەڵ هەموو چینەکانی خەڵکدا زۆر بەڕێز بوو. ماڵیان لە بەرامبەر یانەی سەربازی بوو، لە نزیکی شوێنی مانەوەم. دەمبینی چۆن بەڕێزەوە پێشوازی لە چین و توێژەکان دەکات و تا ژوورەوەی لەگەڵیان دەڕوات. یارمەتی هەژارانی دەدا، ئەوەی من بزانم هاوکاری قوتابیانی زانکۆی دەکرد، بە تایبەت ئەوانەی لە ناوخۆ و دەرەوەی عێراق دەیانخوێند. تەنانەت هێندە شار و خەڵکی شارەکەی خۆشدەویست، نەخۆشخانەیەکی ئەهلی بە ناوی بنەماڵەکەیەوە لە شارەکەیدا دروستکرد، بەڵام دوای شۆڕش ئەو پیاوە بەڕێزە ڕووبەڕووی سووکایەتی بووەوە. ڕۆژێك هات بۆ لام بۆ کەربەلا و بەر لەوەی گلەیی لە دۆخەکە بکات، فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتنە

خوارەوە و کەوتنە سەر ڕیشە سپییەکەی، کە لە ناخەوە هەژاندمی و یەکسەر پەیوەندیم بە پارێزگاری حیللە عەمید عەبدولوەهاب شاکرەوە کرد دەربارەی بابەتەکە، کە زانیم هیچ کارێکی نەکردووە بۆ ئەوەی دەستدرێژی نەکرێتە سەر عەبدولڕەزاق مەرجان، لە لای خۆمەوە ڕێکاری خێرام گرتەبەر بۆ وەستاندنی دەستدرێژیکاران، ئەوانەی لە شەو و ڕۆژێکدا هەموو چاکەکانی ئەو پیاوە بەڕێزەیان لە بیر کردبوو. کەسانی تری ناوچەکە وەك سەیید میرزا ئەلقەزوینی و ئەنوەر جەوهەر سەرۆکی ژووری بازرگانی حیللە و شێخ موحسین ئەلجەریان و هی تریش لە پیاوانی بەڕێزی ناودار تووشی سووکایەتیی هاوشێوە بوونەوە، بەڵام وەك پابەندبوونێکی ئەخلاقی لەگەڵیاندا وەستام و پشتگیریم کردن. بیرمە شێخ موحسین ئەلجەریان لە ساڵی ١٩٥٩ تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووبوو، فریادی کوڕیشم لەو ماوەیەدا نەخۆشکەوت، لە کاتی ڕێکخستنی کاروباری سەفەری فریادی کوڕم بۆ لەندەن، بە پێویستم زانی یارمەتی شێخ موحسینیش بدەم بۆ ئەوەی بچێتە لەندەن، لە لەندەن بە تایبەت لە نەخۆشخانە سەردانیم کرد، لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا بوو و باری تەندروستی زۆر خراپ بوو، داوای کرد کارێك بکەم بۆ ئاسانکردنی سەفەری کوڕ و براکانی بۆ لەندەن، لە لەندەنەوە بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە عەبدولکەریم قاسمەوە کرد، داواکارییەکەی قبووڵ کردم، لە چەند ڕۆژێکی کەمدا کوڕ و براکانی گەیشتنە لەندەن، کە بینییان باری تەندروستی شێخ خراپە هێنایانەوە بۆ بەغداد و دوای چەند ڕۆژێکی کەم کۆچی دوایی کرد.

## سەردانی عەبدولسەلام عارف بۆ کەربەلا

لە ڕۆژانی سەرەتای شۆڕشدا عەبدولسەلام هاتە کەربەلا، جەماوەرێکی زۆر کۆبوونەوە، زۆر دوودڵ بووم لەوەی چی دەڵێت، دەمزانی عەبدولسەلام عارف وتاربێژێکی سەرکەوتوو نییە، چونکە وتارەکانیم لە پارێزگاکانی تر بیستبوو. هەر کە دەستی بە وتاردان کرد، هەستمکرد هەڕەمەکی و بە شێوەکەی خۆی قسە دەکات، چپاندم بە گوێیدا و ئاگادارم کردەوە، بەڵام سوودی نەبوو، دەنگی بەرز کردەوە، شتگەلێکی وت ئێستا لە بیرم نەماوە، هەستمکرد گوناهە من لەگەڵ چەند بەرپرسێکی گەورەی پارێزگاکەدا لە تەنیشتی وەستاوین، بۆیە هەرزوو شوێنەکەم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ ماڵ، بە بەڕێوەبەری پۆلیسم وت هەر کە وتارەکەی تەواوکرد بیهێنەوە بۆ ماڵەوە.

عەبدولسەلامیان هێنایەوە و پێکەوە دانیشتین، پرسیاری کرد: "نەخۆش بوویت؟" وتم: نەخێر. وتی: "ئەی بۆچی ستەیجت بەجێهێشت؟" وتم: بەهۆی وتارەکەتەوە کە هیچ تام و چێژێکی تێدا نەبوو! ئیتر بێدەنگ بوو. عەبدولسەلام لە وتارداندا کۆنترۆڵی خۆی نەدەکرد، عەبدولکەریم قاسم چەندین جار لەو بارەیەوە ئاگاداری کردەوە، بەڵام سوودی نەبوو.

## تێکچوونی پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و ڕۆڵم لە کەمکردنەوەی ناکۆکییەکە

لە مانگەکانی سەرەتای شۆڕشدا نیشانەکانی ململانێ وردە وردە بەدەرکەوتن. بە دوو هۆکار: یەکەمیان دەگەڕایەوە بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ لە ژیانی ئەفسەرانی ئازادیخواز و دووەمیان پەیوەندی بە بارودۆخی جێبەجێکردنی شۆڕشی چواردەی تەمموزەوە هەبوو، بە هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە لەلایەن عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفەوە، بەبێ ئاگادارکردنی ئەڵقەکانی تری ئەفسەرانی ئازادیخواز.

وێڕای ڕێککەوتنیان و کۆدەنگییان لەسەر ئەنجامدانی شۆڕش و ڕووخاندنی حوکمی پاشایەتی، بەڵام ئەفسەرانی ئازادیخواز سەر بە دوو قوتابخانە بوون، قوتابخانەی یەکەم: قوتابخانەی بەکر سدقی، کە هەریەك لە عەبدولکەریم قاسم و فازڵ عەبباس ئەلمەهداوی و کۆمەڵێکی تر لە ئەفسەران کاریگەر بوون پێی.

عەبدولکەریم قاسم کاریگەر بوو بە بەکر سدقی و موحەممەد عەلی جەوادی پوورزای، فەرماندەی هێزی ئاسمانی، کە لە دڵسۆزترین ئەفسەران بوو بۆ بەکر سدقی و لەگەڵیدا لە موسڵ کوژرا، بۆچوونی ئەو ئەفسەرانە بۆچوونێکی ناسیۆنالیستی نەبوو، یان ئەگەر نەتەوەیی بووبن بە ئاستی ئاراستەی دووەم نەبوون، بۆچوون و ئاراستەیان زیاتر چاوی لەسەر عێراق بوو. قوتابخانەی دووەم: بۆچوونی سەلاحەدین سەباغ و گرووپەکەی بوو، کە ژمارەیەك ئەفسەر کاریگەر بوون پێیانەوە، لەوانە عەبدولسەلام و ئەوانی تر. هەر لەو کاتەوەی ئەفسەرێکی بچووك بوون، کاریگەر بوون بەو گیانی نەتەوەییەی کە سەلاحەدین سەباغ و گرووپەکەی

دەستیان پێکرد، بەڵام ناکۆکی ئەو ئەفسەرانە، مەبەستم جیاوازی ئەو دوو قوتابخانەیە بە شاراوەیی مایەوە، چونکە پێش شۆڕش دۆخێکی وا نەهاتبووە پێش، ناکۆکییەکان یان ئیجتیهادەکان لەسەر بابەتی یەکێتیی عەرەبی بەدەربکەون. بۆیە شتێکی سرووشتی بوو ئەو دوو بۆچوونە سیاسییە مەشخەڵەکانی لە دوای هاتنەکایەی تاڕادەیەك ئازادی دوای شۆڕش خۆیان بە دیار بخەن.

بابەتی باس نەکردنی ئەنجامدانی ڕۆژی شۆڕشەکە و نەدرکاندنی نهێنییەکەی ڕەنگە لەبەر سەرکەوتنی شۆڕشەکە بووبێت، کە هەندێك پێیان وایە لێکەوتە خراپەکانی لەوەودوای، بوو بەهۆی دروستکردنی درزێکی گەورە لە نێوان ئەفسەرانی ئازادیخوازدا.

سەبارەت بە دروستنەکردنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، لە ڕێگەی پەیوەندی ڕاستەوخۆم لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەفسەرانی ئازادیخواز، دەمزانی ڕێککەوتن لە سەر دامەزراندنی سەرکردایەتی شۆڕش ژمارەیەك لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئەفسەرانی ئازادیخواز و دەستەی باڵای بزووتنەوەکە لەخۆدەگرێت، وێڕای ئەو ئەفسەرانەی شۆڕشەکەیان بەرپاکرد، واتە سەرکردە ڕاستەقینەکان لە ڕۆژی شۆڕشەکەدا، بەڵام شتێکی لەو جۆرە ڕوووینەدا. بۆیە بۆڵەبۆڵ لە نێو ئەفسەراندا دروستبوو، بە تایبەت ئەو ئەفسەرانەی چاوەڕوان دەکرا ناویان لەو ئەنجومەنە چاوەڕوانکراوەدا هەبێت.

ئەوەندەی من ئاگاداربم چی لە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام

عارف گوزەرا دەربارەی پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنە کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوانیان، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی هەردووکیان بڕوای تەواویان نەبوو بە پێکهێنانی ئەنجومەنەکە، هەرچەندە هەریەکە و ئەوی تری تۆمەتبار دەکرد، بە حەزنەکردن بە پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنە، بەڵام لە یەکەم کۆبوونەوەی نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف دوای تێکچوونی پەیوەندی نێوانیان، کە ویستم ئاشتیان بکەمەوە وەك پێشتر باسمکرد، عەبدولکەریم قاسم بە عەبدولسەلام عارفی وت: "کاتێك ویستمان ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پێکبهێنین، تۆ دژی وەستایت و قبووڵت نەکرد، کەچی ئێستا داوا دەکەی پێکیبهێنم، من لە ئێستادا هاوڕا نیم لەگەڵت بۆ پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنە".

پێم وایە عەبدولسەلام عارف بۆیە لە سەرەتادا دژایەتی پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کردبوو، لەو کۆبوونەوەیەی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا، دووبارە جەخت کردنەوە بوو لەوەی بۆچی ئەو کەسانە دەهێنێتە پێشەوە کە بە کردار لە نێو شۆڕشەکەدا نەبوون؟

واتە عەبدولسەلام دەیویست ئەنجومەنەکە لەو کەسانە پێکبهێنرێت کە بەکردار بەشداربوون لە جێبەجێکردنی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨، ئەمە مانای ئەوە بوو عەبدولکەریم چەند ناوێکی پێشنیار کردبێت کە بە کردار بەشدارییان لە شۆڕشەکەدا نەکردبێت. ئەمە دەشێت تەنها دەرئەنجامبێت، دەشێت عەبدولکەریم قاسم ویستبێتی بەشداری بە هەندێك هێزی نیشتمانی عێراق لە سەرکردایەتی شۆڕشدا بکات. لە

لایەکی ترەوە دەنگۆیەك هەبوو، گوایە کاتێك عەبدولسەلام دووبارە داوای پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی کردووە، عەبدولکەریم داوای لێکردووە ئەو ناوانە پێشکەش بکات، کە پێشنیاریان دەکات بێنە ئەنجومەنەکەوە، کاتێك ناوەکان پێشکەش دەکات هەموویان لە لایەنگرانی خۆی دەبن، ئا لێرەدا عەبدولکەریم قاسم ترسی لا دروستدەبێت و هەر لە بنەڕەتەوە بیرۆکەی دروستبوونی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ڕەتدەکاتەوە.

لێرەوە ناکۆکی و لێکترازانی زیاتر لە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفدا دروست دەبێت، بەر لە ئاشکرابوونی ناکۆکییەکە، قسە و باسێك لەسەر ناکۆکییەکە لە نێوان ئەو ئەفسەرانەی بە دەوریانەوە بوون دەکرا، بەڵام لە سەرەتای تشرینی یەکەمی، یەکەم ساڵی شۆڕشدا بە تەواوی بەدەرکەوت و ئاشکرا بوو.

تاهیر یەحیا هات بۆ کەربەلا، ئەو کاتە بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس بوو، پێیگوتم: "فەرماندەی فیرقەکان لە بەغداد کۆبوونەوەیان کرد، بەڵکو ناکۆکی نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف نەهێڵن. دەمەوێت لەگەڵمدا بێیت بۆ بەغداد بۆ ئەوەی پێکەوە بتوانین سنوورێك بۆ ئەو ناکۆکییە دابنێین". بەڕاستی ڕۆڵی تاهیر یەحیا لەو بارەیەوە برایانە و ڕاستگۆیانە بوو. دەیویست شۆڕشەکە بپارێزێتK مەبادا بارودۆخەکە تێکبچێت، بۆیە لەگەڵی چووم بۆ بەغداد و ڕاستەوخۆ بۆ وەزارەتی بەرگری، عەبدولکەریم لەوێ نەبوو. بە باشمان زانی بچین بۆ ماڵی

عەبدولسەلام، كە چووین بینیمان زۆر قەڵس و تووڕەیە، پێشوازی لێكردین، بە تووڕەییەوە وتی: "من شۆڕشم كرد و داگیركەرم لە عێراقدا لەناوبرد، ئێستا سدیق شەنشەل دێت فەرمانی دامەزراندنم وەك باڵوێز لە بۆن بۆ دەردەكات". ئەو كات شەنشەل وەزیری دەرەوە بوو بە وەكالەت لە شوێنی عەبدولجەبار جەرمود. ئەمجا وتی: "من ژنەكەم نەخۆشە و نارۆم". لەگەڵ تاهیر یەحیا هەوڵمان دا لە تووڕەییەكەی كەم بكەینەوە و پێیگوت: "ئێمە براتین و تۆ و عەبدولكەریمیش بران، لەگەڵمان وەرە دەچین بۆ لای عەبدولكەریم قاسم و پێكەوە دانیشن، بەڵكو ئەو كێشانەی نێوانتان چارەسەر بكەن. ئێمە هیچ بیانوویەك بۆ ئەم ناكۆكییەی نێوانتان نابینین بە تایبەتی كە ناكۆكییەكی كەسیی نییە، چونكە دەرئەنجامەكانی خراپ دەكەوێتەوە لەسەر شۆڕش و ئامانجەكانی. ئەمجا بوونی ئەم ناكۆكییە هەرچی ئەو كەسانەی لە دەوری شۆڕش كۆبوونەتەوە تووشی نائومێدی دەكات". عەبدولسەلام لەگەڵمان هات و كاتێك گەیشتینە بینای وەزارەتی بەرگری تاهیر یەحیا وتی: "من دەچم بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس و بە پێویستی نازانم لەگەڵتان بم". من و عەبدولسەلام چووینە وەزارەتی بەرگری، عەبدولكەریم هێشتا نەهاتبووەوە، لە ژوورەكەی ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی حاكمی گشتی سەربازی چاوەڕێمان كرد، داوام لێكرد پەیوەندی بە عەبدولكەریم قاسمەوە بكات كە چاوەڕێی دەكەین، پەیوەندی پێوەكرد و عەبدولكەریم قاسم دوای نزیكەی نیو سەعاتێك هاتەوە. داوام لە ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی كرد عەبدولسەلام بباتە لای عەبدولكەریم قاسم، بە باشم زانی لەگەڵیدا نەچمە ژوورەوە، مەبادا

هەندێك قسەی تایبەت یان گلەیی و گازندە لە یەکتر لە نێوانیاندا بچێت، لە ژوورەکەی ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی مامەوە. دەبینم عەبدولکەریم لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە و هات بۆ ئەو ژوورەی لێی دانیشتبووم، دەستی گرتم و وتی: "فوئاد حەز دەکەم لەو دانیشتنەی نێوانمان تۆش ئامادە بیت". چوومە ژوورەوە، هەستمکرد حەزی کرد من لە نێوان خۆی و عەبدولسەلامدا بم، نەك ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی. گوێم لێبوو عەبدولکەریم قاسم پێیگوت: "ئەحمەد ڕەنگە لە نوسینگەکەت کارت هەبێت و بتەوێت تەواوی بکەیت بچۆ بۆ ژوورەکەت". ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی هەستا و سڵاوێکی سەربازیی گرتەوە، ئەمجا گفتوگۆ لە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفدا دەستیپێکرد.

عەبدولسەلام عارف گازندەی ئەوەی لە عەبدولکەریم قاسم دەکرد کە ڕێگەی داوە بە کەسانێك هیچ پەیوەندییەکیان بە شۆڕشەوە نییە و نابێت دەست لە کاروبارەکانی وەربدەن، مەبەستی هەندێك لەو کەسایەتییە نیشتمانپەروەرانە بوو عەبدولکەریم هاوسۆز بوو لەگەڵیان و بەشێکیانی هێنابووە ناو کابینەکەیەوە و گوزارشتی لە سەنگ و قورساییان دەکرد. قاسمیش عەبدولسەلام عارفی تاوانباردەکرد بەوەی خەریکی تەکەتول و پێڕبازییە و ئەفسەرانی لێهەڵدەگەڕێنێتەوە و ئاراستەیەکی دژی بۆ دروستدەکات. لۆمەی دەکرد لەسەر پەیوەندییەکانی و هەندێك بڕیاردانی تاکەکەسیی و هەندێك وتاردان لە خۆیەوە کە گوزارشت لە بۆچوونی شۆڕش ناکات، نابێت بەو شێوە هەڕەمەکی و لەخۆوە قسە بکات، ڕۆڵی من لەو کۆبوونەوە گەرموگوڕەدا هێورکردنەوەی هەردوولا و گفتوگۆیەکی

هێمنانە بوو لە نێوانیاندا. لە ڕاستیدا خۆم لە نێوانی دوو هێزدا بینییەوە، پێم وابوو بە ئاسانی ناگەنە ڕێککەوتن وەك لە سەرەتاوە پێشبینیم کردبوو، عەبدولسەلام وای دادەنا ئەو شۆڕشەکەی کردووە و بەیانی ڕۆژی چواردەی تەمموز یەکەم کەس بووە چۆتە ناو بەغدادەوە و یەکەم بەیانی ڕاگەیاندنی کۆماری لە ئێزگەی بەغداد خوێندووەتەوە. ئەو سەرکەوتنە سەربازییەی کە مقاوەمەیەکی سەربازی ئەوتۆی لە بەرامبەردا نەکرا، وایکرد عەبدولسەلام هەست بە نەخۆشی خۆبەزلزانین بکات. تا ئەو ڕادەیەی هەرچی وێنە ڕاستەقینەکانی ڕێکخستنەکانی ئەفسەرانی ئازادیخواز و تەواوی هۆکار و ئەو بەشداریکردنانەی زەمینەیان خۆشکرد بۆ سەرکەوتنی شۆڕش، لەبەرچاو نەگرێت.

لە سەرەتای شۆڕش کار گەیشتە شوێنێك خۆی لە عەبدولکەریم قاسم بەرزتر دادەنا و گوایە ئەو سەرۆکی ڕێکخراوەکەیە، بە ئاشکرا و هەندێك جار بە مەبەست وا مامەڵەی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا دەکرد، وەك ئەوەی پلەی لەو نزمتر بێت. لە سەرەتادا عەبدولکەریم قاسم ئەو ڕەفتارەی لێقبووڵ کرد، عەبدولسەلام عارف وتەبێژی شۆڕش بوو. بە شارەکاندا دەگەڕا و وتاری دەدا دەربارەی ئایندەی شۆڕش و پەیوەندی بە کۆماری عەرەبی یەککگرتوو – میسر–ەوە، بێئەوەی هیچ حیسابێك بۆ ڕاوبۆچوونی عەبدولکەریم قاسم بکات، لە کاتێکدا عەبدولکەریم لە وەزارەتی بەرگری دەمایەوە، بەڵام عەبدولکەریم قاسم نەیتوانی لەوە زیاتر لە عەبدولسەلام عارف ئارام بگرێت، کە تا دەهات لەسەری دەڕۆیشت. پارتە نیشتمانییەکانیش دوو ئاڕاستەیان وەرگرتبوو لە

گەرمترکردنی ناکۆکیی نێوان هەردووکیان، نەتەوەییەکان لایەنگریی عەبدولسەلامیان دەکرد و بە ئاڕاستەیەکدا دەیانبرد، هێزە نیشتمانپەروەرییەکانی تر کە لایەنگری یەکبوون یان یەکبوونی خێرا نەبوون، بە ئاڕاستەیەکی تردا پشتیوانییان لە عەبدولکەریم دەکرد.

ئەو هێزە نیشتمانییانەی پشتیوانی عەبدولسەلامیان دەکرد بریتیبوون لە وەحدەوییەکان و پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی و نەتەوەپەرستە عەرەبەکان و ئیخوانول موسلمین و زۆرینەی ئەو بێلایەنانەی حەزێکی نەتەوەیی یان ئایینییان هەبوو، بەڵام ئەو هێزە نیشتمانپەروەرانەی پشتگیری عەبدولکەریم قاسمیان دەکرد بریتیبوون لە شیوعییەکان و نیشتمانی و دیموکراسی و پارتی دیموکراتی کوردستان و زۆرێك لە دیموکراتییەکان، کە هیچ بیانوویەکیان نەدەبینی لە دروستبوونی یەکێتییەکی خێرا، بەڵکو لە بنەڕەتدا هەر بڕوایان بە یەکبوون نەبوو.

بەڵام چ گفتوگۆیەك لە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفدا چوو و چۆن کۆتایی هات؟ بە باشم زانی ماوەیەك بە تەنیا بەجێیان بهێڵم، لەوانەیە هەندێك نهێنی لە نێوانیاندا هەبێت و بیانەوێت دوو بە دوو بیڵێن، بۆیە مۆڵەتم لێوەرگرتن و هاتمە دەرەوە، هەر کە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و چوومە ژووری سکرتێر، دەبینم ناجی تالب و محێدین عەبدولحەمید و عەبدولعەزیز ئەلعەقیلی و نازم تەبەقچەلی و عەبدولوەهاب دانیشتوون، زۆریان بەلاوە سەیر بوو بەجێمهێشتن و لە ژوورەکەی عەبدولکەریم قاسم هاتمە دەرەوە. تا ئەو ڕادەیەی لیوا ڕوکن ناجی بە

کاڵتەوە پێیگوتم: "ئەبو فەرهاد چێشتەکە پێگەیشت؟". وتم: نەوەڵا. لەو کاتەدا عەبدولکەریم بانگی کردم: "فوئاد تۆ لە کوێیت بۆ کوێ چوویت؟". زانیم حەز ناکات بەجێیان بێڵم، یان دەترسێت بە تەنیا بێت لەگەڵ عەبدولسەلام عارفدا، بۆیە خێرا گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی و دەرگاکەم لە دوای خۆمەوە داخست و خۆم خەریك کرد بە سەیرکردنی هەندێك وێنە کە بە دیواری ژوورەکەدا هەڵواسرابوون، گفتوگۆی نێوانیان زۆر توندبوو، گوێم لێبوو عەبدولکەریم قاسم بە دەنگی بەرز دەیگوت: " عەبدولسەلام تۆ لە ڕۆژی چوارەمی شۆڕشەوە خیانەتت لە شۆڕش کرد". ڕووم بۆ لای عەبدولکەریم قاسم وەرگێڕا دەبینم پەڕەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و دەیگوت: "ئەم بروسکەیە عەبدولمەجید فەرید پاشکۆی سەربازی میسری لە بەغداد ناردوویەتی بۆ سەرۆك جەمال عەبدولناسر". هەندێك لایەن توانیبوویان دەستبگرن بەسەر بروسکەکەدا و بینێرن بۆ عەبدولکەریم قاسم، دەقی بروسکەکە، کە عەبدولکەریم خوێندیەوە دەیگوت: "پەیوەندیم کرد بە عەبدولسەلام عارفەوە، سوورە لەسەر ئەوەی هەرزوو یەکگرتن لە نێوان عێراق و میسردا بکرێت و عەبدولکەریم قاسم ناچار بکات ئەو یەکێتییە قبووڵ بکات، ئەگەر ڕازی نەبێت ئەوا لەناوی ببات". لەپڕ گوێم لێبوو عەبدولکەریم هاواری کرد: "کورە ئەوە چی دەکەیت؟!". ڕووم بۆ لای عەبدولسەلام وەرگێڕا دەبینم دەمانچەی ڕاکێشاوە و هێرشی کردە سەر عەبدولکەریم قاسم، پەلامارم دا و دەستم بادا و دەمانچەکەم لەدەست دەرهێنا، عەبدولسەلام دەیویست مقاوەمە بکات، بەڵام کۆنترۆڵم کرد و کەوتە سەر زەویەکە و دەستیکرد بە گریان.

دەنگەدەنگەکە لە ژوورەکەی عەبدولکەریم قاسمدا، بوو بەهۆی کردنەوەی دەرگاکە و هاتنە ژوورەوەی هەرچی ئەوانەی لە ژووری سکرتێرەکەیدا دانیشتبوون، وێڕای عەبدولکەریم جدە فەرماندەی ئینزیباتی سەربازی و وەسفی تاهیر پاسەوانی عەبدولکەریم قاسم، یەکەم کەس محێدین عەبدولحەمید هاتە ژوورەوە، عەبدولسەلام لەسەر زەوییەکە ڕاکشا بوو و دەگریا، منیش هەرچی دەمانچەکەیە لە فیشەکەکانی بەتاڵم کرد.

عەبدولکەریم هاواری دەکرد: "ئەگەر تۆ نەبوویتایە عەبدولسەلام دەیکوشتم". عەبدولسەلام وتی: "من نیازم کوشتنی تۆ نەبوو". عەبدولکەریم قاسم وتی: "ئەی کەواتە بۆچی دەمانچەت ڕاکێشا؟". عەبدولسەلام وتی: "دەمویست خۆم بکوژم". عەبدولکەریم وتی: "ئەگەر دەتەوێت خۆت بکوژی، لە ماڵی خۆتا خۆت بکوژە، بەڵام ڕاکێشانی دەمانچە لەبەردەم سەرۆک وەزیراندا تاوانێکە لەسەری لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکرێت".

لە ڕاستیدا من ناتوانم عەبدولسەلام عارف تاوانبار بکەم بەو هەوڵی کوشتنە، هەر ئەمەشم لە بەردەم دادگای سەربازیدا وت. دوای دەرکردنی دەمانچەکە لە دەستی عەبدولسەلام عارف، عەبدولکەریم قاسم وتی: "دەزانم پیلانێك هەیە بۆ کوشتنم و تەکەتولێك بە ڕێنومایی عەبدولسەلام عارف دەیانەوێت بمکوژن". بەهەرحاڵ تا ئێوارە ماینەوە، بیرمە موحەممەد ئەلشەوافیش هات و هەمووان هەوڵیان دەدا قەناعەت بە

عەبدولسەلام عارف بکەن، ئەگەر بە شێوەیەکی کاتیش بووە، بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك بچێت بۆ بۆن، تا ئەو کاتەی بارودۆخەکە دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی.

دوای ئەوە تاهیر یەحیا هات و عەبدولسەلام عارفی بردەوە بۆ ماڵ، بیرمە عەبدولسەلام تکای لێکردم داوا لە عەبدولکەریم قاسم بکەم بەیانی ئەو ڕۆژەی سەفەر دەکات بێتە فڕۆکەخانە و بەڕێی بکات. واتە ڕۆژی دواتر، لەبەر چەند ئیعتیبارێك بۆ ئەوەی خەڵکی وا نەزانن بێڕێزییێکە بۆ کەسایەتی عەبدولسەلام عارف، پێمگوت: من هەوڵدەدەم فەناعەت بە عەبدولکەریم بکەم بێتە فڕۆکەخانە بۆ بەڕێکردنت، پشت بەخوا بۆ بەڕێکردنت هەمووومان لەوێ دەبین.

دوای ئەوە عەبدولسەلام ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، شەو درەنگی کردبوو، عەبدولکەریم داوای لێکردم لەگەڵیدا بمێنمەوە. جێگەی خۆیی دامێ و خۆی لە سەرزەوییەکە خەوت، بەر لەوەی بنووین عەبدولکەریم پێیگوتم: "وەڵا، فوئادی برام، لەو کاتەوە شۆڕش کراوە من و عەبدولسەلام لەم ژوورەدا پێکەوە دەنووین و وەك چۆن جێگەکەی خۆمم بە تۆ دا، ئاوا جێگەکەی خۆمم بەو دەدا و خۆم لە زەویدا دەخەوتم، بەڵام جیاوازی نێوان تۆ و ئەو ئەوەیە، کاتێك ئەو لە ژوورەکەمدا دەنووست، دەخەوتم و دەستم لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەم بوو لە ترسی ئەوەی نەوەك بمکوژێت، بەڵام ئەمشەو بەبێ ترس دەنووم". هەوڵم دا بۆچوونی خراپی لەسەر عەبدولسەلام کەمبکەمەوە، داوام لێکرد لەگەڵمان بێت بۆ

بەڕێکردنی عەبدولسەلام لە فرۆکەخانە، ڕازی بوو، بەیانییەکەی پێکەوە چووین بۆ بەڕێکردنی و فەرماندەی فیرقەکانیش هاتبوون.

دوای ڕۆیشتنی عەبدولسەلام عارف، عەبدولکەریم قاسم پێیگوتم: "فوئاد بینیت هەڵوێستی عەبدولسەلام لە بەرامبەر مندا چۆن بوو؟ هەر لەسەرەتای شۆڕشەوە بە هەموو شێوەیەك دەیەوێت لە من ڕزگاری ببێت، تەنانەت ئەگەر بە کوشتنیش بێت، لە کاتێکدا من هێنامە ناو ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازەوە و لە شوێنێکی ڕێکخراوەکانی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا دامنا. لەسەر داوا و قسەی من برادەران قبووڵیان کرد، چونکە کەسێکی ناجێگیرە، وا ئێستا پاداشتی ئەوەی کردوومە وەردەگرمەوە". بەهەرحاڵ، پرسیارم لە عەبدولکەریم قاسم کرد کێ جێگەی عەبدولسەلام عارف دەگرێتەوە؟ بیرێکی قووڵی کردەوە و وتی: "عەمید ڕوکن ئەحمەد موحەممەد یەحیا لە بەغدادە؟" وتم: بەڵێ. وتی: "پێت چۆنە ببێتە وەزیری ناوخۆ؟". وتم: کارێکی باش دەکەیت. لە ڕاستیدا بڕیار بوو ئەحمەد موحەممەد یەحیا بکرێتە پارێزگاری سلێمانی، چووم بۆ لای لە یەکێك لە ئوتێلەکانی بەغداد دابەزی بوو، هەواڵم دایە، عەبدولکەریم قاسم حەز دەکات ببیتە وەزیری ناوخۆ، ئەویش قبووڵی کرد و دوای چەند ڕۆژێك مەرسومی کۆماری بۆ دەرکرا.

عەبدولسەلام کە زانیی کراوەتە باڵوێزی عێراق لە بۆن، دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لە پۆستە تازەکەی پێشکەشکرد، کاتێك عەبدولکەریم قاسم دەست لەکارکێشانەوەکەی وەرگرت، دڕاندی و فڕێی

دا. عەبدولسەلام عارف بۆیە لە پۆستەکەی دەستی لەکارکێشایەوە، توورەبوو لەوەی دەیگوت: "من شۆڕشم کرد و سدیق شەنشەل فەرمانی دانانی من بە باڵوێز دەریکات؟!". ئەو کات سدیق شەنشەل وەزیری ئیرشاد و وەکیلی وەزیری دەرەوە بوو.

## هەڵوێستم لە بەرامبەر بڕیارەکانی لەسێدارەدان

دوای ئەوە عەبدولکەریم قاسم، عەبدولسەلامی لە گۆڕەپانی سیاسیی دوورخستەوە، جادە بۆ لایەنگرانی لە شیوعییەکان و ئەوانی تر هامار بوو. حیزبی شیوعی گۆڕەپانەکەیان کۆنترۆڵ کرد و دەستیانکرد بە دژایەتیکردنی هەرچی ئەو پارتانەی دژی عەبدولکەریم قاسم بوون، عەبدولکەریم قاسم وایدەزانی حزبی شیوعی لە پێناوی ئەودا وا دەکەن، نەیدەزانی لە پێناو خۆیان و قایمکردنی جێپێی خۆیان بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی حزبی ئەوە دەکەن، ئەم و ئەویان تۆمەتبار دەکرد بە دژایەتیکردنی کۆمار و داوایان دەکرد بدرێنە دادگای گەل.

دادگای گەل دەستیکرد بە دادگاییکردنی تۆمەتبارکراوان و سزای قورسی لەسەریان دەردەکرد. ڕەنگە زیادەڕۆییم نەکردبێت، ئەگەر بڵێم پێم وابوو عەبدولکەریم ڕازی نابێت بە لەسێدارەدانی هیچ کەسێك بە هۆکاری سیاسیی، ئەوە بۆچوونی من بوو لەسەر ئەو پیاوە بەر لە شۆڕش و دوای شۆڕشیش. عەبدولکەریم کەسێك بوو بڕوای بە دیموکراسییەت و گفتوگۆ هەبوو، بەڵام ڕۆژگار وایکرد لەسێدارەدانی کەسانێك ببینین کە بەشدارییان کردبوو لە شۆڕشدا، یان ئامادەکارییان تێدا کردبوو و هاوڕێ و

دۆستی عەبدولکەریمیش بوون.

لە ڕاستیدا جێبەجێکردنی لەسێدارەدان و بە تایبەت شەهیدانی (ام الطبول) برینێکی گەورەی لەسەر دڵم دروستکرد، دەتوانم بڵێم یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ساردبوونەوەی پەیوەندی نێوان من و عەبدولکەریم قاسم لەسێدارەدانی ئەو شەهیدانە بوو، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە عەبدولکەریم قاسم ئەو کەسانەی لەسێدارە نەدا، کە هەوڵی تیرۆرکردنیان دا، بەو میتۆدەی دەیگوت: (عفا الله عما سلف) ئەو وتەیە لە سەردەمی ئەودا کەوتە سەر زاران و لە زاری ئەوەوە بڵاوبووەوە. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە سەرسوڕمانی گەورە لەوەدا بوو، بینیمان عەبدولکەریم حوکمی لەسێدارەدان بەسەر چەند بەندکراوێکدا جێبەجێ دەکات، کە پێمان وابوو جێبەجێکردنی دوادەخرێت، یان لەبەر چەند هۆکارێك سزاکەیان کەم دەکرێتەوە، بەڵام وا دەردەکەوێت چەند هۆکارێك ڕۆڵیان هەبوو لە ڕق هەستاندنی زیاتری عەبدولکەریم قاسم، تا ئەو ڕادەیەی لە ڕەفتار و سرووشتی ئاسایی خۆی دەربچێت. بە بۆچوونی خۆم وەك ئاماژەم پێدا حەزی نەدەکرد بە لەسێدارەدانی هیچ کەسێك، مەبەستم لە هۆکارەکان لێرەدا ئەو فشارانەن کە کاریگەرییان لەسەری دادەنا. حزبی شیوعی عێراقی بێگومان لەو بارەوە ڕۆڵی گەورەیان هەبوو. ئەوەی دڵنیام دەکاتەوە عەبدولکەریم قاسم ڕاڕا بوو لە بارەی جێبەجێکردنی لەسێدارەدانەکان. بۆ نمونە قەزییەی سەعید قەزاز، یەکەم قەزیەی لەسێدارەدان بوو ڕووبەڕووی کۆمار ببێتەوە. ویستم لای عەبدولکەریم قاسم هەوڵێك بدەم بۆ ڕزگارکردنی، نەك لەبەر ئەوەی کورد و

خەڵکی شارەکەم بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە بۆچوونی من و بە بۆچوونی زۆرێکی تر شایەنی لەسێدارەدان نەبوو، یان لانی کەم شایانی لێبوردن بوو. چونکە لە ساڵی ١٩٥٤ بەغدادی لە خنکان و ژێرئاوکەوتن ڕزگار کرد و قبووڵی نەکرد بەغدادی پایتەخت چۆڵ بکرێت، ئەگەر چۆڵ بکرایە ئەنجامێکی زۆر خراپی دەبوو. سەعید قەزاز پیاوێك بوو یاسای جێبەجێدەکرد، بوێر بوو لە جێبەجێکردنی یاسادا، دەستپاك بوو، لەگەڵ مەهداوی و ئەندامانی دادگای سەربازی و ئەمجا عەبدولکەریم قاسمدا هەوڵم دا لەسێدارە نەدرێت، بەڵام عەبدولکەریم قاسم پێیگوتم: "لێگەڕێ با دادگا ڕێچکەی خۆی بگرێت، من مێشولەیەکیش ناکوژم". بۆیە لە سەرەتادا پێم وابوو لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم هیچ کەسێك بە هۆکاری سیاسیی لەسێدارە نادرێت. بەڵام لە ژێر کاریگەری و ئاماژەکانی پێویستی لەسێدارەدان کە ئەگەر نەیکات لەناودەبرێت، گۆڕا. بیرمە جارێکیان لە سینەما خەیام وتاری دەدا، تووڕەبوو و بە جەماوەرەکەی وت: "بۆچی هەمیشە داوام لێدەکەن و دەڵێن لەسێدارە بدە.. لەسێدارە بدە.. ئەی بۆچی داوای شتی تر ناکەن؟ بۆچی داوای دروستکردنی کارگە ناکەن؟"

ئا لێرەوە دەڵێم عەبدولکەریم قاسم لە ناخیدا حەزێکی ڕاستەقینە یان ویستی بۆ لەسێدارەدان نەبووە، بەڵکو کەوتبووە ژێر کاریگەری هەندێکەوە. سەعید قەزاز لەسێدارەدرا، وێڕای ئەوە لە سەردەمی کۆماری تازەدا کە هات بۆ ئەوەی دادگایی پیاوانی سەردەمی پێشوو بکات، پارێزگار و وەزیر بووم. لە ڕێگەی بەڕێوەچوونی دادگاییکردن لەگەڵ

سەعید قەزاز و زمانی دادگا و جیاوازی لۆژیك لە نێوان تۆمەتبار و دادوەر، هەستمکرد سەعید قەزاز زۆر لە ئاستی ئەو دادگایە بەرزتر بوو کە دادگایی کرد. ئەمە ڕاستییەکە بۆ مێژوو دەیڵێم، ڕەنگە هەر کەسێك وەقائعی دادگاییکردنەکەی خوێندبێتەوە هەمان بۆچوونی منی هەبێت.

دادگاییکردنەکەی سەعید قەزاز ناخی هەژاندم، بە تایبەت ئاماژەکردنی هەندێك لە گاڵتەجاڕانی نێو دادگا بە پەتی سێدارە، وەك لە کەسوکارەکەی بیستم، ڕۆژی دواتر چووم بۆ لای قاسم و پێمگوت: لەم دادگایە دادپەروەرییت لەدەست دا و دادگای مەهداوی چیتر لە گاڵتەجاڕییەك بەولاوە هیچی تر نییە. ڕێککەوت لەو کاتەدا مەهداوی هاتە ژوورەوە، ڕاستەوخۆ لێم پرسی: ئەوەی دوێنێ ئامادەی بووم دادگا بوو، یان گاڵتەجاڕی؟!. مەهداوی لێوی نەکردەوە، دەبینم ئاماژە بۆ عەبدولکەریم قاسم دەکات کە گوایە ئەو ئاراستەکەرە. دوای ئەوە عەبدولکەریم پێیگوت: "بڕۆ لەسەر ئاهەنگەکانت بەردەوام بە". بە عەبدولکەریم قاسمم وت: ئەوانە ئاهەنگن یان گاڵتەجاڕی؟. ئەمجا پێمگوت: نازانم زەعیم ڕەزامەندی لەسەر ئەو جۆرە گاڵتەجاڕییانە دەردەبڕێت؟

سەبارەت بە دادگاییکردنی نازم ئەلتەبەقچەلی و دارودەستەکەی، زانیاری ڕاستەقینەم نییە سەبارەت بە هەوڵدانی نازم ئەلتەبەقچەلی، یان ڕۆڵی بۆ ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و دادگاییکردنەکان لەسەر ئەم بابەتە،

بەڵام ئەوەی من زانیبێتم، ئەلتەبەقچەلی ڕازی نەبوو لە شێوازی حوکم و ئەو دۆخەی سوپای تێدا بوو. بە حوکمی نیشتمانپەروەریی و گیانی سەربازیی نەیتوانی ئارامیی لەسەر بگرێت، کاتێك وەزیر بووم و لە گەشتێکدا بووم لە کوردستان، لە کاتی گەڕانەوەم لە سلێمانییەوە، لە کەرکوك چاوم پێکەوت و داوای لێکردم لە سەر چەند بابەتێکی گرنگ قسەم لەگەڵ بکات، بە ناڕەحەتییەوە لەسەر ئەو دۆخەی هاتبووە پێش قسەی دەکرد. زۆر بێتاقەت بوو لەوەی دەگوزەرا و جەختی کردەوە بەهۆی حزبایەتییەوە کە هاتۆتە نێو ڕیزەکانی سوپاوە، زەبت و ڕەبتی سەربازیی لاواز بووە. بەهۆی پارتییەکان و شیوعییەکان و ناسیۆنالیست و تورکمانەکانەوە نائارامی لە نێو شاری کەرکوکدا بڵاوبووەتەوە و چۆن شیوعییەکان ڕۆڵی خراپ و زیانبەخشیان هەیە، لە دژی بەرژەوەندی سوپای عێراق و داب و نەریتەکانی.

زۆر دڵسۆزانە تکای لێکردم لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم بکەم، منیش لای خۆمەوە هەرچی قسەی ئەلتەبەقچەلی بوو گەیاندمنە عەبدولکەریم، کە منیش لە ڕووی سەربازییەوە بڕوام بە قسە و بۆچوونەکانی هەبوو، بەڵام عەبدولکەریم پێکەنی و وتی: "دەزانم مەبەستیان چییە، دەیانەوێت پیلانم لێبگێڕن، لە ژێر چاودێری دامناون، ڕاپۆرتم هەیە لەسەریان، چاوەڕێم تا هەموویان بگرم، ئەوانە تاوانبارن".

نازم ئەلتەبەقچەلی ئەفسەرێکی بە توانا و یەکێك لە دڵسۆزانی ئەم نیشتمانە بوو. سوور بوو لەسەر دابونەریتە سەربازییەکان، دۆستایەتیم

لەگەڵی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٥٤ لە جەلەولا. ڕێز و خۆشەویستی و دۆستایەتییەکی بەهێز لە نێوانماندا هەبوو.

هەرچەندە لە ٢٩ کانوونی یەکەمی ١٩٥٨، بڕیارێك دەرکرا بە دوورخستنەوەی سوپا لە تەکەتولاتی حیزبی، بەڵام بڕیارەکە هەر بە مەرەکەبی سەر کاغەز مایەوە، پێم وایە لەو ماوەیەدا عەبدولکەریم لەوە لاوازتر بوو، ڕێگری بکات لە حیزبایەتیکردن لە نێو سوپادا.

کاردکە لەدەست دەرچووبوو. دەترسا شیوعییەکان و لایەنگرانی لە لایەنە سیاسییەکانی تریش وازی لێبێنن. بۆیە بە باشیزانی دۆخی سوپا هەر بەو شێوەیە بمێنێتەوە، دەبێت بوترێت سوپای عێراق لەو ماوەیەدا لە حاڵەتی پشێوی و لاوازی و بێ زەبت و ڕەبتیدا دەژیا، کە لە دامەزراندنییەوە تا ئەو کاتە شتی وای بەخۆیەوە نەبینی بوو. لە لایەکی ترەوە نازم ئەلتەبەقچەلی جەختی لەسەر دیاریکردنی ناسنامە و مۆرکی حکومەت دەکردەوە، بەڵام پشێوی لەناو بوو و مۆرکی هەڕەمەکی بەسەر حوکمدا زاڵبوو. ئەلتەبەقچەلی یەکێك لەوانە بوو داوای ئاشکراکردنی ئامانجەکانی دەکرد لە چوارچێوەی پرۆگرامی وەزاریدا. ئەوەی لەو کاتەدا ئەلتەبەقچەلی جەختی لێدەکردەوە تەنانەت زۆرێك لەلایەنگرانی خودی عەبدولکەریم قاسمیش جەختیان لێدەکردەوە، دوو داواکاری سەرەکی جەختیان لێدەکرایەوە: حزبایەتیکردن لە نێو ڕیزەکانی سوپادا و دیاریکردنی ناسنامەی حوکم. بیرمە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانمان هەبوو، کۆبوونەوەکان بە شەو دەکران، کاتێك گەیشتمە وەزارەتی

بەرگری بۆ کۆبوونەوە، وەزیرەکان ئامادە نەبوون، چووم بۆ ژوورەکەی ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی حاکمی گشتی سەربازی، کە چوومە ژوورەوە فەریق نەجیب ئەلروبێعی، سەرۆکی ئەنجومەنی سیادە و محێدین عەبدولحەمید و ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدی دانیشتبوون. غەمێکی زۆر باڵی کێشابوو بەسەریاندا، تەنانەت لە حاڵەتی نیمچە گریاندا بوون، پڕی چاویان فرمێسك بوو، وامزانی کۆبوونەوەیەکی تایبەتیان هەیە، وتیان: "فەرموو، باشتکرد هاتیت، ئەی نازانی؟". وتم: نەخێر چی ڕوویداوە؟. وتیان: "سبەی حوکمی لەسێدارەدان بە سەر ڕەفعەت حاجی سرِی و نازم ئەلتەبەقچەلی و هەمو ئەوانەی لەگەڵیان بوون جێبەجێ دەکرێت". سەرم سوڕما: چونکە وامان پێشبینی دەکرد عەبدولکەریم چاو لە بابەتەکە دەنوقێنێت، یان حوکمەکە هەڵدەوەشێنێتەوە، پرسیارم لە نەجیب ئەلروبێعی کرد: هیچ هەوڵێکت نەداوە؟. وتی: "ئێمە ناتوانین هیچ بکەین تۆ دەتوانیت شتێك بکەیت؟". هەستام و چووم بۆ لای عەبدولکەریم قاسم لە ژوورەکەی خۆیدا، زۆر بە گەرمی تکام لێکرد لەو بۆچوونەی پەشیمان بێتەوە و لەسێدارەیان نەدات، وتی: "فوئاد لەم بابەتەدا قسە مەکە، ئەوان خائین و کودەتاچین، بۆیە بڕیارم داوە لەسێدارەیان بدەم، دەیانویست من بکوژن و شۆڕش بڕووخێنن". قسەی توند لە نێوانماندا ڕۆیشت، دەمەدەمەمان گەیشتە ئەوەی پاڵی پێوەنام و لە ژووورەکەی کردمیە دەرەوە و بە هەموو توانای دەرگاکەی لە دوامەوە داخست. بیرمە وەسفی تاهیری یاسەوانی کە لەوێ بوو وتی: "چۆن بەرگری لە کودەتاچییان دەکەیت؟".

گەڕامەوە بۆ ژووری کۆبوونەوەکان و کۆبوونەوە کرا و هیچکام لە وەزیرەکان باسی ئەو بابەتەیان نەکرد، بەڵام ئازار بە دەم و چاوی زۆرێکیانەوە دیار بوو. ئەوەندەی من بزانم جگە لە من، هیچکام لە وەزیرەکان لەو بارەوە قسەیان لەگەڵ نەکرد، تا لەو بڕیارەی پەشیمانی بکەنەوە و لەسێدارەدانەکە ئەنجام نەدرێت. بەداخەوە بەیانی ڕۆژی دواتر حوکمی لەسێدارەدانەکە جێبەجێ کرا، دوای لەسێدارەدانی ئەو ئەفسەرانە پەیوەندیم لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا تێکچوو.

هەمیشە ئازارم دەچەشت بەوەی، کە دەمبینی ئەو دەستەبژێرە نایابە لە ئەفسەرانی سوپای ئازادیخوازمان ئەو ڕق و لێکترازانە کەوتۆتە نێوانیان، چەند ئازارم چەشت کاتێك هەستمکرد ناکۆکی کەوتۆتە نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف. چەندە هەوڵمدا پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم و ئەفسەرانی ئازادیخواز کە بەشدارییان کردبوو لە هەڵگیرساندنی شۆڕشدا چاك بکەمەوە. ڕۆژێکیان عەبدولکەریم قاسم هەستی بە بێتاقەتی دەکرد، داوای لێکردم بچم بۆ لای و نانی نیوەڕۆی لەگەڵدا بخۆم، پێمگوت: نەخێر تۆ وەرە نانی نیوەڕۆ لای ئێمە بخۆ. لە ڕێگا داوام لە شۆفێرەکە کرد بە گوێرەی ڕێنومایییەکانی من لێخوڕێت، تا گەیشتینە ماڵی تاهیر یەحیا لە سالحییە، عەبدولکەریم نەیدەزانی مەبەستم چییە، لەوێدا پێمگوت: تاهیر یەحیا مافی لەسەر تۆ هەیە، هاوڕێتە و یەکێکە لە ئەفسەرانی ئازادیخواز و مافی هەیە سەردانی بکەیت. عەبدولکەریم مانەوەی بە زۆری لە ماڵەکەی خۆیدا بە سەردا سەپاند بوو و خانەنشینیشی کردبوو، تاهیر یەحیا زۆری بەخێرهێنایین و سوپاسی ئەو

سەردانەی کرد. لەوێوە بە عەبدولکەریم قاسمم وت: سەردانێکی ناجی تالبیش بکەین، سەردانمان کرد و عەبدولکەریم سوپاسی ئەو دەستپێشخەرییە باشانەی کرد، کە بوونە هۆی بوژاندنەوەی گیانی برایەتی و هاوڕێیەتی لە نێوانماندا، بەڵام بەداخەوە عەبدولکەریم قاسم بەردەوام نەبوو لە پەیوەندییە باشەکانی لەگەڵ هاوڕێیاندا، ئەو ڕاپۆرتانەی بەردەوام پێی دەگەیشتن، کاریان دەکردە سەری. دەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگری کە لەسەردەمی عەبدولکەریمدا پێشکەوتوو نەبوون، چالاکتر کران و بە ئارەزووی خۆیان و بەرژوەندی تایبەتییانەوە ڕاپۆرتەکانیان بەرز دەکردەوە، ئەمەش بە بۆچوونی من یەکێك لەو هۆکارانە بوو، کە بوو بەهۆی ڕووخاندنی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم. پێویستە بڵێم عەبدولکەریم پشتی بە ڕاپۆرتی هەندێك لەو کەسانە دەبەست کە ڕاپۆرتی نهێنییان دەدایە، لەوانە موحسین ئەلرەفیعی بەڕێوەبەری هەواڵگری سەربازی و عەبدولمەجید جەلیل بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کە دوو کەسی بە ویژدان و میانڕەوبوون و ئەو دەزگایە تیرۆریست نەبوو.

عەبدولکەریم قاسم بەو زانیاریانەی لە دەزگا فەرمییەکانەوە پێی دەگەیشت، دڵی ئاوی نەدەخواردەوە و پشتی بە کەسانی تر دەبەست لە باکوور و باشوور، نمونەی عەبدولجەبار حەمزە و کەمال عوسمان و تاهیر ئەلدەباغ. هەندێکجار بەراوردی نێوان ئەو زانیاریانەی دەکرد کە لەو کەسانەوە پێی دەگەیشتن لەگەڵ ئەو زانیارییانەی دەزگاکانی ئاسایش بۆیان دەنارد، بڕوای وابوو زۆرێك لەو زانیارییانەی لەو کەسانەوە پێی

دەگەن نالۆژیکی و نادروستن.

چەندین هەوڵدرا بۆ ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم، خەڵکیش هەمووی ئەوە دەزانێت، وەك بزووتنەوەی ئەلشەواف و هەوڵی تیرۆرکردنی لە شەقامی ئەلرەشید و شۆڕشی ١٤ی ڕەمەزان، کە توانیی کۆتایی بە دەسەلاتەکەی بهێنێت و لەسێدارەی بدات، بەلام هەوڵەکانی تر لێرە و لەوێ ناوەناوە دەمانبیست کە کودەتایەك بەڕێوەیە، بەلام نەماندەزانی ئەو پڕوپاگەندانە تا چەند ڕاستن، ئەوەی دەزانم زاراوەی (کودەتاچی) لە سەردەمێکدا کرا بە زاراوەیەکی باو لە نێو خەڵکیدا. بە ئاسانی دەتوانرا بە هەر کەسێك بگوترایە کودەتاچی، بەڵکو هەندێك کەسی بردە زیندان و هەندێکی تری تووشی لێدان و سووکایەتی کردەوە، هەندێکی تریش بە کۆتاییهاتن بە ژیانی لەسەری تەواو بوو، وەك ئەوەی لە ڕوداوەکانی موسڵ و کەرکوکدا ڕوویان دا، هەندێك خەڵکی بێتاوان تیاچوون، تەنانەت نەیاندەزانی چی ڕوویداوە و بۆچی کوشتنیان لەسەر جێبەجێ دەکرێت. تەنانەت بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە گەیشتە ڕادەیەك هەندێك کەسی دڵگەرمی لایەنگری عەبدولکەریم قاسم و هەندێك توندڕەو لە شیوعییەکان بەو کەسانەیان دەگوت، کە بە ئاستەم بیانویستایە ڕەخنە لە دۆخێك یان حاڵەتێکی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم بگرن، یان ڕەخنە لە دۆخی گشتی یان ناڕەزایەتی لە دیاردەیەك دەربڕن.

لە ڕاستیدا من نازانم ئەو دەنگۆیانە لەبارەی کودەتاوە تا چەند ڕاست بوون، بەلام دەزانم ڕەشید عالی ئەلگەیلانی کە هاوڕێم بوو و پەیوەندی

دۆستایەتیم لەگەڵی هەبوو، ڕاپێچی دادگا کرا و ئازاد کرا، هێندەی نەخایاند بۆ جاری دوەم ڕاپێچی دادگا کرایەوە بە تۆمەتی کودەتاکردن بەسەر دەوڵەت و هەوڵی ڕووخاندنی سیستمی حوکم، دووبارە دادگایی کرایەوە، بەڵام حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا جێبەجێ نەکرا و ئازادکرا و عێراقی بەجێهێشت و دوای شۆڕشی ١٤ی ڕەمەزان گەڕایەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، سەبارەت بە هاتنی ناوی من لە لیستی ناوی ئەو وەزیرانەی لەلایەن گرووپەکەی ڕەشید عالی ئەلگەیلانی ڕێککەوتبوون لەسەری، کە دوای ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم دەسەڵات بگرنە دەست. لە ڕاستیدا من ئەو کارەم بەلاوە سەیر بوو، هیچ ئاگاداری و پەیوەندییەکم بەو بابەتەوە نەبوو، پێداگریم کرد لە عەبدولکەریم قاسم، داوا لە دەستەی لێکۆڵینەوە بکات بۆ ئاشکراکردنی هەر پەیوەندییەکی من بەو بابەتەوە. دەرکەوت هیچ پەیوەندییەکم بەو بابەتەوە نییە، بەڵام ئەو گرووپە بۆچی منیان هەڵبژاردبوو؟ تەنها ئەوە بوو بە لای ئەوانەوە من کەسێکی باش بووم و هیچی تر.

لە گەرمەی ئەو ململانێیانەدا کەسانێك هەبوون هانی عەبدولکەریم قاسمیان دەدا، بە دامەزراندنی پارتێکی سیاسیی خۆی بەهێز بکات، بەڵام قاسم لە بنەڕەتدا ئەو بیرۆکەیەی بەلاوە قبووڵکراو نەبوو. دەیگوت: "من لە سەرووی حەز و ئاراستەکانەوەم" لە سەرووی پارتە سیاسییەکانەوە ڕەفتاری دەکرد. تەنانەت پەیوەندیشی بە حزبی شیوعییەوە سنووردار و کاتی بوو.

بەڵام کە بینی قەبارەی داواکارییەکانی لەسەر حیسابی دەوڵەت و سەرۆکی دەوڵەت گەورەتر دەبن سنووریکی بۆ دانا. کێشەی کەرکوك بیانوویەکی باشبوو بۆ ئاشکراکردنی حیسابات لەگەڵ حیزبی شیوعیدا، پێم وایە عەبدولکەریم ڕاستبوو لە ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی پێکهێنانی پارتێکی سیاسیی بە سەرۆکایەتی خۆی، چونکە بە بیانووی پارتەکەیەوە کەسایەتیی یان بوونی بچووك دەبووەوە. لە کاتێکدا عەبدولکەریم قاسم حەزیدەکرد وەك عێراقییەك پەیوەندی لەگەڵ میللەتدا هەبێت، نەك لەسەر بنەمای حیزبی بوونیان، ئیتر لە چ نەتەوە و ئایین و تەنانەت لایەنێکی سیاسیش بن. دەتوانم بڵێم عەبدولکەریم پیاوێکی عێراقی بوو بە تایبەتمەندی عێراقی. بە تەواوی واتا مرۆڤ بوو، زۆر سادە و خاکی بوو، ڕق و کینەی نەدەزانی، زۆر بەخشندە و دەستکراوە بوو، قوتابی و ئەفسەر بوو، تا ئەوپەڕی کەمدوو و نهێنی پارێز بوو. نازانم چۆن دوای شۆڕش گرێی زمانی کرایەوە و هەرزوو بوو بە وتاربێژ و زۆربەی کات لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا قسەی دەکرد. ئەوەی عەبدولکەریمی دەناسی دەیگوت: "چۆن ئەم کەمدووە دەتوانێت هێندە قسە بکات؟".

لە ڕاستیدا ئێمە هەرگیز نەمانبیست عەبدولکەریم ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕەخنە لە دەسەڵاتی پاشایەتی بگرێت، مەگەر لای ئەوانەی لە ڕێکخستنەکانی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا بوون. پێم وایە بەرپرسیارێتی سەرکردایەتیکردنی عێراق زۆر لە توانای ئەو گەورەتر بوو، ئەمەش هۆی شکستهێنانی بوو، بەڵام ئەفسەرێکی باش و ئازا بوو.

سەبارەت بە عەبدولسەلام، کەسێکی بوێر و باش بوو، هەندێکجار سەرەڕۆیی دەکرد، نەیدەتوانی بیرۆکەکانی بە زمانێکی هاوسەنگ داڕێژێت. بۆیە دەمانبینی لە کاتی وتارداندا تووشی هەڵەکردن دەبوو. زماندرێژ و زمانپیس بوو، کەمجار ڕێزی بەرامبەری دەگرت، بۆچوونی بۆ یەکێتی عەرەبیی ڕوون و ئاشکرا بوو، بەڵام هەرچی ئەو قسانەی لەسەر یەکێتی عەرەبی دەیکرد هەر قسە بوون و تەنها بۆ لابردنی عەبدولکەریم قاسم و هاندانی جەماوەر بوو لە دژی، کە بە ئەندازەی عەبدولسەلام عارف حەماسی نەبوو بۆ یەکبوونی عەرەبی. ئەوەی وام لێدەکات ئەم بۆچوونەم هەبێت ئەوەیە، کاتێك عەبدولسەلام بوو بە سەرۆك کۆمار، ئەو یەکبوونە عەرەبییەی جێبەجێنەکرد، کە لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا بانگەشەی بۆ دەکرد، بەڵکو هەرگیز ئەو خێرا یەکبوونەی بۆ یەکجاریش نەهێنایە بەرباس.

## بوونم بە وەزیر لە کابینەکەی عەبدولکەریم قاسم

دوای ڕۆیشتنی عەبدولسەلام عارف بۆ بۆن وەك باڵوێزی عێراق و داڕشتنەوەی کابینەی وەزاری، بووم بە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئەوقاف. عادەتم وابوو کە دەچووم بۆ کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران خالید نەقشبەندی ئەندامی ئەنجومەنی سیادەم بە ئۆتۆمبێلەکەی لەگەڵ خۆم دەبرد، لەگەڵ ماڵی خالید لە ناوچەی عەلەویە بەرامبەر نەخۆشخانەی ئەلسەلام دراوسێ بووین. ئەنجومەنی وەزیران لە وەزارەتی بەرگری کۆبوونەوەکانی دەکرد، بۆیە لە بابولشەرقی دادەبەزیم و شەقامی

ئەلرەشیدم بە پێ دەبڕی و دەچوومە چایخانەکەی حەسەن عەجمی لە حەیدەرخانە و لەوێ کۆمەڵێك لە هاوڕێ کۆنەکانم دەبینی، لەوانە عەقیدی خانەنشین موحەممەد خورشید و موقەددەمی خانەنشین مستەفا ئەمین و موقەددەمی خانەنشین حەکیم تاهیر و چەندین کەسی تریش، نێرگەلەمان دەکێشا، تا کاتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران. بەجێم دەهێشتن و دەچووم بۆ وەزارەتی بەرگری. جارێك لە جارەکان لەگەڵ دوو هاوڕێمدا بە پێ ڕۆیشتین تا گەیشتینە وەزارەتی بەرگری، کاتی کۆبوونەوەکە نزیکەی کاتژمێر دەی شەو بوو، خودا حافیزیم لێکردن و چوومە نێو وەزارەتی بەرگرییەوە، پاسەوانەکە نەیناسیم، زۆری پێ سەیر بوو، پێیگوتم: "تۆ کێیت؟". وتم: من بەڵێندەری جیرەم. سەربازە پاسەوانەکە هاواریکرد: "وەڵا بەڵێندەرێکی باشە، نیوەی شەو دێت جیرە وەردەگرێت، بەرپرسی پاسەوانان وەرە! بزانە ئەفەندی چی دەڵێت، نیوەی شەو هاتووە دەڵێت من بەڵێندەری جیرەم". بەرپرسی پاسەوانەکان کە هات ناسیمی و سڵاوێکی گرتەوە و وتی: "گەورەم ئەو سەربازە بەڕێزتان ناناسێت". لای کرد بە لای سەربازەکەوە و وتی: "کورە، ئەوە لیوا فوئاد عارفی وەزیری دەوڵەتە". سەربازەکەش داوای لێبوردنی کرد و وتی: "گەورەم من چووزانم تۆ نیوەی شەو هاتوویت بۆ وەزارەت، ئێستا کەی دەوام هەیە کەی جیرە (ارزاق) هەیە؟" هەمووومان پێکەنین و چوومە ژوورەوە.

لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران، هەر وەزیرێك باسی لە کاروباری وەزارەتەکەی خۆی دەکرد، قسە و باس لەسەر سیاسەتی گەرمی وڵات نەدەکرا، تەنانەت گوێم لێنەبوو باس لە کێشەی کەرکوك

بکرێت. دەتوانم بڵێم هەموو شەوێك کۆدەبووینەوە و کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران تا بەرەبەیان درێژەی دەکێشا، بەیانی عەبدولکەریم قاسم نیو دیناری لە گیرفانی دەردەهێنا و یەکێك لە بەردەستەکانی دەنارد بۆ کڕینی مەنجەڵێك پاقلەی کوڵاو لەگەڵ چەند نانێك لە (بابولموعەزەم) بۆ ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران قاوەڵتی پێبکەن، دوای ئەوە چاییمان دەخواردەوە و هەرکەس دەچووە وەزارەتی خۆی، هەندێکجاریش قەیماغی بۆ دەکڕین.

دوای دەست لەکارکێشانەوەی عەبدولوەهاب ئەمین لە وەزارەتی کشتوکاڵ، بووم بە وەزیری کشتوکاڵ، دەمزانی زۆر هەژارم لە بواری کشتوکاڵدا و هیچ لە سرووشتی ئەو کارە نازانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جەختم لەلایەنی ئیداری کردەوە و کۆبوونەوەم بە بەرپرسانی وەزارەت کرد و داوام لێکردن لە کاتی بەرزکردنەوەی هەر بابەتێك بۆم بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر دەربڕم، پوختەیەکی لەگەڵدا هاوپێچ بکرێت کە بۆچوونی کەسی پسپۆڕ لەخۆبگرێت، بۆ ئەوەی هەڵە نەکەم لە ڕەزامەندبوون یان ڕەتکردنەوەی. باوەڕم وابوو کەسی ئیداری دەبێت پشت بە شارەزایی پسپۆڕان ببەستێت. سوودی زۆرم لە شارەزایی یەکێك لە فەرمانبەرە شارەزاکان کە دکتۆر ئەحمەد سەلمان بوو وەرگرت و کردمە ڕاوێژکاری خۆم، هەرچەند لەسەر حوکمی پاشایەتی حیساب بوو، شارەزاییەکی یەکجار بەرفراوانی هەبوو لە کاروباری وەزارەتدا و پشتم پێبەست. کاتێك دوای من عادل جەلال بوو بە وەزیری کشتوکاڵ، عەبدولکەریم ویستی بە مەبەستی ناوزڕاندنی من، خاڵی لاوازی سەردەمی

من لە وەزارەتەکەدا بدۆزێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. لە ڕاستیدا هیچ بڕیارێکم نەدەدا تا بە باشی بیرم لێنەکردایەتەوە و ڕاوێژم نەکردایە و قەناعەتم پێنەبایە و ڕاوبۆچوونی بەڕێوەبەری گشتی و ڕاوێژکاری پسپۆڕم لەسەر وەرنەگرتایە. بۆیە هیچ ناتەواوی و کەموکوڕی یان خاڵێکی لاوازی لە وەزارەتەکەی مندا نەدیتەوە. ئازادی تەواوم دا بە بەڕێوەبەرەکان و ئەوانیش لە کارەکانیاندا دڵسۆزییان نواند و هەمیشە هەوڵیاندەدا دۆخی کشتوکاڵ لە وڵاتدا پەرە پێبدەن. کاتێك بووم بە پارێزگاری کەربەلا موعاناتەکانم لە خۆشییەکانم زیاتر بوون، چونکە تازە بووم لە کاری ئیداریدا. ژیانم لەسەربازیدا هەمووی بە – فەرمانکردن – بەسەر بردبوو، ڕانەهاتبووم کەسێك پلەی لە خۆم نزمتر بێت دەمەدەمەم لەگەڵ بکات، کاتێك بووم بە پارێزگار بۆ نمونە دەمبینی بەڕێوەبەری شارەوانی یان هەر بەڕێوەبەرێکی تر پێی دەگوتم: "جەنابی پارێزگار ئەم کارە وانابێت چونکە لەگەڵ ئەوە و.... هتد دژ دێتەوە". لە کاتێکدا ژیانی سەربازی، فەرماندە تیایدا ڕێگە نادات بە کەسێکی لە خۆی خوارتر بڵێت: "ئەوە نابێت"و هیچ بوارێك بۆ ئیجتیهاد لەلایەن بچووکەوە نییە، بەڵام دوای ئەوە لەسەر ئەو قسانە ڕاهاتم، کە بووم بە وەزیر ئیتر لەسەر کاری مەدەنی یان وەزیفەی مەدەنی ڕاهاتبووم.

کەشوهەوای گفتوگۆکانی ئەنجومەنی وەزیران، هیچ ئازادی تەواوی نەدەدا، بۆ ئەوەی وەزیرەکان بتوانن ئەوەی لە مێشکیاندایە دەریببڕن، بەڵکو هەر کە بۆیان هەڵکەوتایە بە چپە لەگەڵ یەکتر دەریاندەبڕی. هەر لە یەکەم دانیشتنەوە ئەوەمان بۆ ڕوونبووەوە عەبدولکەریم قاسم حەز

ناکات باسی ئەو بابەتانە بکرێت کە لە دەرەوەی کار و پسپۆڕیی وەزارەتەکانە. باسی کاروباری سیاسیی و کێشە گشتییەکانی وڵاتی بۆ خۆی قۆرخ کرد، وەزیرەکانیش ئەو بوێرییەیان تێدا نەبوو ئەو کێشە گەورانە بخەنەڕوو. سەبارەت بە ڕۆڵی ئەنجومەنی سیادەش لە ڕاستیدا تەنها ناوێك بوو و هیچی تر، ئەرکی تەنها شەرعییەتدان یان پێدانی سیفەتێکی دەستووری بوو بە بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیران و عەبدولکەریم قاسم.

## بزووتنەوەی عەبدولوەهاب ئەلشەواف

عەقید عەبدولوەهاب ئەلشەواف ئەفسەرێکی بە توانا و کەسێکی باش و لە ئەفسەرە ئازادیخوازە دڵسۆزەکان بوو. وا دەزانم تووشی سەرسوڕمان بوو لەو پۆستەی ڕاستەوخۆ پێی درا، پێی وابوو دەبێت لە شوێنێکی باڵاتردا بێت، وەك لەو پۆستە سەربازییە پەتییە. ئەوانەی لەگەڵ بزووتنەوەکەدا ژیان یان لەسەریان خوێندۆتەوە، هەڵەی زۆریان تێدا بەدی دەکرد، کە بوو بە مایەی خێرا لەناوچوونی، لە ڕاستیدا عەقید عەبدولوەهاب ئەلشەواف پشتی بە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو – میسر – بەستبوو، لە پشتگیریکردنە سەرنەکەوتوەکەی بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم.

ئەو کاتە بزووتنەوەکەی عەبدولوەهاب ئەلشەواف لە موسڵ ڕووی دا، من وەزیر بووم، دوای شکستهێنانی بزووتنەوەکە ئەنجومەنی وەزیران بڕیارياندا بۆ ئارامکردنەوەی دۆخەکە بمنێرنە موسڵ. لە ڕاستیدا نازانم

بۆچی منیان هەڵبژارد؟ بەهەرحاڵ بە فڕۆکەیەك چووم بۆ موسڵ، کە گەیشتم زۆرم بەلاوە سەیر بوو یەك کەس نەهاتبووە پێشوازیم، وێڕای ئەوەی ئاگاداری بەرپرسانی موسڵ کرابووەوە لە کاتی سەفەر و گەیشتنم و ئەو کارەی بۆی دەچووم. جانتاکەم هەڵگرت و داوای نزیکترین تەلەفۆنم کرد، یەکسەر پەیوەندیم بە فەرماندەی مەوقعی موسڵ عەقید حەسەن عەبودەوە کرد، کە لە دوای ڕوداوەکانی بزووتنەوەکەی ئەلشەواف ئەرکی کۆنترۆڵکردنەوەی موسڵی پێسپێردرا بوو. حەسەن عەبود یەکێك لەو ئەفسەرانە بوو لە ژێر دەستی مندا کاری کردبوو، پێشتر دەمناسی و پەیوەندیم لەگەڵی هەبوو.

زۆر بە توندی گلەیی ئەوەم لێکرد کە هاتنی منی بۆ موسڵ پشتگوێ خستووە و گرنگی پێنەداوە. بیرمە پێمگوت: حەسەن گریمان من وەزیر نیم و نوێنەرایەتی دەوڵەت ناکەم، هەروەکو هاوڕێیەك پێویست نەبوو لە پێشوازیمدا بیت؟. زۆر داوای لێبوردنی کرد و وتی: "گەورەم بمبورە، هەر ئێستا لات دەبم"، هەر وابوو زۆر زوو ئامادە بوو. چووین بۆ بارەگانی مەوقع و لەگەڵ بەرپرسە باڵاکانی موسڵدا کۆبوونەوەم کرد و دوای ئەوە سەردانی نەخۆشخانەم کرد و لە ئەحواڵی نەخۆشەکانم پرسییەوە کە بەهۆی ئەو ڕوداوانەوە بریندار بووبوون.

دوای ئەوە چووم بۆ تەلەعفەر و بە نمایشێکی گەورە پێشوازییان لێکردم و لەسەربانێکەوە قسەم بۆ خەڵکەکەی کرد. خۆپیشاندەران لە حاڵەتی هەڵچووندا بوون و داوای کوشتن و لەسێدارەدانیان دەکرد، قسەم

بۆ کردن و پێمگوتن هیچ کەسێك چاکە و باشەی بەسەر شۆڕشەوە نییە و سوپای عێراق شۆڕشی کردووە، هەر کەسێك هەر سەرپێچییەکی بینی گوزارشتی لێبدات، نەك خۆی بکات بە بەرپرس و دەمڕاست و بە ئارەزووی خۆی حوکم جێبەجێبکات، چونکە ئەوە دەبێتە مایەی پشێوی و هەرکەس ئەو کارانە بکات خائینە.

بیرمە پێمگوتن پێویستە لە بڕیارداندا ژیرانە بڕیار بدەین و وتم: ئەگەر کەسێك باوکی دەرەبەگ بوو و ئەمڕۆ شۆڕش بە گوێرەی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەستی گرتبێت بەسەر نۆ هەزار دۆنم لە زەویەکانیدا و هەزار دۆنمی بۆ هێشتبێتەوە و لایەنگری شۆڕش بێت، ئایا ئەو کەسە بە خائین دادەنرێت؟ وە بۆچی خائینە؟ لە کاتێکدا لە باپیرانییەوە ئەو زەوییانەی بە میرات بۆ ماوەتەوە؟ شۆڕش هات تا ئەمڕۆ بەشی جوتیاران بدات و نابێت هەر کە پارچە زەوییەکی هەبێت وا مامەڵەی لەگەڵ بکەین کە دوژمنی کۆمارە. هەستمکرد خەڵکی تەلەعفەر تا ڕادەیەك قەناعەتیان بە قسەکانم هەبوو.

دوای ئەوە چووم بۆ شنگال و هەمان قسەم لەگەڵ خەڵکەکەیدا کرد، کە پێویستە هێمنی و ئارامی بپارێزن و ئەمجا چووم بۆ ئاکرێ و زێبار و ناوچەی نەهلە، لە گەشتەکەمدا بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ ئیسماعیل عەباوی (توحلە)م لەگەڵ بوو، دوای ئەوە چووم بۆ هەولێر و حاجی ئۆمەران و کۆیە و سلێمانی و هەڵەبجە.

لە کەرکوك فەرماندەی فیرقە داوود ئەلجەنابی پێشوازی لێکردم، دوای

گەڕانەوەم لە گەشتەکەم کە نزیکەی دوو هەفتە یان زیاتری خایاند، گەڕامەوە و لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم دانیشتم و وێنەیەکم لەسەر دۆخی باکوور دایە، کە چیی بەسەرهاتوە لە لاوازی ئەفسەران و بڵاوبوونەوەی پشێوی و نەمانی دەسەڵاتی دەوڵەت لە بەرامبەر دەسەڵاتی پارتەکاندا، بە تایبەت پارتی دیموکرات و حزبی شیوعی و هەر کامیان بە گوێرەی ناوچەی دەسەڵاتی بەرفراوانی بەهۆی دزەکردنیان بۆ نێو ڕیزەکانی و سەرکردەکانی وەك داوود ئەلجەنابی، فەرماندەی فیرقەی کەرکوك کە شیوعی بوو، پشتگیری شیوعییەکانی دەکرد و دەسەڵاتیانی لە ناوچەکەدا زیاتر دەکرد.

بەو پێیەی وەزیر و دڵسۆزێکی ڕژێمی کۆماری و هاوڕێی عەبدولکەریم قاسم بووم، هەوڵم دا وێنەیەکی ڕاستگۆیانە لەسەر حاڵەتەکە بدەم بە عەبدولکەریم، بەڵام وەك هەمیشە ڕاپۆرتە درۆکان لەسەر بارودۆخی تراژیدی کە ناوچەکەی پێدا تێدەپەڕی و بە ناوی شۆڕش و کۆمارەوە، بزماری لە تابوتی شۆڕش و کۆمار دەدا، کاریگەری خۆیان هەبوو. ئەوەی سەیر بوو دوای گەڕانەوەم لە گەشتەکە، عەبدولکەریم زۆر بە ساردی پێشوازی لێکردم، لە کاتێکدا پێم وابوو زۆر بە گەرمی پرسیار لە ئەنجامەکانی و هەوڵەکانم دەکات، بەڵام زۆر بە دەم بابەتەکەوە نەهات و تا ناچار لەسەر گەشتەکەم و ئەو قسانەی بۆم دەکرد وتم: بۆچی بابەتی گەشتەکەم بۆ ناوچەی باکوور پشتگوێ دەخەیت؟ لە کاتێکدا من بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران ڕۆیشتووم؟ وتی: "ڕاپۆرتێك لەو بارەیەوە بنووسە و بیدەرە تەها شێخ ئەحمەد". کە بەڕێوەبەری پلانە

سەربازییەکان بوو. زۆر بێتاقەت بووم لە قسەکەی و بە سەرسوڕمانەوە پێمگوت: دەتەوێت ڕاپۆرت بنووسم و بیدەمە دەستی تەها شێخ ئەحمەد؟. ئەمجا وتم: من دەچم بۆ دەرەوە بۆ چارەسەرکردنی کوڕەکەم، لەو کاتەی لە دەرەوەم دەتوانیت لێکۆڵینەوە بکەیت لە ڕاست و دروستی ئەو بارودۆخەی بۆم باسکردی لەسەر باکووری عێراق.

بەهۆی نەخۆشی کوڕەکەمەوە، چووم بۆ لەندەن و نزیکەی دوو مانگ مامەوە. کە گەڕامەوە دەبینم عەبدولکەریم تەواو لە بەرامبەرمدا گۆڕاوە و خراپتر بووە. گۆڕانکارییەکەی چەند هۆکاریکی هەبوون، ڕاشکاوانە قسەکردن لەگەڵ میزاجیدا نەدەگونجا کە لە سەرەتادا وانەبوو. کۆبوونەوەی جەماوەر لە دەوری و پابەندبوونیان بە شۆڕش و ئەو درووشمە گەرمانەی دەیان دا وایکرد، پێی وابێت هێندە پاکە هیچ هەڵەیەك ناکات، بەڵام من ڕاشکاوانە و بابەتییانە بووم لە خستنەڕووی ئەو کاروبارانەی کە بە پێویستم دەزانی ڕاشکاو بم لەگەڵی، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە هەستم دەکرد هەندێك لەو ئەفسەرانەی بەشداری شۆڕشیان کردبوو ناحەقییان بەرامبەر دەکرێت. واتە من لایەنگری عەبدولکەریم قاسم نەبووم، بەڵکو بە چاوی حەق سەیری پەیوەندییەکانیم دەکرد لەگەڵ ئەوانەی شۆڕشیان لەگەڵدا کردبوو، سەرباری ڕاپۆرتە نهێنییەکان کە دەگەیشتنە عەبدولکەریم قاسم، دڵنیام زۆربەی ئەو ڕاپۆرتانە درۆ و هەڵبەستراو بوون. بەهەرحاڵ ئەو گومانەی بۆ دروست بووبوو کە من زۆر دڵسۆز نیم، بە تایبەتی هەڵوێستم لە لەسێدارەکانی شەهیدانی (ام الطبول) ئەو خاڵە بوو کە گومانی خستبووە دڵییەوە، لەگەڵ هەڵوێستم لە دادگایی کردنەکانی ئەلمەهداوی.

## سەرەتای پەیوەندیم لەگەڵ بارزانی

سەبارەت بە ناسیاویم لەگەڵ بارزانی نەمر، ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ١٩٣٠، ئەو کات هێشتا لە کۆلێژی سەربازی دەمخوێند. لەو کاتەدا ماجید مستەفای خاڵم، هەوڵیدا بۆچوونەکانی نێوان حکومەت و سەرکردەکانی بارزان لێك نزیك بکاتەوە. شێخ ئەحمەد قەناعەتی کرد وەك نیازپاکییەك مەلا مستەفای برای بنێرێتە بەغداد، تا چاوی بە مەلیك فەیسەڵی یەکەم بکەوێت. بە گشتی لەو کاتەدا بارودۆخی کوردستان زۆر نائارام بوو. بۆیە هەنگاوێکی لەو جۆرە چارەسەری زۆرێك لە کێشەکانی دەکرد. شێخ ئەحمەد دەستخۆشی لە پێشنیارەکەی خاڵم کرد و خاڵم و مەلا مستەفا پێکەوە هاتنە بەغداد. بیست تا سی چەکدار لەگەڵ مەلا مستەفادا هاتبوون، هەموویان لە ئوتێل دجلە، لە نزیك پردی ئەحراری ئێستا (پردی مۆدی پێشوو) دەمانەوە. من و چەند قوتابییەکی کورد کە لە بەغداد دەمانخوێند زیاتر لە جارێك لە شوێنی مانەوەیان سەردانمانکردن. میوانداریمانکردن بۆ بینینی فیلمێکی نیشتمانی، فیلمەکانی ئەو ڕۆژگارە تەنها وێنە و جوڵە بوون و قسەیان لەگەڵدا نەبوو، هاوڕێم دکتۆر ئیبراهیم حیلمی فەتاح کە لەگەڵمان بوو، ئینگلیزییەکی باشی دەزانی ژێرنووسی سەر شاشەکە، کە بە زمانی ئینگلیزی نوسرابوو بۆی وەردەگێڕاین، لە بیرمە مەلیك فەیسەڵ نیوەڕوانێك میوانداری بارزانی کرد بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆن. بارزانی ئەو کاتە لە هەرەتی لاویدا بوو.

جاری دووەم ساڵی ١٩٣٩ لەگەڵ بارزانی چاومان بە یەکتر کەوتەوە،

ئەو کاتە یاریدەدەری فەرماندەی فەوج بووم، ئەویش دوورخرابووەوە بۆ سلێمانی، بە بەردەوامی یەکترمان دەبینی و پەیوەندییەکی دۆستانەمان هەبوو. هەروەها سەردانی شێخ ئەحمەدی برا گەورەیشیم دەکرد، کە ئەویش بە هەمان شێوە دورخرابووەوە بۆ سلێمانی. ئەویش سەردانی دەکردین لە ماڵەوە، ئیتر لە یەکتر جیابووینەوە تا جارێکی تر ساڵی ١٩٥٩ کە لە ڕووسیا گەڕایەوە یەکترمان دیتەوە. بارزانی کە گەڕایەوە، عێراقییەکان بە عەرەب و کوردەوە پێشوازییەکی وایان لێکرد کە پێشتر بۆ هیچ سەرکردەیەکی تری کورد نەکرا بوو.

بارزانی لە خانووەکەی نووری ئەلسەعید نیشتەجێ بوو و سەرکردایەتی شۆڕش مانگانەیەکی بۆ بڕییەوە، هەرچەندە بارزانی وەلائێکی گەورەی بۆ عەبدولکەریم قاسم هەبوو، بەڵام وردە وردە پەیوەندییەکانی نێوانیان تا دەهات خراپتر دەبوو. بۆ مێژوو دەیڵێم و دڵنیاشم لەوە عەبدولکەریم قاسم دەستپێشخەر بوو بۆ شەڕ، وە مەلا مستەفا و پارتی دیموکراتی کوردستان حەزیان لە شەڕ نەبوو، بەڵکو عەبدولکەریم قاسم پلانی دانا بۆ جەنگ بۆ ئەوەی کۆتایی بە دەسەڵاتی بارزانی بهێنێت، پێی وانەبوو شەڕ درێژە بکێشێت.

لە دۆخی یەکترکوشتن و نەفرەت لەیەککردن، کە سیاسەتەکانی عەبدولکەریم قاسم بە ماوەیەکی کەم لە دوای کەوتنی شۆڕش دروستی کردبوو، بارودۆخێکی هێنایە پێش سدیق میرانی تێدا بکوژرێت، هەر ئەو دۆخە بوو بەهۆی کوژارنی ئەحمەد ئاغای زێباری. قاسم بیری دەکردەوە

دوویەرەکی لە باکووردا دروست بکات بۆ پەرتەوازەکردنی کورد. بە گوێی خۆم لێم بیست دەیگوت: "دەستی دەرەبەگم لە باشووردا کورتکردەوە، بەڵام لە باکووردا دەستڕۆیشتووەکان هێشتا ماون، دەبێت ئەوانیش نەهێڵم". بەو جۆرە دەیویست بە گژ یەکیاندا بدات، هەروەها گوێم لێبوو دەیگوت: "من گەورەی کودەتاچیانم". ئەوەی دڵنیام دەکاتەوە بڵێم عەبدولکەریم قاسم کێشەی لە باکووردا دروستدەکرد بۆ ئەوەی بە چەك چارەسەری بکات، ئەوە بوو هەر هەوڵێکی وەزیرەکانی ڕەتدەکردەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو بابەتە، پێم وایە عەبدولکەریم قاسم دەترسا لە هەر کەسایەتییەکی سیاسیی ئەگەر پێگەی جەماوەریی هەبووایە. بۆیە ڕقی لە ڕەشید عالی ئەلگەیلانی دەهاتەوە، کە دوای چەند ساڵێك لە ژیانی دوورە وڵاتی، گەڕایەوە و لێرە لە عێراق بە بیانووی کودەتا و دژایەتیکردنی دەسەڵات، حوکمی سێدارەی بەسەردا درا.

لە سەردەمی عارفیشدا چاوم بە بارزانی کەوت و دواتر باسی دەکەم، لە ڕاستیدا مەبەستم هێشتا بەهێزکردنی یەکێتی نیشتمانی و ڕەزامەندی و یارمەتیدانی گەلی کورد و دەستەبەرکردنی مافە نەتەوایەتییەکانییەتی و دژایەتیکردنی توندڕەوییە لە هەردوولا، بە حوکمی ئەزموونی کەسیی خۆم گەیشتمە ئەوەی توندڕەوی دەبێتە هۆی لێکەوتەی خراپ و هێشتا لەو باوەڕەدام دەبێت کورد و عەرەب لە عێراقدا پێکەوە بژین و هەمیشە هەوڵم دەدا عێراق، عێراقێکی سەربەرز و دیار و جیاوازبێت لە نێو وڵاتانی جیهاندا، چونکە لانکەی شارستانییەتی مرۆڤایەتییە، هەستمدەکرد هەردوولا متمانەیان پێم هەیە، بەڵام بەداخەوە هیچ دەستپێشخەرییەکم

لەلایەن حکومەتەوە نەدەبینی، بۆ بەهێزکردنی متمانەی گەلی کورد و چارەسەری دۆزە ڕەواکەی.

لە ماوەی ئەزموونی خۆم لە زیاتر لە وەزارەتێك و زیاتر لە سەردەمێك، دەمبینی هەندێك لە کەسانی سەربازی حەزیان نەدەکرد جەنگ لە کوردستاندا کۆتایی پێ بێت، چونکە بەردەوامی جەنگ بۆ ئەوان، قازانجی ماددی تێدا بوو. بۆیە دەبوو کەسە سوودمەندەکان لە ڕێڕەوی بزووتنەوەی کوردی لادەین و لە ریشەوە دەریان بێنین، چونکە بەردی سەر ڕێگەی هەر ملنانێك بوون بۆ چارەسەری قەزییەی کورد. ئەمەش ئەوە بوو بەردەوام هاوارم بۆ دەکرد، بێگومان بۆ من کارێکی سەخت بوو، بە وەزیری لە حکومەتێکدا بمێنمەوە سەرۆکەکەی عەبدولکەریم قاسم بێت و گەلی کوردی داماو بچەوسێنێتەوە و منیش کورد بم. بۆیە دەست لەکارکێشانەوەم پێشکەشکرد و لە ماڵی خۆمدا دانیشتم، پێشتر باسمکرد عەبدولکەریم لە پشتی هەموو ئەو ئاژاوە و ڕوداوانەوە بوو لە نێوان حکومەت و میللەتی کورددا ڕووی دەدا. پەیوەندی بە سەرۆك هۆزە دەستڕۆیشتووەکانەوە دەکرد و بە جیا جیا هانی دەدان بۆ خراپەکاریی و ئاژاوەگێڕیی، هەر ئەمەش بوو بە ڕۆژی نیوەڕۆ لە قەرەباڵغترین شەقامەکانی موسڵدا ئەحمەد ئاغای زێباری کوژرا. مەبەستی عەبدولکەریم دروستکردنی ئاژاوە و دوژمنایەتی بوو لە نێوان هەردوو هۆزی گەورەی (زێباری و بارزانی). کە هەردوولا بەهۆی دووری و غیابی بارزانی لە عێراق، گیانی دوژمنایەتیان لە نێواندا لە بیر چووبووەوە، بەڵام عەبدولکەریم قاسم سەرکەوتوو بوو لە سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی ئەو ڕق

و کینەیە لە نێوانیاندا. وەك ئەوەی حکومەتەکانی پێشوو دەیانکرد. هەروەها زۆر دڵنیاین عەبدولکەریم قاسم پلانی کوشتنی سدیق میرانی سەرۆکی هۆزی خۆشناوی دارشتووە، عەبدولکەریم قاسم هەوڵی دا لە ڕێگەی چاکسازی کشتوکاڵییەوە دەستڕۆیشتووەکان لەناو ببات، واتە مەبەستی عەبدولکەریم لە یاسای چاکسازی کشتوکاڵی، چاکسازییەکی ئابوریی نەبوو بۆ بەرژەوەندی جوتیاری هەژار و نەدار، بەڵکو ئامانجی لەناوبردنی دەرەبەگ و شێخ و ئاغاکان بوو، کە بە ڕوونی لە هەوڵ و نیازەکانیان دەترسا. لەبەر ئەوەی بارزانی دەرەبەگ نەبوو، ئەم مەسەلەیە ڕوونە، چونکە دەسەڵاتی بارزانی یان بنەماڵەی بارزانی لەسەر بنەمای خاوەندارێتی زەوی نەبووە، بارزانی گەڕایەوە بۆ کوردستان، ئاسایی بوو عەبدولکەریم قاسم ڕێگەیەکی تر بگرێتە بەر بۆ لەناوبردنی، کە دروستکردنی ئاژاوە و شەڕ و شۆڕی خێڵەکی بوو لە نێوان ئەو و سەرۆك هۆزەکانی تردا و دروستکردنی بیانوو بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ لە کوردستان.

## پچڕانی پەیوەندی نێوان من و عەبدولکەریم قاسم

لە ڕاستیدا هەستم بە گۆڕان دەکرد لە هەڵوێستی عەبدولکەریم قاسمدا، بە تایبەت دوای هەستیاری لە ڕادەبەدەری لە بەرامبەر هەڵوێستەکانم لە دادگاییکردنەکانی مەهداوی و ئەو ئامۆژگارییانەی بەردەوام دەمکرد لەوەی پەرتەوازەیی دروستنەکات لە نێوان هۆزەکانی کورددا. لە کاتێکدا ڕۆژگارێك ئەوپەڕی جێی متمانەی بووم، تا ئەو ڕادەیەی بانگی کردم بۆ ژوورەکەی و لەسەر جێگەی خۆی خەواندمی و خۆی لەسەر زەوییەکە خەوت و پێیگوتم: "ئێستا بە ئاسوودەیی دەخەوم، بێئەوەی دەستم لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەم بێت" وەك پێشتر باسمکرد. دەمزانی عەبدولکەریم زۆر بەرامبەرم گۆڕاوە، هەستمدەکرد هەر کە باسی کورد بهاتایەتە پێشەوە زۆر بە وریاییەوە قسەی لەگەڵ دەکردم، هەستم دەکرد هەندێك بابەتم لێدەشارێتەوە، لە کاتێکدا دەیزانی هیچکات هەستم کردبێت لەسەر هەڵەیە، چەند ڕاشکاوم لە بەرامبەریدا.

باسی زۆر شتی لەگەڵ نەدەکردم، ئەمجا زیاتر لێم بە ترێز بوو، تا ئەو ڕادەیەی ڕەزامەندی نەدەدا سەردانی کوردستان بکەم، لە کاتێکدا وەزیری کشتوکاڵ بووم. کاتێك ویستم سەردانی دەربەندیخان و بەنداوەکە بکەم کە وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری بووم لە حکومەتەکەیدا، ڕێگەی نەدام. دوایین سەردانم بۆ کوردستان لە دوای هەراکەی ئەلشەواف بوو، وەك پێشتر باسمکرد و لەسەر داوای ئەنجومەنی وەزیران بوو. کاتێك دەیبیست هەندێك لە سەرۆك هۆزە کوردییەکان، وەك وەزیرێکی کورد سەردانم

دەکەن، هەرچەند ئامۆژگاریم دەکردن کە پابەندن بە یەکێتی نیشتمانی و دڵسۆزی بۆ کۆماری عێراق. پێی دەگوتم: "ئەوە ئیشی تۆ نییە". بۆیە تا دەهات وێنەی ڕاستەقینەی خۆمم لەو شوێنەدا بۆ دەردەکەوت کە وایلێکردم پەنا ببەمە بەر دەستلەکارکێشانەوە.

من لەگەڵ جوتیاردا بووم و لەگەڵ دابینکردنی ژیانێکی شایستە بووم بۆیان، هەرکەس کەمێك ویژدانی هەبێت نابێت لەم بنەمایە لابدات. کەواتە من لەگەڵ چاکسازی کشتوکاڵیدا بووم، بەڵام دەبوو لە شێوازی جێبەجێکردنیدا هەندێك چاوی پێدا بخشێنرێتەوە، بەڵام عەبدولکەریم قاسم نەیدەبیست و گوێی نەدەگرت، چەپەکان ئەو یاسایەیان دانا و عەبدولکەریم قاسمیش بە خێرایی جێبەجێیکرد، تا سەرکردە دەرەبەگەکان لە ناو ببات. ئەمە بوو بە ئامانجی یەکەم و خرایە پێش ئامانجە سەرەکییەکەوە، کە دەبوو ئامانجە سەرەکییەکە خاڵی یەکەم بێت. کە جوتیار و ڕادەی توانای بوو لە بەرهەم هێناندا، ئەو شێوازەی عەبدولکەریم قاسم گرتییەبەر بۆ چاکسازی کشتوکاڵی، کە بەرهەمهێنانی گرتەوە لە بواری کشتوکاڵدا، لێرەدا جێی باسکردن نییە، بەڵام بیرمە من جێگرەوەیم خستە بەردەستی، کەچی سەرلەبەری ڕەتکردەوە، چونکە بە پەلە بوو لە جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسییەکەیدا. پێشنیارم بۆ کرد پەلە نەکات لە جێبەجێکردنی یاساکەدا، چونکە عێراق خاوەنی زەوییەکی زۆری ئەمیرییە و دەتوانرا دابەشبکرێت بەسەر ئەو جوتیارانەی زەوییان نەبوو. یان ماوەی سێ ساڵ بدرایە بەو خاوەن موڵکانەی هەزار دۆنم زەوی بەراو و سێ هەزار دۆنم زەوی دێمییان هەبوو لەسەر زەوییەکەی

بمایەتەوە، تا ئەو کاتەی زەوییە ئەمیرییەکان دابەشدەکرا، بەو مەرجەی خاوەن موڵك لە هەزار دۆنم زیاتری زەوییە بەراوەکەی و سێ هەزار دۆنم دێمییەکەی لەو سێ ساڵەدا بفرۆشتایە، دوای کۆتاییهاتنی سێ ساڵەکە و کۆتاییهاتنی دابەشکردنی زەوی ئەمیری، دەوڵەت دەست بکات بە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی و دەست گرتن بەسەر هەرچی زەوییەکی خاوەن موڵکەکان کە لەو ڕێژەیە زیاترە، بەڵام عەبدولکەریم قاسم بیرۆکەکەی قبووڵ نەکرد و بە یەك وشە وەڵامی دامەوە: "نەخێر مەبەستی من ئەوە نییە، کە لە مێشکی تۆدا دەخولێتەوە، ئامانجی من سیاسییە، دەمەوێت دەرەبەگەکان پەرش و بڵاو بکەم و هەرچی سەرۆك و هۆز و شێخەکانە بە هەر نرخێك بووە، بە زووترین کات لەناو ببەم".

بیرمە جارێکیان پێیگوتم: "شێخ موحەممەد عورەیبیم لە باشووری عێراق لەناوبرد، ئێستا ڕۆڵی کۆتاییهاتنی ئاغا و دەرەبەگەکانی باکوور هاتووە". شێوازی کۆتایی پێهێنانی دەسترۆیشتووەکان لە باکوور هەندێك جیاوازی هەبوو لە شێوازی کۆتایی پێهێنانیان لە باشوور، ئەمەش بەهۆی سرووشتی خاوەندارێتی دەرەبەگایەتی بچووکەوە لە باکوور بە بەراورد بەوەی لە باشووردا هەبوو. شێوازی بەگژیەکدادانی هۆزەکانی لەگەڵ یەکتر گرتەبەر، وێڕای دروستکردنی ناکۆکی و فیتنە لە نێوانیاندا لە ڕێگەی جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی. سەبارەت بە هەڵوێستی بزووتنەوەی کورد لە یاسای چاکسازی کشتوکاڵی، هەڵوێستێکی ئەرێنی بوو، چونکە خاوەندارێتی لە کوردستان لە سەر بنەمای ڕووبەری بچووك بوو، لە کوردستان ڕووبەری فراوان نەبوو و

زۆربەی زەوییەکان دێمی بوون. بۆیە یاسای چاکسازی کشتوکاڵی خاوەندارێتی کشتوکاڵیی لە کوردستاندا بە ٣٠٠ دۆنم دێمی و ٤٠ دۆنم بەراو دیاریکرد. لە ڕاستیدا بارزانی کە ڕابەری بزووتنەوەی کوردی بوو، وەك خۆی هیچ زیانێکی نەدەکرد لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵیدا، چونکە دەرەبەگ نەبوو، واتە سەرکردایەتیکردنی لەسەر بنەمای خاوەندارێتی زەوی نەبوو. لە کاتێکدا جێبەجێکردنی چاکسازی کشتوکاڵی خاوەندارێتییە دەرەبەگییەکانی لە ناوچەکەدا لەناودەبرد و بەرژەوەندی بارزانی لەوەدا بوو دەرەبەگە دەستڕۆیشتووەکان لێیان بدرێت و دەسەڵاتیان کەمبکرێتەوە. ئا لێرەوە پێم وابوو بارزانی هیچ زیانێکی نەدەکرد لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە لێدانی دەرەبەگەکان دەسەڵاتی زیاتر دەبوو.

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتەی عەبدولکەریم لە کوردستان گرتیەبەر، بە دروستکردنی فیتنە و لێدانی ئەم بە ئەو وەك پێشتر باسمکرد، بزووتنەوەی کورد ناچار بوو لە ڕووی ئەو سیاسەتەدا چەك هەڵبگرێت و بەرگری لە خۆی بکات. عەبدولکەریم قاسم هیچ بیانوویەکی نەبوو بۆ لێدانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، جگە لەوەی تۆمەتباری دەکرد بە بەکرێگیراوی هاوشێوەی فەرمانڕەوایانی پێش خۆی. لێدوانی یەك لە دوای یەکی دەدا، بەوەی بەڵگەی لەبەردەستە کە بەکرێگیراویی بزووتنەوەی کورد، ئەمریکا و بەریتانیای لە پشتەوەن.

پێم وایە عەبدولکەریم ئەگەر بەڵگەی هەبووایە بەوەی بزووتنەوەی

کورد لەلایەن بەریتانیا و ئەمریکاوە پاڵپشتی دەکرێ، دەیخستەڕو. لە سەرەتادا کێشەکە کێشەیەکی ناوخۆیی پەتی بوو، ئێستاش سوورم لەسەر ئەوەی عەبدولکەریم نەیدەزانی چۆن ڕەفتار لەگەڵ ویستە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا بکات و کەوتە ژێر کاریگەرییە جیاوازەکانەوە، وێڕای بەرگەنەگرتنی بۆ هەر کەسێك یان کوتلەیەك لە هەر ناوچەیەك لە ناوچەکانی عێراق دەسەڵاتی هەبووایە.

ئەوەی وام لێدەکات باوەڕم وابێت عەبدولکەریم قاسم بۆیە بزووتنەوەی کوردی تۆمەتبار دەکرد بە داردەستی ئینگلیز و ئەمریکا، ئەوە بوو حەزیدەکرد چەك بەکاربێنێت بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورد و بۆردومانکردنی گوندەکان لە لایەك و لە لایەکی ترەوە ئەو چەکەی عەبدولکەریم بەکاریهێنا بۆ لێدانی بزووتنەوەی کورد، چەکی ڕووسی بوون. بە تایبەت فڕۆکەی مێگ، کە لە ڕووسیا وەریگرتبوو. لە کاتێکدا بەداخەوە سۆڤێت و لایەنگرەکانیان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد لایەنگری میللەتانی مەزلوم و چەوساوەن!

ئەگەر قاسم قەناعەتی وابووایە کە شۆڕشی کورد، ئینگلیزی-ئەمریکییە، ئەی چۆن پێی وابوو دەتوانێت لە تەنها حەوت ڕۆژدا وەك خۆی دەیگوت لەناوی ببات؟ بەڵکو پێی وابوو شۆڕشی کورد کۆتایی هاتووە، لە کاتێکدا جیهانی دەرەوە و گەلی عێراق و سوپای عێراق دەیانزانی شۆڕشی کورد ماوە و چەندین ناوچە بە دەستی شۆڕشی کوردەوەیە. قاسم دەیویست بە لەناوبردنی خاوەن دەسەڵاتانی ئەو کاتە،

یارییەکەی خۆی بکات، بەڵام نەیدەزانی شۆڕش دەتوانێت مقاوەمە بکات و خۆیشی لە شۆڕشی ١٤ی ڕەمەزاندا تیاچوو و کۆتایی هات. ئەگەر شۆڕشی کورد بەکرێگیراو بووایە، ئەوا هەرچی بزووتنەوە نیشتمانییەکان لە عێراقدا هەبوون، بەکرێگیراو بوون. لە کاتێکدا هەموو هێزە سیاسییەکانی عێراق لەو سەردەمەدا دژی ڕژێمی دیکتاتۆری عەبدولکەریم قاسم و بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوسۆزبوون لەگەڵ شۆڕشی کورددا.

وەك باسمکرد لە هەموو هەڵوێستەکاندا کارم دەکرد بۆ چارەسەری کێشەکان، بە لێکتێگەیشتن و بە ڕێگەی ئاشتییانە و بەبێ پەنا بردنە بەر چارەسەری سەربازی. ئەم هەڵوێستەم بە لای هەلپەرستان و سوودمەندان و دووڕووەکانەوە مایەی قبووڵکردن نەبوو، ئەوانەی هەمیشە بە گوێی قاسمیاندا دەچرپاند، لە بری هاوکاریکردن لەگەڵی و چارەسەرکردنی کێشەکە بە شێوەیەکی ئاشتییانە، هانیان دەدا بە چەك لە بزووتنەوەی کورد بدات. ئاسایی بوو ئەوان من بە بەردی سەرەڕێی خۆیان ببینن، بۆیە بە هەموو شێوەیەك هەوڵیاندەدا تۆوی ناتەبایی لە نێوان من و قاسمدا بچێنن، لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتە نهێنییەکانیانەوە لەسەر من، سەرکەوتووش بوون لە هەوڵەکانیان.

لەو ڕووداوە سەیر و ئازاربەخشانەی ڕوونی دەکەمەوە چۆن قاسم لە سەرەتادا کاریگەر نەدەبوو بە بۆچوونی شیوعییەکانەوە و من جێگەی متمانەی بووم. دوای دەست لەکارکێشانەوەم، پێی وابوو پەیوەندیم بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە هەیە، فاتح جەباری کە ئەفسەرێکی بە

ڕەچەڵەك کورد و شیوعی بوو گیرا بوو، کەسوکارەکەی پەیوەندییان پێوەکردم بە قاسم بڵێم ئازادی بکات، چووم بۆ وەزارەتی بەرگری و نانی نیوەڕۆم لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم و ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدیدا خوارد، بە عەبدولکەریم قاسمم وت: فاتح جەباری ئەفسەرە و هاوڕێتە ئێستا لە زیندانە و بە فەرمانی تۆ گیراوە، کەسوکارەکەی پەیوەندییان پێوە کردووم و داوایان لێکردووم داوات لێبکەم ئازادی بکەیت. قاسم پێکەنی و وتی: "چۆن؟! فوئاد تۆ هاتوویت داوا دەکەیت فاتح جەباری ئازاد بکرێت؟". وتم: ئەی بۆ نا؟! هاوڕێی هەردووکمانە و هێشتا دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوانماندا ماوە. وتی: "باشە، کەمێك ڕاوەستە". لە ژوورەکەی خۆی چووە ژووری سکرتێرەکەی و نامەیەك کە بە خەتی فاتح جەباری بۆ داوود جەباری فەرماندەی فیرقەی دووی کەرکوك نووسرا بوو، هێنای و دەستیکرد بە خوێندنەوەی، تیایدا فاتح جەباری دوای هەراکەی ئەلشەواف باسی گەشتەکەمی بۆ کوردستان کردبوو، تیایدا هاتبوو: "داوود ئاگاداربە! ئەگەر فوئاد عارف هات بۆ کەرکوك کار دەکاتە سەر ئەو دیموکراتییەتە ئاڕاستەکراوەی پشتگیریمان کردووە، ئەمجا فوئاد عارف کێیە؟ بەکرێگیراوێکی داگیرکەر و کۆنەپەرستانە، دەرەبەگەکان لە ئاغا و شێخ و کۆنەپەرستان بە تاسەوە چاوەڕوانی هاتنی دەکەن و ئامادەن بۆ پێشوازیکردنی. بیرت نەچێت هاوڕێی عەبدولکەریم قاسمە و کاریگەری لەسەر دادەنێت، بۆیە هەرچیمان پێدەکرێت بۆ شکست پێهێنانی ئەم گەشتە، یان ڕێگە لێگرتنی، دەبێت بیکەین".

دوای ئەوەی عەبدولکەریم لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، کە فاتح

جەباری هاوڕێم نوسیبووی و من چووبووم بۆ ئەوەی داوا بکەم ئازاد بکرێت، پێمگوت: سەرباری ئەوە، هێشتا هاوڕێمە و داوات لێدەکەم ئازادی بکەیت و جیاوازی نێوان من و ئەو ئەمەیە. وەك باسمکرد لە سەردەمی پاشایەتی هاوسۆز بووم لەگەڵ شیوعییەکان، چونکە دژی حوکمی دەست تێکەڵبوون لەگەڵ داگیرکەر. پێم وایە زۆربەی خەڵك هاوسۆز بوون لەگەڵیان ئەگەر بە بێدەنگیش بووبێت، بەڵام بەداخەوە کە شۆڕش بەرپا بوو و کۆمار دامەزرا، شیوعییەکان هەڵەی زۆر گەورەیان کرد و خۆشەویستی و دۆستایەتی زۆرینەی خەڵکیان لەدەست دا و هاوسۆزی منیش لە بەرامبەریاندا گۆڕا و زیادەڕەوییانکرد لە دروستکردن و گەورەکردنەوەی هەندێك کێشە و کاریگەری خراپیان دانا لەسەر ئاڕاستە و بۆچوونی عەبدولکەریم قاسم. دادگاییکردنەکانی دادگای ئەلمەهداوی، کە بە حەز و ئارەزووی ئەفسەرە شیوعییەکان بەڕێوە دەچوو، وێڕای ڕوداوەکانی کەرکوك و موسڵ و ئەو توندوتیژییانەی هەندێك لە ئەندامانی حزبی شیوعی کردیان لەگەڵ هاولاتیاندا، ئاستی جەماوەرییانی هێنایە خوارەوە. تا ئەندازەی هەندێك لە ئەندامانیان بە هەڵوێستەکانیاندا چوونەوە، ئەوەی سەیر بوو جارێکیان عەبدولقادر ئیسماعیل هات بۆ سەردانم و مانگێك نەبوو بووبووم بە وەزیر، پیاوێکی قاچشکاوی لەگەڵ بوو، بە دارشەق دەڕۆیشت، پێیگوتم:

– فوئاد، ئەم کابرایە دەبینی! تۆ بەرگری لە ئاغاکان دەکەیت، ئەمە یەکێك لەو کەسانەیە مەحموود بەگی خەلیفە، سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست و پەرلەمانتاری پێشوو و هاوڕێت لێیداوە، نابینی چی بە قاچی

ئەو داماوە کردووە؟

وتم: من بەرگری لە ئاغا و دەرەبەگ ناکەم، بەرگری لە هەر کەسێك دەکەم تاوانی نەکردبێت و یاسا سزای بدات، ئەمجا با لەو کابرایە قاچ شکاوە بپرسم.

– فەرموو.

– ناوت چییە؟

– فلان

– خەڵکی کوێیت؟

– ڕەواندوز

– لە کەیەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکانت دەچیت بۆ نێو هۆزی برادۆست؟

– زیاتر لە دە ساڵە

– لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا، لە هاتوچۆکردنت بۆ نێو هۆزی برادۆست، کەس دەستی بۆ درێژ کردووی؟

– نەخێر

– ئەی مەحموود بەگ ئەو کاتە دەستڕۆیشتوو نەبوو، نەیدەتوانی تەعەدات لێبکات؟

– بەڵێ

– دۆخەکە چەند مانگێکی کەم بە قازانجی ئێوە کەوتەوە، چوون ماڵی مەحموود بەگتان سووتاند و تالانتان کرد. لە کاتێکدا ئەو دە ساڵە هیچ تەعدایەکی لێنەکردووی، ئێوەی شیوعییەکان دوای ئەوەی ماڵەکەیتان سووتاند، دەتەوێت هەروا دەستەوەستان بوەستێت، لە کاتێکدا دەتوانێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە؟ ئەڵبەت قاچت دەشکێنێت، ئەی بۆچی پێشتر قاچی نەشکاندی؟ پێت وایە سەرکردایەتی شۆڕش پشتیگریتان دەکات لە سووتاندن و تالانکردنی ماڵی خەڵکی و کوشتنی هاوڵاتیان، ئەگەر تاوانبارن لە شتێکدا فەرموو ئەوە یاسایە.

وەك باسمکرد بەر لە شۆڕشی تەمموز هاوسۆز بووم لەگەڵ شیوعییەکان، بەڵام لەگەڵ پشێویی و کاری هەڕەمەکیدا نەبووم، کە خەڵکی بەناوی نیشتمانپەروەرییەوە یاسا پێشێل بکەن، لە ژێر هیچ بیانوویەکدا. لەگەڵ ڕەفتاری تاکەکانی (المقاومة الشعبية). لەگەڵ لیژنەی پاراستنی کۆماردا نەبووم. هەروەها لەگەڵ ڕەفتارەکانی حەرەس قەومییەکاندا نەبووم، ئەو کاتەی لە سەردەمی عەبدولسەلام عارفدا وەزیر بووم.

لە ڕەفتارەکانی (المقاومة الشعبية)ش ناڕازی بووم، کاتێك پارێزگاری کەربەلا بووم، زۆر جار دەچووم بۆ بەغداد، ڕۆژێکیان لە بەغداد دەگەڕامەوە، پۆلیسێك و شۆفێرەکەم لەگەڵ بوون، ئۆتۆمبێلەکەی من ناسراو بوو بە ئۆتۆمبێلی پارێزگار، بەر لەوەی بگەینە کەربەلا، هەندێك قوتابی لە (المقاومة الشعبية) ڕایان گرتین. هەندێکیان بیجامەیان لەپێدا

بوو و دەمانچەیان بەدەستەوە بوو، ڕایان وەستاندین، پاسەوانەکە پێی وتن: "چیتان دەوێت؟". وتیان: "ئێمە مقاوەمەی شەعبین و ئەرکمانە ئۆتۆمبێلەکەتان بپشکنین". پاسەوانەکە پێی وتن: "بابە ئەمە پارێزگارە". یەکێکیان وتی: "ئەگەر پارێزگاریش بێت! ئەی ناشێت پارێزگار لە خائینان بێت؟". لە ئۆتۆمبێلەکە هاتینە خوارەوە و تێرمان لێدان و دووانیانمان خستە سندوقی ئۆتۆمبێلەکە و هێنامانن بۆ کەربەلا لەوێش تێرمان لێدان و ئەوجا بەرەڵامان کردن. پێم وایە زۆرێك لە خەڵکی هێشتا یادەوەری ناخۆش و ئازاربەخشیان هەیە لەسەر ڕەفتاری خراپی ئەوانە لە دەستدرێژیکردنە سەر کەرامەتی خەڵك و ئەشکەنجەدانی جەستەییان.

بیرمە کاتێك بۆ ماوەیەکی کەم لە ساڵی ١٩٥٩ بووم بە وەزیری ئەوقاف، پێم سەیر بوو لە نێو وەزارەتدا فەرمانگەیەك هەیە، هاتوو و ڕۆیشتوو و نوسراوی تایبەت بە خۆی هەیە کە ناوی (لیژنەی پاراستنی کۆمارە)، لە ڕاستیدا نەمتوانی ڕۆڵی ئەوانە قبووڵ بکەم، بۆیە بە خراپترین شێوە لە وەزارەت بەدەریانم نا و ڕێگەم نەدا بە فەرمانگەیەکی لەو جۆرە، لیژنەی پاراستنی کۆمار مانای چییە؟! ئەی ئەرکی گەل نییە کۆمار بپارێزێت؟ بیرمە ساڵەح کوبە جارێکیان لە ساڵی ١٩٥٩ هات بۆ لام و وتی: "لە بانکی ناوەندی هەڵهاتووم، چونکە لەوێ بووم و هەندێك هاواریان دەکرد ئەمە خائینە" هەرزوو پەیوەندیم بە ئەحمەد ساڵەح ئەلعەبدییەوە کرد و ڕێکارەکان لە بەرامبەریاندا گیرانەبەر.

جارێکیش ئەحمەد وەهاب پارێزگاری کەرکوك کە ناسیاوییم لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی قائیمقامی شارەبان بوو، خۆی خەڵکی کەربەلا بوو، بەیانییەك بە تووڕەییەوە هات بۆ لام.

– خەیر بێت، چیتە؟

– هەڵهاتووم!

– چۆن دەبێت پارێزگار بیت و لە کەرکوك هەڵبێیت؟.

– شیوعییەکان و داوود ئەلجەنابی فەرمانی دەستگیرکردنمیان دەرکردووە.

پەیوەندیم بە عەبدولکەریم قاسمەوە کرد بەردەست نەبوو، پەیوەندیم بە وەزیری ناوخۆ ئەحمەد موحەممەد یەحیاوە کرد و پێمگوت: پارێزگارەکەتان لە کەرکوك هەڵهاتووە و ئێستا لای منە. وتی: "بۆمانی بنێرە". ناردم و لەوێدا چارەسەری کێشەکەی کرا. ئەمە نمونەی ئەو ڕەفتارە هەر کەس بۆخۆییە بوو لەو ماوەیەدا، بە جۆرێك پارێزگار ناچار بێت لە پارێزگاکەی هەڵبێت.

دوای بەرپابوونی شۆڕش بە سێ ڕۆژ ١٨/تەموزی/١٩٥٨ فەرمانی دامەزراندنم بە پارێزگاری کەربەلا دەرکرا، پێم وایە هەر یەك لە ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری لیژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستان و نووری ئەحمەد تەها ئەندامی لیژنەی مەرکەزی سەردانیان کردم و گفتوگۆ لە نێوانماندا دروستبوو، لێم پرسین: ڕێك چیتان دەوێت؟ وتیان: "ئێمە

دەمانەوێت ئەو دەستوورەی بڕیارە بنووسرێتەوە، مافەكانی گەلی كورد دەستەبەر بكات". پێمگوتن: ڕێك ئەو شێوازە بنووسن كە پێتان وایە مافەكانی گەلی كورد دەستەبەر دەكات. چییان ویست لەسەر كاغەزێك نووسییان و دوای ئەوەی ڕەزامەندی مەبدەئیم لە نەجیب ئەلروبێعی وەرگرت لەبارەیەوە، بەو پێیەی سەرۆكی ئەنجومەنی سیادە بوو، كاغەزەكەم برد بۆ عەبدولكەریم قاسم.

سەبارەت بە هەڵویستم لە پارتی، دۆستایەتی كۆنم لەگەڵ زۆربەی سەركردەكانیدا هەیە، بە تایبەت سەركردەی كۆچكردوو مەلا مستەفا بارزانی و سكرتێری حزب ئیبراهیم ئەحمەد.

بیرمە ئیبراهیم ئەحمەد مانگێكی تەواو هەوڵی دا سەردانێكی عەبدولكەریم قاسم بكات نەیتوانی، ڕۆژێكیان لە ژووری پرسگە بینیم، پێیگوتم: ماوەی مانگێكە دەیەوێت سەردانی عەبدولكەریم قاسم بكات، ناتوانێت بیبینێت، دەستیم گرت و لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ وەزارەتی بەرگری و بردمە نوسینگەكەی عەبدولكەریم قاسم و پێمگوت: كەریم من دوورم لە كێشەی كورد و قەزییەی كوردەوە، بەڵام ئەم پیاوە پەیوەندیدارە بە قەزییەی كوردەوە و ورد و درشتی قەزییەی كورد دەزانێت، هەرچی ڕاستە پێت دەڵێت و ڕاستی و ڕاشكاویی لەگەڵ بەرژەوەندی تۆ و كۆمارە دەیەوێت قسەت لەگەڵ بكات. وتی: "فوئاد دانیشە". وتم: نەخێر من دەڕۆم، دەمەوێت هەردووكتان تەنها بن، دڵنیات دەكەمەوە هەرچی بڵێت ڕاست دەكات، تەنانەت ئەگەر لە قسەكانیدا قسە

بە منیش بلێیت.

پێدەچوو دوای ئەوە ڕاپۆرتەکان گەیشتبنە عەبدولکەریم قاسم و خەبەریان لێدابم کە لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و ئەندامانی تری پارتی دیموکراتی کوردستاندا کۆبوونەوەم کردبێت. بۆ مێژوو دەیڵێم ئەو ڕاپۆرتانە هەموویان درۆ بوون، وەك فوئاد عارف پەیوەندیم لەگەڵ خەڵکانی حیزبی کوردان و عەرەبان و هی تردا هەبوو، ئەگەر کەسێکم بینی یان قسەم لەگەڵ فلاّندا کرد مانای ئەوە نییە سەر بەو سیاسەتە یان بەو پارتە بوویم، بەلاّم بەداخەوە ئەوە دەردی بێدەرمانی ڕاپۆرتنووسان بوو. مانای ئەوە نەبوو من دوور و بێئاگا بوویم لە دۆزی کورد و ئازارەکانی میللەتی کورد، من خۆم کورد و عێراقی بووم و مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد بەلامەوە گرنگ بوون، نەك لایەنگریکردنی ئەم بۆچوونە یان ئەو بۆچوونە.

وەك لە بیرم بێت بە درێژایی تەمەنم ئەوەندەی لە ژێر کاریگەری ویژدان و بۆچوونی تایبەتی خۆمدا بووبێتم، نەکەوتوومەتە ژێر کاریگەری هیچ لایەنێکەوە، لە چوارچێوەی بەرژەوەندی میللەتەکەمدا، سەبارەت بە دەست لەکارکێشانەوەکەشم نە بە قسەی هیچ کەس و نە لە ژێر فشاری هیچ لایەنێکدا بووە، هەر ئەوەندە بوو ئاواتەخواز بووم یەکێتی نیشتمانی بچەسپێت، کە ڕەزامەندیم دەربڕی ببمە وەزیر لە حکومەتی شۆڕشدا، هەر ئەوە مەبەستم بوو، بەلاّم کە بینیم پەیوەندییەکانی نێوان عەبدولکەریم قاسم و کورد بەرەو خراپی دەچن، کشانەوەم لە وەزارەت بەشداریکردن

بوو لە پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی نێوان هەر دوو گەلی دێرینی عێراق. بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو بارودۆخ و ڕووداوە خەمناکانەی لەو کاتەدا لە کوردستاندا ڕوویان دا، ئەگەر لە باشووریش ڕوویان دابا، بە هەمان شێوە دەستم لەکاردەکێشایەوە، چونکە لای من هیچ جیاوازییەك لە نێوان باکوور و باشووردا نەبوو، هاوڕێیانم لە باشووردا زۆرترن وەك لە باکوور. هەوڵی زۆرمان لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم دا پەیوەندییەکان لەگەڵ کورد تێکنەچن، بەڵام سەرکەوتوو نەبووین، تەنانەت دکتۆر موحەممەد ئەلشەواف هەوڵی زۆری لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم دا ئەو بنێرێت بۆ کوردستان، ئەگەر ئامادە نییە من بنێرێت بۆ چارەسەر و لێکتێگەیشتن لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕشی کورددا، بەڵام قاسم داواکەی ڕەتکردەوە و پێداگری کرد، کارەکە لە دەستی ئەودایە و ئەو بەرپرسیارە لێی.

دەبێت بڵێم بزووتنەوەی کورد لە سەردەمی قاسمدا دروست نەبوو، بەڵکو ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕایەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم. ئەو کاتە سیاسەتە داگیرکارییە کورتبینییەکانی عوسمانی بوون بەهۆی دروستبوون و گەشەکردنی ئەو جۆرە بزووتنەوانە. لەو کاتەوە دەسەڵات هەمیشە بزووتنەوە ئۆپۆزسیۆنەکان بە خیانەت و بە بەکرێگیراوی تۆمەتبار دەکات. بۆیە جەخت دەکەمەوە لەوەی ئەستەمە بڕوا و متمانە بکەیت بە ڕاست و دروستی ڕاپۆرتەکان لە جیهانی سێیەمدا. بە زۆری ئاستی خەڵکەکە و ڕقە تایبەتەکانیان پیشان دەدات، کە ئەمەش لە بابەتیبوون بەتاڵی دەکاتەوە. هیچ دوور نییە سیاسییەك لە لوتکەی نیشتمانپەروەریدا بەهۆی ڕاپۆرتێکی نهێنییەوە دابەزێنرێت بۆ زەلکاوی

خیانەت و لە ڕاپۆرتێکی تردا نیشتمانپەروەرێکی دوێنێ دەبێتە خائینی ئەمڕۆ. ڕاپۆرت بەڵگەنامەیە و بەڵگەنامەش گرنگە، بەڵام گرنگتر خوێندنەوەی بەڵگەنامەیە، سەرۆك هۆزە کورد و عەرەبەکان کاتێك چوونە پاڵ وەزارەتەکەی عەلی جەودەت ئەلئەیوبییەوە، لەلایەن یاسین ئەلهاشمی و ڕەشید عالی ئەلگەیلانییەوە بە خیانەت تاوانبارکران، بەڵام کاتێك ئەلهاشمی (بەر لە کودەتاکەی ١٩٣٦) دوایین کابینەی پێکهێنا و ژمارەیەکی زۆر لە دەست ڕۆیشتووانی کورد لە ئاغا و دەرەبەگەکان ئامادەی بوون، بە شەست ئۆتۆمبێلی وەزارەت گواسترانەوە بۆ بەغداد، ئەمجا لە ڕاپۆرتەکانی ڕکەبەرەکانی ئەلهاشمی و ئەلگەیلانیدا بە خیانەت تاوانبارکران. بە قەناعەتی من ئەم کارانە زیاتر پەیوەندی بە حەز و بەرژەوەندی دەسەڵاتەوە هەیە پێش هەموو شتێکی تر، چونکە دیدێکی گۆڕاوە و نابێت هەمیشە وەربگیرێت و قبووڵکراو بێت، من بۆ خۆم هیچ کەس لە عێراقییەکان بە خیانەت تۆمەتبار ناکەم، تا خیانەتەکەیان لەسەر ساغ نەبێتەوە، عێراقییەکان بە کورد و عەرەبەوە دڵسۆزن بۆ ئەم نیشتمانە، بەڵام هەندێك لە دەسەڵاتداران خاوەنی ئەزموون نەبوون، دیدێکی کورتیان هەبوو و خۆپەرست بوون، هەر ئەوانە بوون کێشەیان دروستدەکرد و ئەمجا تۆمەتیان بەسەر ئەم و ئەودا دەبەخشییەوە، قاسم بوو بزووتنەوەی کورد و گەلی کورد و ئەوانی تریشی ووروژاند. بەشێك لە وەزیرەکان ئەو ڕاستییەیان درك پێکرد، لەپێشەوەی هەموویان موحەممەد ئەلشەوافی هاوڕێم، زۆری هەوڵ دا قەناعەت بە عەبدولکەریم بکات لە هەڵوێستی کەللەڕەقی خۆی بێتە خوارەوە، بەڵام سوودی نەبوو، بیرمە

چۆن بە عەبدولکەریمی وت بە تەواوی ئامادەیە بۆ خۆی بچێت بۆ کوردستان و قسە لەگەڵ لایەنی کوردیدا بکات، بۆ کۆتاییهێنانی کێشەکە، بەڵام عەبدولکەریم بە پاڵنەری تایبەت، سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی، لە کاتێکدا لە بنەڕەتدا کێشە نەبوو، بەڵام عەبدولکەریم دروستیکرد، لەبەر ئەوەی شارەزایی لە سیاسەتدا نەبوو، ڕێگەشی بە سیاسەتمەداران نەدەدا ڕۆڵی خۆیان بگێڕن. چۆن لیوایەکی سەربازی بەڕێوە دەبرد، هەر بەو جۆرەش وڵاتی بەڕێوە دەبرد، ئەو جۆرە ڕق و دەمارگیرییە لای بەرپرسی یەکەم هەمیشەماڵوێرانی بەسەر گەلاندا هێناوە، کە ئەنجام ڕۆڵەکانی باجی هەڵەی فەرمانڕەواکانیان دەدەن. من بۆ خۆم تف لەو جۆرە سیاسەتە ناشیرینە و گەمە و هونەرەکانی دەکەم.

### چیرۆکی دەست لەکارکێشانەوەم لە وەزارەت

دوای ئەوەی بە قەناعەتێکی تەواوەوە بڕیاری دەست لەکارکێشانەوەم دا، نووسراوێکی توندم نووسی، بیرمە میر حاج ئەحمەد بەڕەحمەت بێت، بە زمانێکی گلەیی ئامێزەوە قسەی کرد و وتی: "براکانم لە کوردستان ماڵەکانیان دەڕوخێنرێت بەسەریاندا و منیش لێرە دانیشتووم و هیچم پێناکرێت". دەست لەکارکێشانەوەکەم پیشان دا، هەستا و ماچیکردم، ئەمجا حەسەن ڕەفعەتی وەزیری نیشتەجێبوون هات بۆ لام لە بڕیاری دەست لەکارکێشانەوەکەم ئاگادارم کردەوە، ئەویش وتی پێی خۆشە دەست لەکاربکێشێتەوە و وتی: "دەمەوێت لەگەڵ تۆدا دەست لەکاربکێشمەوە". پێمگوت: فەرموو لە تەنیشت واژۆکەی مندا، واژۆی

خۆت بکە لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکە" کە دەقی دەست لەکارکێشانەوەکەی خوێندەوە، سەرەتا بە بیانووی ئەوەی بە زمانێکی توند نووسراوە، ئامادە نەبوو واژۆی بکات. پێمگوت: باشە هەرچۆنێکی دەنووسیت، بێنەوەی بیخوێنمەوە چی نووسراوە، لەگەڵت واژۆی دەکەم، بەڵام هەر ئەوەندە بێت دەقەکە، دەقی دەستلەکارکێشانەوە بێت. داواکەم برد و بە تووڕەییەوە چووم بۆ بارەگای عەبدولکەریم قاسم لە وەزارەتی بەرگری، عەبدولکەریم لەوێ بوو، حەسەن ڕەفعەتیشم لەگەڵ خۆم برد، زۆر لە نوسینگەکەی ماینەوە، حەسەن وتی: "با بڕۆین! دواتر دێینەوە". مامەوە تا عەبدولکەریم لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە، دەستی لە ملم کرد و لە تەنیشتم دانیشت، وتی: "دەبێت چی بکەم". وتم: هیچ قسەیەکم لەگەڵت نییە و هیچ شتێکم نییە بۆ وتن، بەڵام با چیرۆکێکی کورتت بۆ بگێڕمەوە، دەڵێت بازرگانێك هەبوو، کوڕێکی هەبوو، هەموو ڕۆژێك کوڕەکەی لە نێو قاپێکی گرانبەهادا نانی بۆ دەهێنا بۆ دوکانەکەی، بازرگانەکە زۆر شانازی بەو قاپەوە دەکرد، هەموو ڕۆژێك گوێی کوڕەکەی ڕادەکێشا ئاگای لێبێت لە دەستی نەکەوێتە خوارەوە و بشکێت، بازرگانانی هاوڕێی گلەیی ئەوەیان لێدەکرد بۆچی وا لە کوڕەکەی دەکات کە هیچ گوناهێکی نەکردووە و هێشتا قاپەکەش نەشکاوە، بەڵام بازرگانەکە دەیگوت لەوە دەترسێت لە دەستی بکەوێت و بشکێت، تا ڕۆژێك قاپ لە دەست کوڕە کەوتە خوارەوە و شکا، بەڵام بازرگان هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو و هیچ سزایەکی کوڕەکەی نەدا، بازرگانانی هاوڕێی سەریان سوڕما و وایانزانی سزایەکی زۆر توندی کوڕەکەی دەدات.

پرسیاری نهێنی بێدەنگبوونیان لێپرسی، وتی: تازە قاپەکە شکا و کارەکە کۆتایی هات و سزادان هیچ سوودێکی نییە. وتم: تۆش وابوویت، بەردەوام ئاگادارم دەکردیتەوە لە کێشەی لێکترازانی یەکێتی نیشتمانی، وا ئێستا ڕووی دا و هیچ گلەییەکم نییە جگە لەوەی لێت دووربکەومەوە.

عەبدولکەریم دەستلەکارکێشانەوەکەی خوێندەوە و وتی: "ئایا ئەمە پێشنیازە کە زیاتر لە یەك واژۆ هەڵدەگرێت؟ ئایا یاداشتە؟". وتم: باشە ناوی حەسەن ڕەفعەت ڕەش بکەوە با تەنیا دەستلەکارکێشانەوەی من بێت و حەسەن ڕەفعەت دواتر بە جیا دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بکات.

عەبدولکەریم زۆر قسەی لەگەڵ کردم و هەوڵی دا پەشیمانم بکاتەوە، من سووربووم لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکەم و بەجێمهێشت و چوومەوە بۆ ماڵ و ئیتر نەچووم بۆ وەزارەت، ڕۆژی دواتر دەبینم وەکیلی وەزیر هەندێك نوسراوی تایبەت بە وەزارەتی ناردۆتە ماڵەوە تا واژۆیان لەسەر بکەم.

دواتر زانیم عەبدولکەریم فەرمانی کردووە نوسراوەکانم بۆ بنێرنە ماڵەوە و لە ڕێگەی نوسینگەکەیەوە ئاگاداری جێگریان کردبووەوە کە نەخۆشم و ناتوانم بێمە وەزارەت و دەتوانم لە ماڵدا کاروبارەکانی وەزارەت بۆ چەند ڕۆژێك ڕایی بکەم، بەو هیوایەی پەشیمان ببمەوە لە دەستلەکارکێشانەوەکەم، بەڵام من بەبێ هیچ دوودڵییەك سووربووم لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکەم. تکام لێکردن هیچ شتێکی فەرمی

پەیوەندی بە وەزارەتەوە هەیە بۆمی نەنێرن، چونکە هیچ پەیوەندییەکم بە وەزارەتەوە نەماوە و واژۆیان لەسەر ناکەم.

عەبدولکەریم قاسم پەیوەندی پێوەکردم و داوای لێکردم سەردانی بکەم، بەڵام ئامادە نەبووم، ئەمجا داوای لێکردم بۆ خۆی بێتە ماڵێ، پێمگوت: ئەگەر ڕەزامەندی دەرنەبڕی لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکەم، دەرکەت لێناکەمەوە. ڕەزامەندی دەربڕی و ئەوجا سەردانیم کرد. بانگهێشتی خوانی نیوەڕۆی کردم، ئەوە دوایین دانیشتن بوو لە نێوانماندا، بێدەنگی باڵی بەسەر دانیشتنەکەدا کێشابوو، کە ئاماژەبوو بۆ کۆتا ناونیشانی نێوانمان، دوای هاوڕێیەتییەکی دوور و درێژ کە زیاتر لە ۳۰ ساڵی خایاند، ئەمە چیرۆکی دەستلەکارکێشانەوەکەم بوو، بەڵام حەسەن ڕەفعەت دەستی لەکار نەکێشایەوە.

دوای دەستلەکارکێشانەوەکەم، هەستمدەکرد چاودێری دەکرێم، هەرچەند پێش دەستلەکارکێشانەوەکەشم هەستم پێکردبوو، دوای ئەوەی چەند هاوڕێیەك ئاگاداریان کردمەوە ئیتر بە دڵنیاییەوە زانیم خراومەتە ژێر چاودێرییەوە.

لەو ماوەیەدا تەکەتولاتی سیاسیی ڕوون و ئاشکرا هەبوون و هەندێك کەسایەتی سیاسیی سەردانیانکردم، لەوانە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، دووجار لە ماڵی خۆماندا سەردانیکردم، تاهیر یەحیاش چەند جارێك و ژمارەیەك لەو وەزیرانەی هێشتا لە کابینەکەی عەبدولکەریم قاسمدا بوون، بیرمە دوای ئازادکردن و دەرچوون لە زیندان سەردانی خوالێخۆشبوو عەبدولسەلام عارفم کرد.

## ماوەی پێش شۆڕشی ١٤ ڕەمەزان

لە دوای دەستلەکارکێشانەوەم لە کابینەکەی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٦١، تا بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ ڕەمەزان، پێشبینی کودەتا و کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسمم دەکرد. بیرمە جارێکیان بە باباعەلی حەفیدم وت: بە دڵنیاییەوە لە چەند مانگی داهاتوودا کودەتایەك ڕوودەدات. تەنانەت گرەوم لەگەڵی کرد لەسەر ڕاستی پێشبینییەکەم، ئەگەر ڕاست دەرچوو دەبێت لە بەرامبەریدا دوو پارچە زەویم بداتێ، تا ئێستاش باباعەلی قەرزدارە و زەوییەکەی نەداومەتێ. هەندێك لە پلاندارێژەرانی کودەتای ڕەمەزان پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵمدا هەبوو، بۆ نمونە تاهیر یەحیا و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و هی تریش، ناوە ناوە سەردانیان دەکردم، لە گفتوگۆکانی نێوانماندا دەمخوێندەوە کودەتایەك ڕوودەدات. بۆیە جارێکیان بە تاهیر یەحیام وت: ئێمەی پیاوانی سەربازی بە کەڵکی حوکمڕانی نایەین، ئەگەر کودەتاتان کرد و دەسەڵاتتان گۆڕی، پێویستە دەسەڵات بدرێتە دەستی کەسانی شارەزا و دەبێت سەرۆك کۆمار بە هەڵبژاردن بێت و کار بە سیستمی پەرلەمانی بکرێت لە ئیدارەدانی وڵاتدا. تاهیر یەحیا پرسیاریکرد: "ئەگەر کودەتاکەمان سەرکەوت، کێت پێ باشە ببێتە سەرۆك وەزیران"؟ پێشنیاری حیکمەت سلێمانم کرد و هەرواش دەرچوو، قسەم لەگەڵ حیکمەت سلێمان کرد لەو بارەیەوە، ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی بەو مەرجەی لە دوای ڕووخانی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم لە شەش مانگ زیاتر نەمێنێتەوە، بەڵام ئەحمەد

حەسەن ئەلبەکر هات بۆ لام و وتی: "حیکمەت سلێمان تەمەنی گەورە بووە و ناتوانێت ئەرکی کابینەکە ببات بەڕێوە". وتم: بە پێچەوانەوە ئەوەی تۆ دەیڵێیت تەواو شایانی ئەو بەرپرسیارێتییەیە و ڕەزامەند بووە بۆ تەنها شەش مانگ، تاهیر یەحیای نارد بۆ ئەوەی حیکمەت سلێمان ببینێت و لە دۆخەکە دڵنیا بێت، بەڵام دەرکەوت ڕەزامەند نەبوون لەسەری، هەرچەند بە لای منەوە سەرکەوتووترین کەس بوو بۆ ئەو بارودۆخە، بە تایبەت دوای ڕووخاندنی ڕژێمی قاسم.

دوای ماوەیەك یەکێك لەو هاوڕێیانەی بەشدار بوو لە پلاندانانی شۆڕشی ١٤ ڕەمەزان، ئاگاداریکردم ڕازگری پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی عەلی ساڵەح ئەلسەعدی حەز دەکات چاوی پێتبکەوێت، لە ماڵی کازم ئەلعەبادیی هاوڕێی سەردەمی خوێندنم چاومان بە یەکتر کەوت، کە لە سەردەمی پاشایەتیدا فەرماندەی هێزی ئاسمانی بوو. باسی چۆنێتی دەستلەکارکێشانەوەکەم لە کابینەکەی قاسم و ئەو دۆخەی وڵات تێیکەوتووە بۆ کرد. عەلی ساڵەح ئەلسەعدی لەسەر دۆزی کورد و ڕێگەکانی چارەسەرکردنی، قسەی لەگەڵ کردم ئەگەر کودەتاکەیان سەرکەوت. وتم: من هەرچەندە کوردم و دۆزی کورد بەلامەوە گرنگە، بەڵام پێم باشە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکەن بە نوێنەرانی بزووتنەوەی کوردەوە. پێشنیارمکرد پەیوەندی بە ساڵەح یوسفییەوە بکەن، کە ئەو کاتە بە نهێنی لە بەغداد بوو. ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پێشنیارەکە و پەیوەندی پێوەکرا، من لای خۆمەوە پەیوەندیم بە شەوکەت ئاکرێییەوە کرد و بابەتەکەم تێگەیاند، چونکە شەوکەت ئاکرێیی شوێنی ساڵەح

یوسفیی دەزانی، ڕۆژی دواتر کاتژمێر دەی شەو، لە گۆڕەپانی عەنتەر بە ئامادەبوونی شەوکەوت ئاکرێیی، سالّەح یوسفی و عەلی سالّەح ئەلسەعدی یەکتریان بینی و لەوێوە ئەلسەعدی بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەیانبات بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە. لەو کۆبوونەوەیەدا قسەو باسی زۆر لە نێوان سالّەح یوسفی و ئەلسەعدی و ئەوانەی لەگەڵیان بوون، کرا. دەربارەی دۆزی کورد ڕێککەوتن لەسەری، ئەگەر کودەتا سەرکەوت.

## ڕودانی شۆڕش و بانگهێشتکردنم بۆ ئێزگەی ڕادیۆ

هەر کە کودەتا ڕووی دا، لە ئێزگەی ڕادیۆوە گوێم لێبوو، هەرزوو بانگکرام بۆ ڕادیۆ، تەلەفۆنی وەزیرەکان پسا بوون، ڕۆژی هەینی بوو، شۆفێری ئۆتۆمبێلەکەم لە مۆڵەتدا بوو. خۆم ئۆتۆمبێلەکەم لێخوڕی، دەمانچەیەکم پێبوو، نەمتوانی لە شەقامی کۆماری بپەڕمەوە، چونکە قەدەغەی هاتوچۆیان لێکردبوو، لە شەقامی کیفاحەوە چووم، بەڵام نەیارانی کودەتا لەلایەنگرانی قاسم بەربەستیان لە جادەکان دانابوو و بەرگرییان دەکرد و لە دوو لاوە تەقە لە یەکتر دەکرا، دەبابەیەك خۆی بە ئۆتۆمبێلەکەمدا کێشا و پەکیخست، دوو کەس بەرەو لام هاتن و هاواریان دەکرد: "بووەستە!" دەمانچەکەم دەرکرد و تەقەم لێکردن و هەڵهاتن.

ئۆتۆمبێلێکی سەربازی تێپەڕی دەنگم دا: ڕاوەستە. نەوەستا بۆیە بەدوایدا ڕامکرد و خۆمم پێدا هەڵواسی و سەرکەوتم، دەمانچەکەم لە شۆفێرەکە ڕاکێشا و پێمگوت: تۆ لەگەڵ شۆڕشدای یان لە دژی شۆڕشی؟. وتی: "من لەگەڵ شۆڕشدام". وتم: من عەمید فوئاد عارفم لە

ئێزگەوە بانگیان کردووم. ئەفسەرێك بە پلەی ملازم لە تەنیشتی دانیشتبوو. داوام لە شۆفێرەکە کرد بمگەیێنێتە ئێزگە، داوای لێبووردنیان کرد کە ئەوان لە ئەرکێکدان ناتوانن داواکەم جێبەجێ بکەن، بەڵام وتیان دەتبەینە لای فەرماندەی کەتیبەکەمان، بۆ ئەوەی بەرپرسیار نەبن، ڕازی بووم. هێشتا ڕووی دەمانچەکەشم لێیان بوو، پرسیاری فەرماندەی کەتیبەکەیانم کرد، وتیان: فلانە، دەرچو دەیناسم. چووینە کەتیبە، داوام لێکردن لە ڕێگەی پردی ئەحرارەوە بمگەیەننە ئێزگەی ڕادیۆ.

گەیشتمە ئێزگە و هێشتا دەمانچەکەم بە دەستەوە بوو، یەکەم کەس لە ئێزگە تووشم بوو، نەقیب عەبدوڵلا مەجیدی پاسەوانی عەبدولسەلام عارف بوو. پێم وابوو حیکمەت سلێمان و شێخ ڕەزا ئەلشەبیبی و مەهدی کوببە لەوێن، لەسەر پێشنیارەکەم سەبارەت بە پێکهێنانی وەزارەتێکی مەدەنی لەو ئەندامانەی مێژوو و ئەزموونی سیاسییان هەبوو، بەڵام ئەوانەی پێشبینیم کردبوون هیچکامیانم نەبینی، تەنها عەبدولسەلام عارف و عەلی ساڵەح ئەلسەعدی و ساڵەح عەماش و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرم بینین، پرسیارم کرد: وەزیرە مەدەنییەکان لە کوێن؟ ئەی لەسەر ئەوە ڕێکنەکەوتین؟. ساڵەح مەهدی عەماش وتی: "باوکی فەرهاد ئێمە شۆڕش بکەین و بیدەینە دەستی ئەفەندییەکانەوە، بۆ ئێمە چیمانە؟. لەولاوە عەبدولسەلام هەڵیدایە و وتی: "چما ئێمە چیمانە؟ بۆچی دەسەڵات بە دەستی ئێمەوە نەبێت؟. ئەمجا وتی: "باوکی فەرهاد، ئێمە پشتگیری تۆمان دەوێت". وتم: من هیچ هێزێکی سیاسیم نییە تا پشتگیریتان بکەم، چونکە نوێنەری هیچ کەسێك نیم.

ڕوومکردە ساڵەح ئەلسەعدی و پێمگوت: پێشتر پەیوەندیت کرد بە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، ئێستاش دەتوانن پەیوەندییان پێوە بکەن. هەر لەوێدا پەیوەندی کرد بە شەوکەت ئاکرێییەوە، تا پەیوەندی بکات بە ساڵەح یوسفییەوە و پێکەوە بێن بۆ ئێزگە. بە ساڵەح یوسفیم وت: تۆ نوێنەرایەتی بزووتنەوەی کوردی و پارتی دیموکراتی کوردستان دەکەیت، ئێستا دەتوانیت چۆن ڕەفتار بکەیت؟ ساڵەح یوسفی وتی: "بەبێ تۆ هیچ ڕەفتارێك ناكەم". وتم: زۆر باشە. هەستاین پێکەوە پشتگیرییەکمان بۆ شۆڕشی چواردەی ڕەمەزان نووسی و لە پشتگیرییەکەدا داوای ئۆتۆنۆمیمان کردبوو، پشتگیرییەکە لە ئێزگەی بەغداد بەناوی من و ساڵەح یوسفی نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانەوە خوێندرایەوە.

بیرمە بەر لەوەی بچمە لای عەبدولسەلام عارف، ڕائید عەبدوڵڵا داوای لێکردم دەمانچەکەی ڕادەست بکەم، بە بیانووی ئەوەی هێشتا کاتژمێرە یەکەمەکانی شۆڕشە و عەبدولکەریم قاسم مقاوەمە دەکات، کە ئێوارە داهات هەستام بگەڕێمەوە بۆ ماڵ، داوای دەمانچەکەم کرد، عەبدولسەلام عارف پێکەنی و وتی: "باوکی فەرهاد ئەو دەمانچەیەم بدەرەوە کە لێتسەندم، تا ئەو دەمانچەی کە لێت براوە بتدەمەوە". وتم: عەبدولسەلام لێمیان نەبرد، بەڵکو خۆم پێمدان، من لەو کەسانە نیم دەمانچەی کەس ببەم، بەڵام دەزانیت لە کاتی خۆیدا من چۆن دەمانچەکەم لە دەست دەرهێنایت. عەبدولسەلام لە مەبەستی وەڵامدانەوەکە تێگەیشت، چونکە من ئەو دەمانچەیەم لە دەست دەرهێنا لە کاتی دەمەقاڵێی لەگەڵ

عەبدولکەریم قاسمدا، ئەمجا وتی ویستوویەتی خۆی بکوژێت. ڕائید عەبدوڵڵا مەجید دەمانچەکەی بۆ هێنامەوە و لە ئێزگە هاتمە دەرەوە.

بەیانی ڕۆژی دواتر ٩ شوباتی ١٩٦٣ ئۆتۆمبێلێك هات بە دوامدا و بردمی بۆ ئێزگەی ڕادیۆ و پێیان وتم: "ئێستا عەبدولکەریم قاسم بە کەلەپچەکراوی دەهێنرێت بۆ ئێرە و لەسێدارەی دەدەین". وتم: ناتوانم ئەو دیمەنە ببینم. داوای لێبوردنم کرد و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

**بوونە وەزیر لە سەردەمی نوێدا**

ڕۆژێك دوای شۆڕش ئەنجومەنی وەزیران کۆبوونەوەی خۆی کرد و تیایدا بە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئەوقاف دانرابووم، بابا عەلی شێخ مەحموودی حەفیدیش وەزیری کشتوکاڵ بوو. کۆبوونەوەکە لە بینای کۆشکی شاهانەدا کرا و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بەو پێیەی سەرۆك وەزیران بوو سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکەی کرد.

سەبارەت بە کەشوهەوای نێو کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف بە بەراورد بە ئەنجومەنی وەزیرانی سەردەمی قاسم، دەتوانم بڵێم ئازادی تەواوی تێدا بوو. ئەڵبەت ئەمەش چەند هۆکارێکی هەبوو، بەبێ ئاگاداری وەزیرە سەربەخۆکان کۆبوونەوەیەکی تر دەکرا، بەناوی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کە لە سەردەمی دەسەڵاتی قاسمدا ئەو جۆرە کۆبوونەوەیە نەبوو. سەرۆکایەتیکردنی ئەو کۆبوونەوەیە وەرزی بوو. کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی شۆڕش جیابوون لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیران و

وەك بزانم بڕی ٥٠ هەزار دینار وەك دەرماڵەی حیزبی دانرا بوو بۆ هەردوو سەرکردایەتی (قەومی و قوتری)، جێی باسە عەبدولسەلام عارف ئامادەی کۆبوونەوەکانی وەزیران دەبوو. بە گشتی گفتوگۆکان کراوە بوون، لە هەندێك کاروباردا ئەنجومەنی وەزیران سوور دەبوون لەسەر قسەی خۆیان، ئەگەر لەگەڵ بۆچوونی عەبدولسەلام عارفیشدا دژ هاتبایەوە. ئەم قسەیە وەك ئەمانەتێکی مێژوویی دەیڵێم: بۆ نمونە باسی قەزییەکەی کازم خەڵەف دەکەم، کە لە سەردەمی قاسمدا باڵوێزی عێراق بوو لە لەندەن و لە کارەکەی لادرا.

دوای شۆڕشی ١٤ ڕەمەزان (تالب شبیب)ی وەزیری دەرەوە، ویستی بیگەڕێنێتەوە، پرسیاری لێکردم پێت چۆنە؟ وتم پیاوێکی باشە و گەڕاندنەوەی بۆ وەزیفە بڕیارێکی دروستە، بەڵام بێئەوەی بزانین بۆچی عەبدولسەلام ڕقی لە کازم خەڵەف بوو، وەزیری دەرەوە داوای لێکردم لە خستنەڕووی باسەکە لە ئەنجومەنی وەزیران پشتگیری بکەم. کاتێك باسی کازم خەڵەف خرایە ڕوو، عەبدولسەلام پێی قەڵس بوو وتی: "هەم کازم و هەم خەڵەف و هەم دەتانەوێت بیگەڕێنمەوە... نایگەڕێنمەوە". بەڵام دوای بێنە و بەردەیەکی زۆر، دواجار عەبدولسەلام ڕازی بوو بە بۆچوون و قسەکەی وەزیری دەرەوە و کازم گەڕێنرایەوە بۆ وەزیفە لە وەزارەتی دەرەوە، هەرچەندە عەبدولسەلام بە توندی ناڕازی بوو، بەڵام بڕیارەکان بە زۆرینەی دەنگ پەسەند دەکران.

سەبارەت بە داڕشتنی ئەو بەیانەی ڕۆژی هەشتی شوباتی ١٩٦٣

بڵاوکرایەوە و خوێندرایەوە، بە درێژی لە بیرم نەماوە، بۆ مێژوو دەبێت بیڵێم باسکردنی دۆزی کورد تیایدا هەرچەندە جۆرێك لە ڕووکەش و ناڕوونی تێدا بوو، بەڵام ئاماژەی کردبوو بە بەهێزکردنی برایەتی کورد و عەرەب، بەو جۆرەی بەرژەوەندی هەردوو نەتەوە دابین بکات و جەختی کردبووەوە لە ڕێزگرتن لە مافەکانی کەمە نەتەوایەتییەکانی تر. نازانم ئەگەر کوردیان بە کەمە نەتەوایەتی دانابێت یان نا، چونکە دەستەواژەی ڕێزگرتن لە مافی کەمە نەتەوایەتییەکان لە پاشی دەستەواژەی بەهێزکردنی برایەتی کورد و عەرەبەوە هاتبوو. ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە دەستەواژەی مافی کەمە نەتەوایەتییەکان ئەوەی پەیوەندی بە دۆزی کوردەوە هەبوو لە زۆر لایەنەوە لە مێشکی سەرکردەکانی شۆڕشی ڕەمەزاندا ڕوون نەبوو. ئایا مانای ئۆتۆنۆمی بوو؟ ئایا مانای ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنانەوەی ناوچەکە بوو؟ ئایا مانای نوێنەرایەتیکردن بوو لە وەزارەتدا؟ بۆیە دەڵێم ئەو دەستەواژەیە هەندێك ناڕوونی تێدا بوو.

ئەوە باشترین بەڵگە بوو بۆ گفتوگۆکردن لە نێوان سەرکردەکانی بزووتنەوەی چەکداری کورد و سەرانی شۆڕشی ڕەمەزاندا. هەرچەندە پێشتر پەیوەندییەك کرابوو لە نێوان عەلی ساڵەح ئەلسەعدی و هەندێك لە گەورە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان وەك ساڵەح یوسفی. بەهەرحاڵ بەیانەکە لە زۆر شوێندا جەختی کردبووەوە لەسەر یەکێتی نیشتمانی و ئازادییە دیموکراتییەکان، لە ئەنجامی دەرکردنی ئەو بەیانەوە کۆمەڵێك کەسایەتی کورد کە ئەو کاتە لە بەغداد بوون و پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ سەرکردەکانی بزووتنەوەی کورددا هەبوو. دوای

نزیکەی مانگێك لە بەرپابوونی شۆڕش لە ٥ی ئاداردا شاندێکی کورد بە سەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی هاتن بۆ بەغداد و منیش لەو کۆبوونەوەیەدا کە بەو بۆنەیەوە بەسترا ئامادە بووم. خوالێخۆشبوو ساڵەح مەهدی عەماشیش لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە بوو، هەندێك بابەتی ورووژاند کە پێویست نەبوو بوروژێنرێت، بۆیە بە توندی ڕەخنەم لێگرت و پێمگوت: ئێمە چارەسەرمان دەوێت و دەمانەوێت بگەینە ڕێککەوتن، بەڵام تۆ رابوردوو زیندوو دەکەیتەوە و دۆخەکە ئاڵۆز دەکەیت. بۆیە مام جەلال ڕووی تێکردم و وتی: "کاك فوئاد وازمان لێبێنە، ئێمەی حزبی بەم شێوازە نەبێت ناتوانین لە یەك بگەین". دوای ئەوە ئیتر ئامادەی هیچ کۆبوونەوەیەکی نێوان هەردوولا نەبووم. بابا عەلیش هانیدام کە ئامادەی کۆبوونەوەکان نەبم و وتی: "کاك فوئاد باشتر وایە ئامادەی کۆبوونەوەکان نەبیت، چونکە بەو هەڵچوون و تووڕەبوونانەت بە کەڵکی ئەو جۆرە کۆبوونەوە گەرمانە نایەیت".

ئەوە یەکەم چاوپێکەوتنی ڕووبەڕووم بوو لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا، بە گەنجێکی چالاك و زیرەك و بە توانا دەرکەوت، لە چاوپێکەوتنمان لەگەڵ جەمال عەبدولناسر ئەوەم زیاتر بۆ ڕوون بووەوە کە دواتر بە درێژی دێمە سەری.

دوای ماوەیەك بڕیار درا شاندێك بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کورد پێکبهێنرێت جگە لە من وەك وەزیرێکی کورد، هەریەك لە تاهیر یەحیا و عەلی حەیدەر سلێمان باڵوێزی عێراق لە واشنتۆنی لەخۆدەگرت. شاندەکە

بە ڕاستی دەیانویست بگەنە ئەنجامێکی ئەرێنی کە خزمەت بە یەکێتی نیشتمانی بکات لە عێراقدا و مافەکانی گەلی کوردیش دەستەبەر و زامن بکات. بەشداریکردنی عەلی حەیدەر لە شاندەکەدا، تەنها ئەوەبوو هاوڕێ و جێمتمانەی عەبدولسەلام عارف بوو، لەو کاتەوە ئەو دۆستایەتییە لە نێوانیاندا دروست بووبوو، کە پاسەوانی عەبدولسەلام عارف بوو بۆن. پیاوێکی لەسەرخۆ و نەرمونیان بوو، هەرچەندە کورد بوو، بەلام ڕۆلی لە کەمکردنەوەی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد، هۆکارێکی تر بوو لە هەلبژاردنی بە ئەندامی شاندەکە. بە فرۆکەیەکی هێلیکۆپتەر گەیشتینە ناوچەی (چوارقوڕنە)، بارزانی خۆی لەگەل سەرۆک هۆزەکان و هەندێك لە ئەندامانی بالای پارتی و چەندینی تریش لە پێشوازیماندا بوون. مەبەستی بارزانی لەوەدا ئەوە بوو کە پێمان بلێت ئەو تەنها نوێنەری پارتی نییە، بەلکو نوێنەری سەرۆك هۆزەکانیشە، سەرۆك هۆزەکانیش زیاتر لە جارێك ئاماژەیان دا بە پشتگیریکردنیان بۆ بارزانی. عەلی حەیدەر سلێمان ڕەشنووسی پرۆژەکەی دەولەتی خوێندەوە سەبارەت بە چارەسەری قەزییەی کورد، بەلام مەلا مستەفا بارزانی پێی ڕازی نەبوو، وتی: "ئێمە پرۆژەی خۆمان هەیە و لە بنەڕەتدا ئێمە داوای ئۆتۆنۆمیمان کردووە".

بە بڕوای من حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لەو کاتەدا توانای چارەسەر و دیاریکردنی مافەکانی گەلی کوردی نەبوو، بۆیە پەنای بردە بەر کەسایەتییە نیشتمانی و عەرەبەکان و پرسوڕای پێکردن، وەك جەمال عەبدولناسر و ئەحمەد بن بێللە و بەڕێز جەلال تالەبانیشی بەشداری پێکرد، لە گفتوگۆکان لەگەل ئەو دوو سەرکردەیەدا، من هەر لە بنەڕەتدا

ڕازی نەبووم لەسەر ئەو پرۆژەیەی دەوڵەت پێشنیاری کردبوو، چونکە بە دیدی من خواستەکانی گەلی کوردی بەدی نەدەهێنا، بۆیە لە ڕێگەی کەسێکەوە، سەرکردایەتی کورد و خودی بارزانیم ئاگادار کردەوە، کە من ڕازی نیم لەو پرۆژەیەی کە حکومەت لەو بارەیەوە پێشنیاریکردووە. تەنانەت سەرکردایەتی کوردم ئاگادار کردەوە، ئەگەر بەو پرۆژەیە ڕازی بن، ئەوا بەرپرسیاریەتییەکە دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان نەك من، بۆیە هیچ بەشدارییەکم لە گفتوگۆکاندا نەکرد کە لەو بارەیەوە بەڕێوەچوون.

لە دیارترین ئەوانەی لەو یاداشتەدا هاتبوو کە سەرکردایەتی کورد پێشکەشی کرد، بەو پێیەی یەکێك بووم لە ئەندامانی دانوستانکاری حکومەتی عێراق، دانپێدانانی خێرا بوو بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق و جێگیرکردنی لە دەستوور و خوێندنەوەی لە ئێزگەی ڕادیۆی عێراق و بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فەرمی و پێدانی وێنەیەکی بە نەتەوە یەکگرتووەکان. یاداشتەکە ئەو ناوچانەی دیاریکردبوو کە دەکەونە چوارچێوەی یاسای ئۆتۆنۆمییەوە. هەروەها یاداشتەکە جەختی کردبووەوە لەسەر ئەوەی دەبێت زمانی کوردی زمانی فەرمی ناوچەکە بێت. ئەو ناوچانەش کە هاولاتیانی کوردی لێنیشتەجێ نین، غەیرە کوردەکان بە زمانی خۆیان دەخوێنن لەگەڵ خوێندنی زمانی کوردیدا.

وەڵامی حکومەت بۆ یاداشتەکە وەڵامێکی نەرێنی بوو، چونکە قەناعەتی تەواوی نەبوو بەوەی تیایدا هاتبوو. لە کاتێکدا وتبووی: "قابیلی تاوتوێکردن و گفتوگۆیە و قسەی کۆتایی نییە، بەڵام گوزارشت

دەکات لە داواکاری و دید و بۆچوونی جوولأنەوەی کوردی کە لە پێناویدا گەلی کورد چەکی هەلگرتووە".

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا شاندێکی میللی پێکبهێنرێت و بڕیار درا دانوستان لە نێوان شاندی میللی و سەرکردەکانی جوولأنەوەی کورددا بکرێت بەو جۆرە خزمەتی یەکێتی نیشتمانی دەکات لە عێراقدا.

شاندەکە لە کەسانی سیاسیی و خاوەن خەباتی رابوردوو لە ولأتدا پێکهێنرا، بریتیبوون لە هەریەك لە موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی کە لە ماوەیەکی مێژوویی سیاسیی خۆیدا ڕابەرایەتی پارتی بەرەی میللی دەکرد و پارێزەر فائق ئەلسامەڕائی کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی پارتی سەربەخۆیی و ماوەیەکیش جێگری سەرۆکی پارتەکە بوو و پارێزەر حسەین جەمیل سکرتێری پارتی نیشتمانی دیموکراسیی و پارێزەر فەیسەڵ حەبیب خەیزەران، کە لەو ماوەیەدا ئەندامێکی دیاری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوو، هەروەها هەریەك لە عەبدولعەزیز ئەلدوری سەرۆکی زانکۆی بەغداد و زەید ئەحمەد عوسمان کەسایەتی کورد لەو شاندەدا بەشدارییان پێکرا.

سەبارەت بە سرووشت و ئەنجامی دانوستانەکانی شاندی میللی لەگەڵ سەرکردایەتی کورددا، لە ڕۆژانی ٧-٨ی ئاداری ١٩٦٣ لە چوارقوڕنە کۆبوونەوەکە کرا. هەردوولا گەیشتنە شێوازێکی سەرەتایی و ناکۆتایی لەو بارەیەوە. ئەوەی هەردوولا پێی گەیشتن هەنگاوێکی گرنگ بوو لە

بەرژەوەندی چارەسەری کێشەی کورد و کەمکردنەوەی توندییەکان، بە مەبەستی گەیشتنە زەمانێکی هاوبەش، چونکە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم چەندین کێشەی دروستکردبوو، کە بەهۆی دەستدانە چەك، بزووتنەوەی کوردی لە ساڵی ١٩٦١دا دروست بووبوو.

بیرمە ئەوەی لە پێشەکی لێککەیشتنەکەی هەردوولادا هاتبوو، ڕاگەیاندنی لێبوردنێکی گشتی بوو بۆ هەموو ئەوانەی بەشدارییان لە بزووتنەوەی کوردیدا کردبوو. لەگەڵ زوو ئازادکردنی گیراوەکان و دانناں بە مافەکانی گەلی کورددا، لەسەر بنەمای ئیدارەدانی خۆیی و جێکردنەوەی لە دەستووری عێراقدا. دوای ئەوە گەیشتنە وردەکارییەکانی بەڕێوەبردنی خۆیی، کە بەلای منەوە لە کرۆکدا خۆی لە ئۆتۆنۆمیدا دەبینییەوە. هەروەها جەخت کرابووەوە لە لابردنی گەمارۆی ئابووری لەسەر کوردستان، کە قاسم گەمارۆیەکی ئابووری توندی بەسەردا سەپاندبوو، وەك بەشێك لە پلانەکەی بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کوردی. هەروەها لە بەڵگەنامەکەدا هاتبوو دامودەزگاکانی دەوڵەت پاك بکرێنەوە لە هەرچی ئەوانەی لە کوردستاندا خراپەیان بەرامبەر کورد کردووە، حیجز لەسەر ئەو ماڵ و موڵکانە هەڵبگیرێت کە بەهۆی شۆڕشی کوردەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو. بە کشاندنەوەی هێزە سەربازییەکان لە کوردستاندا نیازپاکی پیشان بدرێت بۆ ئەوەی ژیانی ئاسایی بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکە.

سەبارەت بە جێبەجێکردنی ئەو داواکارییانە، ئەنجومەنی سەرکردایەتی

شۆڕشی ڕەمەزان، بەیانێکی دەرکرد و تیایدا دانی نابوو بە مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورددا، لەسەر بنەمای لامەرکەزی و لە بەیانەکەدا بەڵێنی ئەوە درابوو، ئەو شێوازە لە دەستووری کاتی و هەمیشەیی عێراقدا بچەسپێنرێت، بەڵام بەیانەکە بە تەواوی شێوازی لامەرکەزییەتی ڕوون نەکردبووەوە. پێم وایە دواتر لەسەر دوو مەسەلە ناکۆکی لە نێوان هەردوولادا دروستبوو، شێوازی بەیانەکە لە لایەك و خۆدزینەوە لە جێبەجێکردنی لە لایەکی ترەوە.

ئەوەی زیاتر شێوازی لامەرکەزیی ئاڵۆز و ناڕوون کردبووەوە، فرە دەستەواژەیی بوو لەسەر بابەتەکە، وەك خۆبەڕێوەبەری و ئۆتۆنۆمی و لامەرکەزی. بەڵام ئەوەی هەموو ئەو دەستەواژانەی لە یەکتر جیادەکردەوە جێبەجێکردنی بوو لە ئەرزی واقیعدا. حکومەت زاراوەی خۆبەڕێوەبەرێتی لە ئۆتۆنۆمی بەلاوە سوکتر بوو، یان بەڕێوەبردنی لامەرکەزیی لە ئۆتۆنۆمی لا پەسەندتر بوو. بەڵام سەرکردایەتی کورد زیاتر سووربوون لەسەر زاراوەی ئۆتۆنۆمی، هەرچەندە دواتر ڕازیبوون لەسەر ئەو دەستەواژانەی حکومەتی ئەو کاتە دەیویست. ڕێککەوتن کرا لەسەر خۆبەڕێوەبەرێتی و ماوەیەك دوای ئەوە ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر بەڕێوەبردنی لامەرکەزی، ئەوەی لای من گرنگ بوو گەلی کورد چەند لە مافە نەتەوایەتییەکانی وەردەگرێ؟ ئەی لامەرکەزییەت چ مانایەکی هەیە لە کاتێکدا واقیعی حاڵ بەڕاستی گوزارشت نەکات لە لامەرکەزییەت و گەلی کورد خۆی، خۆی بەڕێوە نەبات؟ من دەڵێم پەند لە قەبارەی دەستکەوتەکاندایە نەك لە ناونیشانەکان.

لە کۆتاییدا نەگەیشتنە ئەنجامێکی ئەرێنی لەسەر مانای ئەو دەستەواژانە، لە مێشکی هەردوولادا هەبوو، هەرچەندە کۆبوونەوەکانی نێوان هەردوولا شاندی میللی و کورد بەڕێوەچوون، بەڵام دانوستانەکان هیچ ئەنجامێکیان لێنەکەوتەوە. بەهۆی ناکۆکی لە چەمکی خۆبەڕێوەبردن لە لای هەردوو شاند لە لایەك و کەم دەسەڵاتی شاندی میللی لەو دەسەڵاتە ڕاستەقینانەی پێیان درابوو لە لایەکی ترەوە، وایکرد بزووتنەوەی کوردی داوای دانوستان بکەن لەگەڵ ئەندامانی فەرمی لایەنی حکومیدا. هەرواش بوو، حکومەت شاندێکی دانوستانکاری فەرمی پێکهێنا لە فەریق ساڵەح مەهدی عەماش وەزیری بەرگری و عەمید ناجی تالب وەزیری کشتوکاڵ و حازم جەواد بریکاری وەزیری ناوخۆ لەگەڵ بابا عەلی شێخ مەحموود، لەگەڵ شاندە میللییەکەش کە لەگەڵ شاندە فەرمییەکەدا کەوتن، کۆبوونەوەکان دەستیان پێکرد و لە جاری پێشوو زیاتر جدیتر بوون و هەردوو شاند دەستیانکرد بە داڕشتنی یاسای خۆبەڕێوەبەرێتی لامەرکەزی، کە ئەو کاتە لە کۆماری سوودان پەیڕەو دەکرا. دانوستانەکان هەنگاوی باشیان بری بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و جێبەجێکردنی لەسەر پرۆژەکە و چەسپاندنی ئاشتی لە کوردستاندا، بەڵام بەهۆی کێشەی دیاریکردنی سنووری جوگرافی بۆ ئەو ناوچانەی دەکەوتنە ژێر یاسای ئیداری لامەرکەزییەوە، دانوستانەکان هیچ ئەنجامێکیان لێنەکەوتەوە و گەیشتنە بنبەست. ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی شەڕ لە نێوان هەردوولا لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی ١٩٦٣و باری دەروونی و ئابووری لە کوردستان، لە جاران خراپتر تێکچوو.

**لەگەڵ جەمال عەبدولناسر و بن بێللە**

دوای شۆڕشی شوبات لەگەڵ شاندێکی فەرمی بە سەرۆکایەتی عەلی ساڵەح ئەلسەعدی و ئەندامێتی هەریەك لە تالب شبیب وەزیری دەرەوە و حەردان ئەلتکریتی وەزیری بەرگری و چەند ئەندامێکی تر سەردانی قاهیرەمان کرد، حکومەتی میسر کۆشکی (الطاهرة)ی بۆ شوێنی مانەوەمان تایبەت کردبوو.

هەمان کات شاندی میللی عێراقیش گەیشتنە قاهیرە، کە کۆمەڵێك کەسایەتی سیاسی ناوداری لەخۆدەگرت، وەك حسەین جەمیل و فائق ئەلسامەڕائی. مام جەلالیش وەك نوێنەری بزووتنەوەی کوردی لەگەڵ شاندەکەدا هاتبوو. بۆ مێژوو دەیڵێم مام جەلال دوودڵ بوو لەوەی بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی بارزانی بەشدار بێت لەگەڵ ئەو شاندەدا، بەڵام قەناعەتم پێکرد پێویستە بەشداری بکات و پێمگوت: ڕوونکردنەوەی بابەتەکە لە ئەستۆی من کە گەڕاینەوە بۆ بارزانیی باسدەکەم. دوای ئەوە زانیم بارزانی سەرەتا ناڕازی بووە لە بەشداریکردنی تاڵەبانی لە شاندەکەدا، بەڵام کە گەڕاینەوە و بابەتەکەم بۆ ڕوونکردەوە بۆچوونی گۆڕی.

سەرۆك جەمال عەبدولناسر بە جیا لەگەڵ هەردوو شاندەکەدا کۆبووەوە، یەکەمجار لەگەڵ شاندە فەرمییەکەدا کۆبووەوە و چاوم پێکەوت، هەرزوو چووە دڵمەوە و بە کەسێکی زۆر باش و لەسەرخۆ و خاکی و تێگەیشتوو هاتە بەرچاوم، ئەو کاتەی زیاتر لەسەر ڕەوشتەکانی

وەستام کە من و مام جەلالی بە تەنیا لە ماڵەکەی خۆیدا بینی، زیاتر پێی سەرسام بووم، لەبەر دوو هۆ: یەکەم، کە قسەت بۆ دەکرد بە تەواوی ئەندامەکانی گوێی بۆ دەگرتیت، دووەم، هەرچی نەزانیبایە لافی ئەوەی لێنەدەدا کە دەیزانێت. من هەر لە ساڵانی پەنجاکانەوە سەرسام بووم بە جەمال عەبدولناسر و گوێم لە وتار و هەڵوێستەکانی دەگرت، بەڵام کە ڕووبەڕوو لەگەڵیدا دانیشتم هێندەی تر پێوەی سەرسام بووم.

عەلی ساڵەح سەعدی دەربارەی دۆزی کورد لەگەڵ جەمال عەبدولناسر قسەیکرد کە سەرکردایەتی لە عێراقدا دوور لە نەتەوەی عەرەب نایەوێت کێشەکانی وڵات چارەسەر بکات، بۆ ئەوەی لۆمە و تانوتی نەیەتە سەر و لە عێراقدا کێشەیەك هەیە ناوی دۆزی کوردە و دەیانەوێت لەو بارەیەوە لەگەڵیدا گفتوگۆ بکەن، ئەلسەعدی کاتێك سەردانیمان کرد هەمان قسەی لەگەڵ ئەحمەد بن بێللەی سەرۆکی جەزائیریش کرد.

جەمال عەبدولناسر ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆری بۆ دەربڕین و بانگهێشتی من و جەلال تاڵەبانی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی و لەوێ لەگەڵماندا کۆبووەوە. بە ڕاشکاوی ڕای خۆی دەربڕی کە کورد مافی خۆیانە چ جۆرە ماف و ژیانێك بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، مادامەکێ نایانەوێت لە عێراق جیاببنەوە و پێویستە عێراق مافی هەڵبژاردنی ئەو جۆرە ژیانەیان بداتێ کە دەیانەوێت، عەبدولناسر پشتگیری بیرۆکەی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد دەکرد و زانیاری یەکجار زۆری هەبوو لەسەر دۆزی کورد.

بەڵام بن بێللە وتی: ئێمە یەکەمجار مرۆڤین، ئەمجا موسڵمانین، ئەمجا

عەرەبین، کورد و عەرەب لە مرۆڤایەتی و ئاییندا برای یەکترن. بن بێللە هەرگیز ڕازی نەبوو لەو شێوازی توندوتیژییە و زۆر ناڕەحەت بوو لە چارەسەری دۆزی گەلێك کە ئۆتۆنۆمی بوێت، کەچی بە ئاگر و ئاسن لێی بدرێت. هانی شاندە فەرمییەکەی عێراقی دا بۆ دانانی شێوازێك کە چارەسەری کێشەکە بکات بەبێ توندوتیژی، مادامەکێ کوردەکان داوای جیابوونەوە لە عێراق ناکەن.

بۆ هەردوو سەرۆك عەبدولناسر و بن بێللەم ڕوونکردەوە، بە درێژایی مێژوو هیچ ناکۆکییەك لە نێوان عەرەب و کورددا ڕوونەداوە، بەڵکو ناکۆکییەکان هەمیشە لە نێوان گەلی کورد و ئەو حکومەتانەدا بووە کە هاتوونەتە دەسەڵات و نەیانزانیوە چۆن کێشەکە چارەسەر بکەن، چونکە ئێمە لە بنەڕەتدا یەك میللەتین و ئەم بابەتە جیهان لێی تێگەیشتووە و پێویستی بەو هەموو سەرئێشەیە نییە و چەندین وڵات هەیە چەندین نەتەوەی جیاواز لەخۆدەگرێت و گرنگ ئەوەیە دیموکراسییەت پەیڕەو بکرێت لە مامەڵەکردندا.

چاوپێکەوتنەکان زۆر بەسوود و ڕاشکاو بوون، بە تایبەت بۆ عەلی ساڵەح ئەلسەعدی، هەرچەندە جەمال عەبدولناسر و بن بێللە داوای وەستاندنی شەڕیان کرد و عەلی ساڵەح ئەلسەعدیش ویستی بەڕێنماییەکانی ئەوان کار بکات، بەڵام بەداخەوە دوای ئەوە دۆخەکە ئاڵۆز بوو و شەڕ لە نێوانی حکومەتی عێراق و بزووتنەوەی کورددا دەستی پێکردەوە.

لە ئەنجامی تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان بەرپرسانی عێراق و جەمال عەبدولناسر لە ناوەڕاستی شەستەکان و ڕەخنەگرتنی توند لە سیاسەتی عێراق و عەلی ساڵەح ئەلسەعدی و چی لە نێوانیان چووە لە گفتوگۆ سێ قۆڵییەکە، ناوی منیش هێنرا بەو پێیەی ئەندامی ئەو شاندە بووم کە بۆ ئەو مەبەستە چووبوونە میسر، هەندێك گومانم لێکرا بەوەی بە جیا لەگەڵ جەمال عەبدولناسر کۆبوومەتەوە و لەسەر هەندێك مەسەلەی تایبەت بە دۆزی کورد لەگەڵی ڕێککەوتووم، بێئەوەی شاندی عێراقی ئاگایان لێبێت، بەڵام ڕادیۆی (صوت العرب) هەرچی لە نێوان من و جەمال عەبدولناسردا ڕووی دابوو بڵاوکردەوە، جەمال عەبدولناسر بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێز و متمانەوە بەوەی دەشێت دۆزی کورد چارەسەرێکی ئەرێنیی بۆ بدۆزرێتەوە بەرپێیکردین. کاتێك خوا حافیزیمان لێکرد پێیگوتم: "سڵاوم بگەیەنە بە گەلی عەرەبی لە عێراق". پێمگوت: جەنابی سەرۆك، مەبەستت گەلی عێراقە یان میللەتی عەرەبە لە عێراق؟ چونکە لە عێراقدا عەرەب و کورد و نەتەوەی تریش هەن، کاتێك تۆ سڵاو لە گەلی عەرەب دەکەیت واتە سڵاوەکەت بۆ ئەوانی تر نیە، لە کاتێکدا گەلانی تریش لە عێراقدا تۆیان خۆشدەوێت و پێت سەرسامن؟! سوپاسی کردم بۆ ئەو تێبینییە گلەیی ئامێزە و وتی: "گەلی میسر جیاوازە لە پێکهاتەی گەلی عێراق، لە میسر هەموومان بە زمانی عەرەبی دەئاخڤین و هەموومان شافیعین، ڕاستی دەبوو بمگوتبا: سڵاوم بگەیەنە بە تەواوی گەلی عێراق".

لە کۆتا ساتەوەختەکاندا جارێکی تر باسی پەیوەندی مێژوویی نێوان کورد و عەرەبمان کردەوە چۆن هۆزە کوردو عەرەبەکان هاوسنوور و

دراوسێی یەکترن و هەرگیز ڕۆژێك هۆزێك هۆزێك بە هۆکاری نەتەوەیی نەهاتۆتە سەر ئەوی تر، بەڵکو کێشەکان هەمیشە هۆکارەکانی نەتوانایی دەسەڵات بووە بۆ چارەسەرکردنی داواکارییەکانی میللەت.

## چاوپێکەوتنێکی تر لەگەڵ جەمال عەبدولناسر لە ساڵی ١٩٦٧

ئەندامی ئەو شاندە عێراقییە بووم کە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ جەمال عەبدولناسر چوونە میسر، سەبارەت بە جەنگ لەگەڵ ئیسرائیل و ئەو ڕۆڵەی عێراق دەتوانێت بیبینێت لەکاتی قووڵبوونەوەی دۆخەکە و دروستبوونی جەنگ. گفتوگۆی زۆر لەو بارەیەوە کرا و عەبدولناسر وتی: "زۆر پێویستیان بە یارمەتی عێراق نییە".

لە پێگەیەکی بەهێز و متمانە بەخۆبوونەوە قسەی دەکرد، بە بەڵگەی ئەوەی سوپای میسر دوو هێندەی سوپای ئیسرائیلە و ئەگەر شەڕ ڕووی دا، پێویستی نابێت بەوەی عێراق بە هێزی سەربازییەوە بێتە ناوەوە، هەروەها میسر ژمارەی فڕۆکەکانی زۆر لە ژمارەی فڕۆکەکانی ئیسرائیل زیاترە. ئەمجا وتی: "ئێوە – مەبەستی عێراق و سوریا بوو – ئەگەر دەتانەوێت یارمەتی سوپای میسری بدەن، ئەوە خۆتان بڕیاری لەسەر دەدەن. شاندی عێراقی پێداگری کرد لەوەی پێیان خۆشدەبێت بەشداری لەو شەڕەدا بکەن، عەبدولناسر ڕازی بوو یارمەتییەکی مەعنەوی پێشکەش بکەن بە ناردنی تەنها یەك فەوجی عێراقی، شاندەکە پێکهاتبوو لە تاهیر یەحیا جێگری سەرۆك وەزیران و من بەو پێیەی منیش جێگری سەرۆك وەزیران بووم و وەزیری بەرگری و وەزیری دەرەوە و وەزیری

یەکبوون بووم.

سەرەتا لە گفتوگۆکەدا بێدەنگ بووم و هەر گوێم دەگرت، ڕاست لە تەنیشت جەمال عەبدولناسردا دانیشتبووم، لەناکاو دەستی خستە سەرشانم و وتی: "فوئاد بۆ قسە ناکەیت؟". پێمگوت: بەر لەوەی قسە بکەم حەز دەکەم پرسیارێك لە بەڕێزتان بکەم. وتی: "فەرموو". وتم: ئایا جەنگ ڕوودەدات؟. شێوازی دانیشتنەکەی گۆڕی بۆ لای من و وتی: "٨٥٪ گومان دەکەم ڕوو بدات، چونکە (شەرم الشیخ)مان داگیر کرد و هێزەکانی فریاکەوتنمان تێدا دەرکرد". پێمگوت: کەواتە جەنابی سەرۆك مادامەکێ پێشی تۆزێك وتت سوپای میسری لە ئامادەباشیدایە و سوپای میسری لە ڕووی چەك و ژمارەوە دوو هێندەی سوپای ئیسرائیلە، بۆچی هێرشی لەناکاویان ناکەیتە سەر و جەنگەکە بگوێزیتەوە بۆ نێو خاکی دوژمن و داگیریان بکەیت و مەرجەکانی خۆت لە نێو خاکی خۆیان بەسەریاندا بسەپێنیت ؟. وتی: "نامەوێ دەستپێشخەری جەنگەکە بم". وتم: جەنابی سەرۆك تۆ هێزەکانی فریاکەوتنت لە (شەرم الشیخ) دەرکردووە و دوژمن بە دڵنیاییەوە هێرش دەکات و ئەگەر هێرشی کرد، ئەوا جەنگەکە دەکەوێتە نێو خاکی ئێوەوە، ئەم بابەتە زۆر لەسەرتان دەوەستێت، جەنگەکە دەبێت کورتخایەن بێت، چونکە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەردەوامی شەڕەکەیان ناوێت. بەوەش ئەگەری گەورە هەیە ئەگەر ئیسرائیل هێرش بکات، شەڕەکە لە بەرژەوەندی خۆی کۆتایی پێبهێنێت، بۆیە بە باشی دەزانم تۆ هێرش بکەیتە سەر ئیسرائیل.

دوای تۆزێك بێدەنگی، وتی: "بەڕێز فوئاد، هیوادارم وا گومان نەبەیت کە جەنگەکە جەنگێکی گەورە دەبێت، دەشێت لێرە و لەوێ فەوجێك بەشەڕ بێن و تەق و تۆقێك ڕووبدات، بەڵام جەنگێکی جدی و یەکلاکەرەوە نابێت، دەشێت هاوشێوەی تەق و تۆقەکانی ساڵی ١٩٤٨ بێت". وتم: جەنابی سەرۆك هاوڕات نیم، هیوادارم من هەڵە بم. دیسان بێدەنگ بوومەوە.

دوای گەڕانەوەمان بۆ عێراق، شاندێکی میسری بە سەرۆکایەتی جێگری سەرۆك کۆمار و سەرکردەی گشتی و سوپا هاتنە بەغداد، شاندی عێراقی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیان بریتیبوون لە: سەرۆك عەبدوڕەحمان عارف و من و تاهیر یەحیا و عەبدولغەنی ئەلڕاوی و ئیسماعیل مستەفا، لەگەڵ سەرۆك ئەرکانی سوپا و فەرماندەی فیرقەکان و فەرماندەی هێزی ئاسمانی. لە کۆشکی کۆماری کۆبوونەوەکە کرا بۆ گفتوگۆ دەربارەی چۆنێتی هاوکاری سوپای عێراق بۆ میسر. لە گفتوگۆکانمان لەگەڵ شاندی میسری ئەوەمان بەدیکرد کە جەمال عەبدولناسر دید و بۆچوونی بۆ ئاستی جەنگە پێشبینی کراوەکە گۆڕیوە.

لە گفتوگۆی نێوان هەردوولادا پێشنیارێکم کرد بە هەند وەرگیرا و هەردوولا ڕەزامەندییان لەسەر دەربڕی، ئەوە بوو ئەگەر سوپای عێراق بەشداری لە شەڕەکەدا کرد کە لە ژێر فەرمانی ئێوەدا دەبێت، ئەرك و ئامانجی دیاریکراوی بدرێتێ و داوای لێبکرێت ئەو ئامانجانە جێبەجێبکات کە بۆی دیاریکراوە و بەسەر بەرە جیاوازەکانی جەنگدا دابەش نەکرێن، بۆ

ئەوەی پەرتەوازە نەبن، واتە هێزەکان پێکەوە بن و کەسایەتی عێراقی خۆیان بپارێزن. سەبارەت بە هێزی ئاسمانیش ئامانجەکان لەلایەن سەرکردایەتی میسرییەوە دیاری بکرێن، بەڵام فەرمان لە سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی عێراق وەربگرن، پێشنیارەکانم بە سوپاسەوە لەلایەن شاندەکەوە وەرگیرا.

دوای ئەو چاوپێکەوتنە شاندێکی عێراق بە سەرۆکایەتی تاهیر یەحیا چوون بۆ میسر، لەوێبوون کە لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٦٧ هێرشەکە ڕووی دا و شاندەکەی عێراق گەڕایەوە، بۆ ئاگاداربوون لە دۆخی سەربازی میسر، ئێمە بە گەشتێکی مەیدانی لەگەڵ فەریق ڕوکن شاکر مەحموود وەزیری بەرگری عێراق کە لە ئەفسەرە ڕوکنە دیارەکان بوو چووین بۆ میسر، شاکر مەحموود لە دۆخی سەربازی میسر ڕازی نەبوو و دڵخۆش و گەشبین نەبوو پێیان.

تێبینییەکانی دەربارەی کەموکوڕی ئامادەباشی سوپای میسر و گردبوونەوەیان لە دەوری ئاوەکان و لاوازی زەبت و ڕەبت و بارەگا ئاشکراکانیان و سەرچاوە سەرنەگیراوەکانی ئاوەکانیان و لاوازی سەنگەربەندییەکانیانی خستەڕوو. بە گشتی لاواز و بێ زەبت و ڕەبت بوون. شاکر مەحموود هەرچی تێبینییەکیهەبوو بە عەبدولحەکیم عامری گوتن، دوای میوانداریکردنمان لە ماڵەکەی خۆیدا، هەرچی ئەو تێبینییانە بوون بە دوور و درێژی گفتوگۆیان لەسەر کرا.

## ئەلسەعدی و دۆزی کورد

سەبارەت بە هەڵوێستی عەلی ساڵەح ئەلسەعدی لە دۆزی کورد، بە تێبینیکردنم لەو قسانەی لەگەڵ من و عەبدولناسردا کردی، باوەڕم وایە ئەلسەعدی پڕ بەدڵ حەزیدەکرد دۆزی کورد بە شێوەیەکی دیموکراسیی و ئاشتییانە چارەسەر بکرێت، بەڵام چۆن دواتر هەڵوێستی گۆڕا، چونکە حیزبی بوو، دەبوو بڕیارەکانی حیزب جێبەجێ بکات. بێگومان جیاوازی لە نێوان بۆچوونی کەسیی و بۆچوونی حیزبیدا زۆرە. لە کۆبوونەوەیەکدا کە باس لە دۆزی کورد کرا و من زۆر تووڕە بووم، تالب ئەلشبیبی وەریری دەرەوە هات بۆ لام و وتی: "هەڵوێستی عەلی ساڵەح ئەلسەعدی لەسەر دۆزی کورد و شێوازی چارەسەرکردنی زۆر باشە، بەڵام لەبەر ئەوەی بە بنەچەك کوردە، بۆیە حەماسێکی گەورە لەسەر ئەو بابەتە دەرنابڕێت. منی ڕاسپاردووە - واتە کامل شبیبی ڕاسپاردووە - قسە بکات و ڕەهەندەکانی دۆز و مافەکانی گەلی کورد لە کۆبوونەوەکەدا باس بکات". واتە عەلی ساڵەح ئەلسەعدی خۆی نەیوێرابوو یان نەیویستبوو، تەواوی بۆچوونەکانی لەسەر چارەسەری دۆزی کورد دەرببڕێت. بۆ ئەوەی تەفسیرێکی نەتەوەییانە بۆ هەڵوێستی نەکرێت، بەوەی ئەلسەعدی لە بنەچەدا کوردە.

## لەگەڵ عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز

ناسیاویم لەگەڵ عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٣، ئەو کاتەی باڵوێزی عێراق بوو لە قاهیرە و لەگەڵ شاندە فەرمییەکەی عێراق لەوێ چاوم پێیکەوت، بە بەراورد بە کەسایەتییە سیاسییەکانی تری عێراق، بە کەسێکی زۆر ڕۆشنبیر و ئاگا و زیرەك هاتە پێشچاوم. بەرامبەر دۆزی کورد هەڵوێستی زۆر باش بوو. بەڵام بە بۆچوونی من هەڵەی ئەلبەزاز لەوەدا بوو، هەر لەوەی بەهێز بێت و بە تەواوی دەسەڵات بگرێتە دەست دژایەتی ئاڕاستە و سەنگی کەسانی سەربازی کرد لە حکومەتدا. هەر لە ٨ی شوبات و دوای ئەوەش بەردەوام و لە هەموو بۆنەکاندا، پێشنیاری ژیانی پەرلەمانیم دەکرد.

پێم وایە ئەلبەزاز مەزەندە و هەڵسەنگاندنی بۆ ئەو مەسەلەیە نەکردبوو، شەڕوشۆڕ لە کوردستاندا لە بەرژەوەندی هەندێك لە ئەفسەرانی هەلپەرستدا بوو. هەر ئەمەش بوو بەهۆی ڕووخاندنی، چونکە پێگەی لاوازتر بوو لە کۆی پێگە سەربازییەکانی تر لە دەوڵەتی سەردەمی عارفدا. دواتر زانیم ئەلبەزاز دژی گرتن و دوورخستنەوەم بووە بۆ عەین ئەلتەمر، لە دانوستانەکانی ساڵی ١٩٦٦، کە ئیدریس بارزانی هات بۆ بەغداد لەگەڵیدا بەشداری دانوستانەکانم کرد.

## بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران

بەیاننامەکە هەنگاوێکی ڕوون و باشبوو بۆ بەرەوپێشچوونی هەردوولا، چونکە هەردوولا پێویستییان بە وەستاندنی جەنگ و پشوودانێك هەبوو. سەرکردایەتی کورد ویستی هەلێك بداتە سەرۆك عەبدوڕەحمان عارف کە لە شوێنی عەبدولسەلامی برای دانیشتبوو، بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد، سەرۆکی تازەش پێویستی بە (ئاگربەست بوو)، بۆ ئەوەی لەو بە سەرۆك بوونە کوت و پڕە، ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە. سەرکردایەتی کورد چاوەڕێی ئەنجامی باشی دەکرد لە سیاسەتی عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز، شەڕ ڕاوەستێنرا و دۆزی کورد کەوتە نێو گفتوگۆیەکی تازەوە، کە بەیاننامەی بیست و نۆی حوزەیرانی لێکەوتەوە.

دوای چەند ڕۆژێك لە بینینی پڕۆژەی ٢٩ی حوزەیران، بابا عەلی هات بۆ لام و زۆر تووڕە بوو، وتی: "فوئاد بڕیارمداوە لەمڕۆ بەدواوە لەگەڵ ئەوانەدا ئیش نەکەم". بابا عەلی لەگەڵ ئەلبەزازدا لە دانیشتنێکدا دەمیان گیرابووە یەك و کاری دانوستانەکانی بە من سپارد و وتی: "لەو ڕۆژانەدا حکومەت لەو بارەیەوە پەیوەندیت پێوەدەکەن". ڕۆژی دواتر زەید ئەحمەد عوسمان هات بۆ لام و وتی عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز حەز دەکات میوانداریت بکات بۆ ئێوارەخوانێك لە ئەنجومەنی نیشتمانی و دەتوانیت لە کەسایەتییە کوردەکان هەر کەسێکیان لەگەڵ خۆتا ببەیت بۆ قسەکردن دەربارەی دۆزی کورد. من و فەتاح شالی و مەجید عەلی و ئەحمەد کەمال و زەید ئەحمەد عوسمان و عەبدوڕەحمان موفتی (گرووپی عەین ئەلتەمر)

پێکەوە چووین. عەلی حەیدەر گفتوگۆکانی کردەوە، بە کوردی گلەییم لێکرد: "بۆچی ئەلبەزاز قسەی زبر لەگەڵ بابا عەلی دەکات". ئەلبەزاز لە ڕاستیدا بە شێوازێکی زبر قسەی لەگەڵ بابا عەلیدا کردبوو، بە ڕادەیەك بابا عەلیی نارەحەت کردبوو، کە چیتر هاوکاری لەگەڵ حکومەتەکەی ئەلبەزازدا نەکات. ئەلبەزاز تێگەیشت ئێمە چی دەڵێین و هەستیکرد لێی دلگرانین بەهۆی ئەو شێوازەی لەگەڵ بابا عەلیدا نواندوویەتی، بۆیە ڕێرەوی گفتوگۆکەی گۆڕی و یەکسەر هاتە نێو گفتوگۆکەوە و وتی: "چیتان دەوێت؟" وتم: پێشنیار دەکەین بڕیارەکانی (٢٩ حوزەیران) بنێریت بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد بۆ لێکۆڵینەوە لێی، چونکە تەنها لایەنە بڕیار بدات پێی ڕازی بێت یان ڕازی نەبێت". دوای ئەوە چووم بۆ لوبنان.

### دوورخستنەوەم بۆ عەین ئەلتەمر ١٩٦٦

لەساڵی ١٩٦٦ خانەنشین بووم، هۆکارەکەشی تووڕەبوونی عەبدولسەلام بوو، بەهۆی سەردانم بۆ لای بە دوو ڕۆژ بەر لە دوورخستنەوەم، داوای چاوپێکەوتنی کردم، لە پێشەکی قسەکانی لەگەڵم، بۆم دەرکەوت دەیەوێت ڕامسپێرێت بۆ پۆستێك، یان ڕوونتر بڵێم بگەڕێمەوە بۆ وەزارەت، دەستیکرد بە خۆهەڵکێشان و ستایشکردنی خۆی بە چەند سیفەتێکی باش و جوان، لە کۆتاییدا وتی: "توخوا وانییە؟" وتم: نەوەڵا وا نییە. ئەمجا وتم: عەبدولسەلام من دەمەوێت ڕاست و ڕاشکاو بم لەگەڵت، تۆ سەرۆك کۆماریت، نامەوێت درۆت لەگەڵ بکەم،

تۆ هەڵەت زۆرە. وتی: "هەڵەکانم چین؟" وتم: تۆ هەڵەت زۆرە، تۆ پیاوێکی زۆر ڕق لەدڵیت.. تووڕە بوو و وتی: "تۆ برای گەورەمی بۆیە ئەم قسانەت لێ قبووڵ دەکەم...". وتم: من ئەم قسانە بۆ ئەوەی ناڵێم کە بتشکێنم و سووکایەتیت پێبکەم، بەڵکو حەز دەکەم خۆت باش بکەیت. لەسەر کورسییەکەی هەستا و دەستی بۆ درێژکردم و وتی: "سوپاس چاوپێکەوتنەکە کۆتایی هات.." دەستم لە یەك دا و هاتمە دەرەوە.

دوای دوو یان سێ ڕۆژ لەو چاوپێکەوتنە، لە عیمارەکەی حەسیب ساڵەح بووم، دەبینم دوو کەس لە ئاسایشی گشتییەوە کاغەزێکیان هێنا کە فەرمانی گرتنم بوو، عەبدوڵڵا سەعیدیش لەوێ بوو، فەرمانی گرتنەکە دەیگوت (فوئاد عارف و گرووپەکەی) لەگەڵ ناوەکانیاندا. دوای ماوەیەك دەبینم گرووپەکە گەیشتن، کە بریتیبوون لە: فەتاح شاڵی، لیوا مەجید عەلی، لیوا عەبدوڕەحمان موفتی، عەمید ئەحمەد کەمال قادر، زەید ئەحمەد عوسمان و ڕەشید جەودەت. بەر لە ئێمە کەسانێکی تریش گیرابوون کە ناویانم لە بیر نەماوە. ئەمجا کەسانێکی تریان هێنا، لەوانە ڕائیدی مافناس مەحموود حەمزە و زۆراب داراخان و جەمال وەلی ئەبولحسەین و ئیبراهیم موحەممەد حەسەن و نیعمە ئەلحەیدەری و جیهاد مەجید و حەمدی عەلول و شێرکۆ ئیبراهیم و سەید عەلی و خێزانەکەی و یەکێك لە کوڕەکانی عەزیز پشتیوان و چەند کەسێکی تر، تا مردنی عەبدولسەلام لە عەین ئەلتەمر ماینەوە.

دەربارەی گوزەرانمان لە عەین ئەلتەمر، کاتێك گەیشتینە شوێنی

دوورخستنەوەمان هەندێك هاورێم بیرکەوتنەوە، لەو رۆژگارەی پارێزگاری کەربەلا بووم، بۆیە ئاگاداری هاورێیانم کردەوە لە ماڵی ئال ئەلنەقیب، لەوانە سەید جەواد ئەلنەقیب، گلەییان لێکردم بۆچی زوو ئاگادارم نەکردوونەتەوە، بارودۆخی خۆمم بۆ روونکردنەوە کە من ئێستا دەست بەسەرم و مانەوەی بە زۆرم بەسەردا سەپێنراوە.

هاورێیانم ئاگاداری بەرێوەبەری ناحیەیان کردەوە، کۆشکێکی بۆ چۆلکردین (چونکە ئەوان کۆشکێکی تایبەتیان لە عەین ئەلتەمر) هەبوو. هەموو شتێکیان بۆ دابین کردین، هاتنە سەردانمان و لە خانووە گەورە و ئاوەدانەکەیان نیشتەجێیان کردین، عەللامە سەیید مەهدی ئەلحەکیم، کوری ئایەتوللا سەیید موحسین ئەلحەکیم لەگەڵ شاندێك لە زانایانی نەجەف، بە ناوی سەیید موحسین ئەلحەکیمەوە هاتنە سەردانمان، خەڵکی کەربەلا و نەجەف خزمەتێکی یەکجار زۆریان کردین، هەرگیز لە یادی ناکەم. تا رادەی چێشتلێنەری تایبەتی پارێزگاری کەربەلا دەستی لە کارەکەی کێشایەوە و بوو بە چێشتلێنەری ئێمەی دوورخراوە لە عەین ئەلتەمر.

بەر لەوەی ببرێین بۆ عەین ئەلتەمر، زیندانیکراین و بە دەستبەستراوی براینە فەرمانگەی ئاسایش، دوای ئەوە براینە سەرای، لەوێوە پەیوەندیم کرد بە یانەی سەربازییەوە بۆ ئەوەی نانی ئێوارەمان بۆ بێنن، نانی ئێوارەیان بۆ هێناین، بەیانییەکەی لەسەر گیرفانی خۆمان ئۆتۆمبێلێکمان بەکرێگرت تا بمانگەیێنێتە عەین ئەلتەمر. دوای گەرانەوەمان لە عەین

ئەلتەمر، هەریەك لە بابا عەلی و زەید ئەحمەد عوسمان پەیوەندییان کرد بە عەبدوڕەحمان ئەلبەزازەوە دەربارەی بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران. دوای ئەوە زەید ئەحمەد عوسمان ڕۆیشت بۆ بینینی بارزانی، هەندێك لە برایان پەیوەندییان پێوەکردم و وتیان: "زەید ئەحمەد عوسمان و بابا عەلی و عەلی حەیدەر سلێمان، پلان دادەڕێژن بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد، بێئەوەی بگەڕێنەوە بۆ تۆ یان بەشداریت پێبکەن". پێمگوتن: خودا دەکات سەرکەوتوو دەبن بۆ بەرژەوەندی نیشتمانی، با منیان هەر لەگەڵ نەبم.

لە ڕاستیدا بابا عەلی پێی وابوو زەید ئەحمەد عوسمان لە وردودرشتی بابەتەکە ئاگادارم دەکاتەوە، بەڵام زەید ئەوەی چاوەڕێی لێدەکرا لە وردەکارییەکان ئاگادارم بکاتەوە هەمووی لێشاردمەوە، نازانم لەبەرچی؟

ڕۆژێکیان بابا عەلی بانگهێشتی نیوەڕۆخوانێکی کردم لە هۆتێل بەغداد، لەگەڵ هەریەك لە مامۆستا حسەین جەمیل و زەید ئەحمەد عوسمان و چەند کەسایەتییەکی تر، لەوێدا بابا عەلی وێنەیەکی لە پرۆژەکە دەرهێنا، بە خۆم زۆر نارەحەت بووم، ئیتر بابا عەلی زانی تا ئەو کاتە شتەکانم لێ شاراونەتەوە، بۆیە لەو ڕۆژەوە خۆی پێوەندی پێوە دەکردم و لە وردودرشتی بابەتەکە ئاگاداری دەکردمەوە.

## قەناعەتم بە ڕەوایەتی دۆزی کورد

کاتێك شاندی بزووتنەوەی کورد گەیشتنە بەغداد، لەلایەن حکومەتەوە، ساڵح مەهدی عەماش و حەردان ئەلتکریتی و چەند کەسێکی تر ئامادە بوون، گلە و گازەندە دەستیپێکرد، لەسەر بابەتەکە قسەم کرد و وتم: کاتی گلە و گازەندە نییە و بە پێویستی نازانم ئەو قسانە بکرێن و تۆمەت بدەنە پاڵ یەکتر، باشتر وایە لە ئەمڕۆوە لاپەڕەیەکی تازە بکرێتەوە. بەڵام مام جەلال تاڵەبانی سەرۆکی وەفدەکە وتی: "کاك فوئاد ئەمە شێوازی حیزبی کارپێکراوە لە گفتوگۆکاندا و دەبێت حیساباتەکانمان پاك بکەینەوە" بۆیە من لە کۆبوونەوەکە کشامەوە، لەو قەناعەتەوە ئەو شێوازە لە قسەکردن هیچ ئەنجامێکی باشی نابێت، وەك ئەوەندەی ڕق و تووڕەبوون زیاتر دەکات.

بەڕاستی کاتێك وەك ئەندامێکی شاندی دانوستانکار، لەگەڵ تاهیر یەحیا و عەلی حەیدەر سلێماندا لەلایەن حکومەتەوە ڕۆشتین بۆ دانوستان لەگەڵ سەرکردەکانی بزووتنەوەی کورد، وەك خۆم قەناعەتم بەو بەرنامەی کاری حکومەتە نەبوو. دڵنیابووم لەوەی ڕەزامەندی کوردەکان بەدەست ناهێنێت، هەروەها دەرچوو، واتە لە بنەڕەتدا قەناعەتم نەبوو بە بیرۆکەی بەڕێوەبردنی خۆیی و بەڕێوەبردنی لامەرکەزی، چونکە داواکاری کوردەکان دیار و ئاشکرا بوو، کە خۆی لە ئۆتۆنۆمیدا دەبینێتەوە.

هەرچەند ماوەیەکی کەم مامەوە لەو کابینەیەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لە سەردەمی عەبدولسەلام عارفدا سەرکردایەتی دەکرد، بەڵام بە

تێپەڕبوونی ڕۆژگار گەیشتمە بڕوای تەواو کە حکومەت بۆچوونی دژبەیەکی هەیە لە بابەت دۆزی کورددا. بەر لە شۆڕشی ڕەمەزان هەندێك لە سەرکردەکانی شۆڕش باسیان لە دۆزی کورد و ڕێگەچارەیان دەکرد، بە شێوازێکی تەواو جیاواز، دوای هاتنە سەر دەسەڵات، لە لایەکیترەوە هەستم بە تەنگەژەیی هەڵوێستم دەکرد، لەوەی وەزیرێکی کوردم لە کابینەکەدا، حکومەتەکەی ڕاڕایە لە چارەسەری دۆزی کورد و بە هەموو جۆرێك خۆی دەدزییەوە لە هەندێك لەو بەڵێن و پابەندبوونانەی دابوویان بە کورد. بە بنبەستگەیشتنی گفتوگۆ و دانوستانەکان، وایانکرد لە دەستلەکارکێشانەوە زیاتر، ڕێگەیەکی ترم نەبێت.

لە یەکێك لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی وەزیران بە دوور و درێژی باسم لە پەیوەندی کورد و عەرەب کرد لە عێراقدا، ڕۆڵی گەلی کوردم بۆ ئەنجومەن ڕوونکردەوە، لە پشتگیریکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی و ڕۆڵی شێخ مەحموودی حەفید، لە بەرگری لە عێراق لە دژی ئینگلیز و ناردنی هێزەکانی بۆ شوعەیبە و چۆن کوردەکان لە بەرامبەر هێزەکانی ڕووسیا لە ڕەواندوز بەرگرییان لە عێراق کردووە و چۆن کوردەکان دەنگیان دا بە جیانەبوونەوە لە عێراق لە دژی چوونە پاڵ تورکیاوە. لە کاتێکدا هەندێك عەرەب دەنگیان دا بە چوونە پاڵ تورکیا و بە ئەنجومەنم وت: عەرەبێك لە عێراقدا ئەگەر تەنگەتاو و ناچار بکرێت دەتوانێت بچێت لە هەر وڵاتێکی تری عەرەبی وەك جەزائیر و میسر و سوودان و سعودیە بژی، چونکە هەمووی نیشتمانی عەرەبە و بە وڵاتی خۆی دەزانێت، بەڵام ئێمەی کورد وەك چارەنووسی سیاسییمان دیاریی کردووە، تەنها کوردستانمان هەیە و

یەکەم و کۆتا پەناگەمانە، بۆیە هیچ بیانوویەك نابینم لە گومانکردن لە عێراقییبوون و دڵسۆزیی هەر هاوڵاتییەکی کورد، ئەی ئەگەر عێراق نەبێت، کورد بۆ کوێ بچێت؟ ئەگەر لەم وڵاتە دەربچێت بێگومان تیادەچێت..
ڕووی دەمم کردە عەبدولسەلام عارف و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و پێمگوتن: لەو ڕۆژەوەی لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشتوون، هەموو ئەوانەتان لە بیر چوو بەر لە شۆڕشی ڕەمەزان باستان دەکرد". باسی چیرۆکی ئەو قەشە داوێن پیسەم بۆ کردن کە خزمەتکارەکەی توانی بیهێنێتە سەر کورسی دانپێدانان و قەشە هەرچی ئەو پرسیارانەی خزمەتکارەکەی دەربارەی داوێنپیسییەکانی لێی دەکرد وەڵام نەدەدایەوە، بە بیانووی ئەوەی لەبەر ئەوەی لەسەر کورسی دانیشتووە، هیچ نابیستێت و گوێی لە هیچ نییە. لە هەڵوێستیان بەرامبەر بە دانپێدانان بە مافی گەلی کورددا، چوواندیانم بەو قەشەیە. لەپڕێکدا هەستام و دەستلەکارکێشانەوەی خۆمم لە وەزارەت ڕاگەیاند و پێمگوتن: سبەینێ دەستلەکارکێشانەوەکەم بە نووسین پێتان دەگات.

لە دەرەوەی ئەنجومەن دانیشتنێکی لابەلایی لە نێوان من و عەبدولسەلام عارف و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر کرا. هەوڵیان دا لە دەستلەکارکێشانەوەکەم پەشیمانم بکەنەوە. پێمگوتن: هەموو شتێکم لێتان قبووڵ کرد، بەڵام ناتوانم کەرامەتی خۆم لە بەرامبەر گەلەکەمدا لەکەدار بکەم. بۆ مێژوو دەیڵێم: بابا عەلیش هەستا و وتی: "پشتگیری فوئاد عارف دەکەم لە هەموو ئەوەی وتوویەتی".

ڕۆژی دواتر دەستلەکارکێشانەوەکەم لەگەڵ شۆفێرەکەمدا نارد و تکام لێکردن بێن تەلەفۆنی ماڵەکەشم کە وەك وەزیر بۆیان دانابووم هەڵگرن. دوای نیو کاتژمێر بابا عەلی پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر ئاگاداری کردۆتەوە کە نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەی گەیشتووە و داوای لێکردووم (واتە لە بابا عەلی) پێکەوە کارێك بکەن لەو دەستلەکارکێشانەوەیە پەشیمان ببمەوە". بەڵام بابا عەلی دڵنیابوو لەوەی هەر سوورم لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکە، ئەویش لای خۆیەوە دەستیلەکارکێشایەوە و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکری لێئاگادار کردەوە.

ماوەیەك دوای دەستلەکارکێشانەوەکەم لە ژێر چاودێریدا بووم، هەستمدەکرد تا ماوەیەك بۆ هەر شوێنێك دەچووم ماتۆرسکیلێك بە دوای ئۆتۆمبێلەکەمەوەیە. بۆ مێژوو دەیڵێم سەرباری هەرچی گوزەرا لە نێوانماندا، بەڵام بۆ ماوەی سێ ساڵ پەیوەندیم لەگەڵ عەبدولسەلام عارف بە باشی مایەوە و زیاتر لە جارێك میوانداری کردم و یەکترمان بینی، ئەو کاتە نێوانمان تێکچوو کە ویستی پۆستی جێگری سەرۆك وەزیرانم بداتێ، چونکە من ڕەتم کردەوە و هەندێك لە سیفاتە خراپەکانیم پێگوت، فەرمانی گرتنی دەرکردم -پێشتر باسم کردووە- دوای ئەوە هەندێك لە هاوڕێیانی وەك عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز سەرۆك وەزیران و تاهیر یەحیا و سەعید ئەلسولەیبی و عەبدوللەتیف ئەلدوڕاجی و چەند کەسێکی تر هەوڵیان دا بڕیاری گرتنەکەی پێبگۆڕن بۆ دوورخستنەوە بۆ عەین ئەلتەمر، وەك باسمکرد لە دوورخراوەییدا لە عەین ئەلتەمر مامەوە، تا مردنی عەبدولسەلام لە ساڵی ١٩٦٦.

دیارترین دوو شتێك كه له ساڵی ١٩٦٧دا کردم، دیاریکردنی هەڵوێستم بوو له دەسەڵات، دوای دەست لەکارکێشانەوەم له وەزارەت که جێگری سەرۆك وەزیران بووم، پێشکەشکردنی یاداشتێکی هاویەش لەگەڵ بابا عەلی، به سەرۆك کۆمار دەربارەی دۆزی کورد و بەو شوێنەی که گەیشتووە (یاداشتەکه له ڕۆژنامەی خەباتی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان) بڵاوکرایەوە.

هەرچی لەو ڕۆژەدا وترا لەسەر هۆکارەکانی دەستلەکارکێشانەوەکەم، ئەوەی پێویسته ڕوونی دەکەمەوە، پڕۆژەی وەزارەتی کاروباری کورد واته بوونی وەزارەتێکی هەمیشەیی تایبەت به کاروباری کوردستان، له ڕێگەی چەند بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتی پەیوەست پێوەی، له هەموو پسپۆڕییەکان، پڕۆژەیەك بوو پێشتر له ماڵی بابا عەلی حەفید، قسه و باسی لەسەر کرابوو، لەلایەن حەبیب موحەممەد کەریمی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان و بەشداریکردنی هەریەك له من و بابا عەلی و مەسعود موحەممەد و فایەق هۆشیار و چەند کەسایەتییەکی تر که ناویانم له بیر نەماوە. ڕێککەوتین پڕۆژەکه به ناوی من و بابا عەلییەوە بدرێته دەسەڵات، بابا عەلی پرس و ڕاوێژی به پسپۆڕانی یاسا کرد، لەوانه بەڕێزان ڕەشید نەجیب و فائق هۆشیار و زەید ئەحمەد عوسمان که له ماڵی بابا عەلی یان له ماڵی ئێمەدا ئامادەی کۆبوونەوەکان دەبوون، گفتوگۆی زۆر کرا دەربارەی ناونانی پڕۆژەکه به ناوی (وەزارەتی کاروباری باکوور). له بیرمه وەزیری یەکبوون عەبدولرەزاق محێدین به سەرۆك کۆماری وت: "بیرۆکەی ئەم وەزارەته دژ دێتەوە لەگەڵ بیرۆکەی یەکبوونی عەرەبییدا"

پاشتر گوتی: "تکایە لەم پڕۆژەیە بمپارێزن".

ناوی وەزارەتەکە (وەزارەتی کاروباری باکوور) ڕەوانەی وەزارەتی داد کرا. بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ناوەکەی لە ڕووی یاساییەوە، بەڵام وەزارەتی داد ناوەکەی گۆڕی بۆ (وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەی باکوور)، لەو بارەیەوە گلە و گازەندەم لە وەزیری داد موسلیح نەقشبەندی کرد. وتی: "بەخوا من لە فەرمانبەرێك زیاتر نیم، سەرۆك كۆمار ناوەکەی گۆڕیوە". پرسیارم لێکردەوە، دڵنیایە لەوەی دەیڵێت؟ وتی: "بەڵێ".

پێم سەیربوو، چونکە سەرۆك كۆمار پێشتر ڕازی بوو لەسەر ئەو ناوە و ناردنی ناوەکە بۆ وەزارەتی داد، تەنها ڕێکارێکی ڕۆتینی بوو.

کاتێك ئەنجومەنی وەزیران کۆبوونەوەی خۆی کرد، وەك جێگری سەرۆك وەزیران پرسیارم لە وەزیری داد کرد: چۆن دەسەڵاتی من تێدەپەڕێنیت لە گۆڕینی وەزارەتدا بەبێ ئاگاداری من، کە پێشنیارێك بوو ئێمە هەموومان پێشکەشمان کرد؟. وەزیری داد بێدەنگ بوو و وەڵامی نەدایەوە، داوام لێکرد ڕاشکاوبێت لە وەڵامدانەوەدا، وتی: "سەرۆك كۆمار ناوی وەزارەتەکەی لە (وەزارەتی کاروباری باکوور)ەوە گۆڕی بۆ (وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەی باکوور)". هەرچی ئەو پەڕاوانەی پەیوەندییان هەبوو بە باتەکەوە، بە ئەوپەڕی تووڕەییەوە لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە بە بەرپرسیارانەدا بردمە بەردەم سەرۆك كۆمار کە سەرۆکایەتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی دەکرد و هەموویم دڕی و دەستلەکارکێشانەوەی خۆمم لە بەردەمیاندا ڕاگەیاند. ئیحسان شێرزاد

ویستی گفتوگۆی بابەتەکە بکات، بەڵام داوای لێکرد هیچ قسەیەکی لەسەر نەکات. جێگری سەرۆك وەزیران تاهیر یەحیا داوای دە خولەك پشوودانی کرد، سەرۆك کۆمار لەو دە خولەکەدا داوای لێبوردنی کرد و هەوڵی دا پەشیمانم بکاتەوە، بەڵام من سوور بووم لەسەر دەستلەکارکێشانەوەکەم. هەرچەندە ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر گۆڕینی ناوی وەزارەتەکە بەو جۆرەی ئێمە دەمانەوێت (وەزارەتی کاروباری باکوور)، بەڵام من هاتمە دەرەوە و کۆبوونەوەکەم بەجێهێشت و کۆبوونەوەکە دواخرا. لە ڕاستیدا من لەوپەڕی تووڕەبووندا بووم، چونکە ئەو جۆرە کارانە لەگەڵ سرووشتی ڕاشکاوی من نایەتەوە و حەزم لە ڕاشکاوییە و ناتوانم ئەو کارانە قبووڵ بکەم لە پشتی پەردەوە ئەنجام دەدرێن. هەروەها نەمهێشت ئیحسان شێرزادیش لەسەر بابەتەکە لەگەڵ وەزیرەکاندا قسە بکات، چونکە دەیویست گفتوگۆیەکی زانستی و بابەتییانەیان لەگەڵ بکات و تێیان بگەیەنێت چۆن ئەو پێشنیارە بەرژەوەندی زۆری بۆ عێراق هەیە. ئیحسان شێرزادیش لەگەڵ مندا دەستیلەکارکێشایەوە.

عەبدوڕەحمان عارف داوای کردین و لە بارەگای سەرۆکایەتی سەردانمکرد، وتی: "فوئاد نابێت دەستلەکاربکێشیتەوە، تکا دەکەم دەستلەکارکێشانەوەکەت بکێشەوە". وتم: ئامادەم دەستلەکارکێشانەوەکەم بکێشمەوە بەو مەرجەی هەڵبژاردنی پەرلەمان ڕابگەیەنرێت و لە عێراقدا ئەنجومەنی نوێنەرانمان هەبێت، تۆش ئەو ئەمانەتەیان ڕادەست بکەیت کە لەسەر شانتە، بڕوات هەبێت هەڵدەبژێردرێیتەوە و لە تۆ زیاتر کەسی تر هەڵنابژێدرێت، بەمکارە

ڕەفتارێکی دیموکراتییانەت کردووە و خەڵکیش تینووی دیموکراسین. ئەگەر ئەم کارە بکەیت گەلی عێراق پەیکەرێکت لە زێڕ بۆ دروستدەکەن. زۆر ڕاستگۆیانە قسەم لەگەڵ کرد، وتی: "قسەکانت زۆر ڕاستن". وتم: مادامەکێ بڕوات بە ڕاستی قسەکانم هەیە، سێ ڕۆژت دەدەمێ و دەستلەکارکێشانەوەکەم دوا دەخەم بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت ئەگەر وا نەبێت ئەوا دەستملەکارکێشاوەتەوە. بەداخەوە هەندێك ئەفسەری وەك سەعید ئەلسلێبی و ئەوانی تر پەشیمانیان کردەوە لەو بۆچوونەی و وتیان: "ئێمە شۆڕشمان کردووە، چۆن دەیدەینە دەستی کەسانی مەدەنییەوە؟". ئا ئەمە دەرد و بەڵای شۆڕش و کودەتاکانە لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا. زۆریش لە کەمیندا بوون بۆ عەبدوڕەحمان ئەلبەزاز، چونکە ئەویش مەیلێکی بە لای مەدەنی و دیموکراسیدا هەبوو لە ئیدارەدان و دەسەڵاتدا، بۆیە عەبدوڕەحمان عارف لە بیرۆکەی هەڵبژاردن ڕووی وەرچەرخاند و وتی: "ئێستا من سەرۆك وەزیران و تۆش جێگری و هیچ کێشەیەك لە نێوانماندا نییە"، بەڵام من ڕازی نەبووم، دوای وازهێنانم لە وەزارەت بە دەورووبەری مانگێك یان کەمتر، عەبدوڕەحمان عارفیش وازی لە سەرۆکایەتی وەزیران هێنا و بە سەرۆك کۆمار مایەوە و تاهیر یەحیای ڕاسپارد بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی تازە. جێی باسە ئیحسان شێرزادیش دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد و پشتگیری هەموو هەڵوێستەکانمی کرد لە ئەنجومەنی وەزیران.

## دەقی یاداشتێکی مێژوویی

بەداخەوە سرووشتم وایە زۆر بە کەمی نووسراو و دیکیۆمێنتەکان دەپارێزم، بەڵام خۆشبەختانە تا ئەمڕۆ وێنەیەك لە دەقی ئەو یاداشتەم لا پارێزراوە کە لەگەڵ بابا عەلیدا لە نۆی کانوونی دووەمی ١٩٦٧ پێشکەشمان بە عەبدوڕەحمان عارفی سەرۆك کۆمار کرد، حەزمکرد ئەم بەشەی یاداشتەکانمی کۆتایی پێبێنم، بەو هیوایەی هەندێك تیشك بخەمە سەر لاپەڕەیەکی گرنگ لە مێژووی عێراقی هاوچەرخ بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی بە دۆزی کورد و ڕەهەند و ڕاستییەکانەوە هەیە، دوور لە تۆمەتی ناڕاست کە لێرە و لەوێ دەوترێت.

"بەڕێز سەرۆك کۆمار

السلام علیکم و رحمة الله وبرکاته

ئێمە ئەم یاداشتە بۆ بەڕێزتان بەرزدەکەینەوە، چونکە وڵات بە هەر هۆیەك بێت گوزارشت لە گیانی دیموکراتیی تێدا نییە، بەو جۆرە ئاستەمە هاوڵاتیان بتوانن قسەی خۆیان بڵێن و دەنگی خۆیان بەرز بکەنەوە، لەوەی چی لەسەر خۆیان و وڵاتەکەیان دەگوزەرێت. هەر کە دەبینین بارودۆخەکە وایە، ناتوانین چاوی لێدابخەین، بۆیە کێشەکانمان بۆ لای بەڕێزتان وەك سەرۆك کۆمار بەرز دەکەینەوە، بەڵکو بەو دەسەڵاتانەی هەتانە چارەسەریان بۆ بدۆزنەوە و لەو ماوەیەدا هەستن بەو بەرپرسیارێتییەی لەسەر شانتانە. ئێمە وەك هاوڵاتییەکی دڵسۆز، بۆ خێر و خۆشی عێراق ئەم پێشنیارانەمان کردووە.

جەنابی سەرۆك

هەستی نیشتمانپەری هاندەری ڕاستەقینەی ئێمە بوو بۆ بەرزکردنەوەی ئەم یاداشتە، ئامانجی سەرەکیمان پشتگیری یەکێتی نیشتمانی و بەهێزکردنی برایەتی نێوان نەتەوە جیاوازەکانی عێراقە، لەسەرووی هەموویانەوە هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب.

ئێمە کە گوزارشت لە بۆچوونی خۆمان دەکەین، وابەستە نین بە هیچ گرووپ یان حزب یان لایەنێکی سیاسییەوە. ئەو ڕاوبۆچوونەی دەریدەبڕین لە باوەڕبوونی قوڵمان بە پیرۆزی یەکێتی عێراق و سووربوونمان لەسەری، سەرچاوەی گرتووە و هەمیشە شانازی بە نەتەوایەتی خۆمانەوە دەکەین.

جەنابی سەرۆك:

بێگومان کێشەی باکوور هێشتا لە دڵ و دەروونی هەموو کەسێکی شەریف و ئەمیندا قوڵپەی دێت و غەمباری دەکات، هەموو هاوڵاتییەکی بەرپرس یان غەیرە بەرپرس دەبێت کار بکات بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا دووبارە نەبێتەوە، ئەو نیازە پاك و بێگەردانەی کە ئامانجیان چاکە و باشەیە، دەمانەوێت بخەینە بەردەستی بەڕێزتان، ئەوەی پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە لە بارودۆخ و وردەکارییەکانی، هیواداریـن لێی بکۆڵنەوە و بە دانایی و ژیری خۆتان چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە بە جۆرێك کوردان ڕێکارە ئەرێنییەکان تیایدا بەدی بکەن، کە بێگومان دەبێتە بەرهەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

کابینەی پێشوو (بەیاننامەی ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦)ی دەربارەی کێشەی کورد دەرکرد و وەزارەتی ئێستاش پشتگیری لێکرد، بەیاننامەکە بە خۆشحاڵییەوە لەلایەن هاوڵاتیانەوە پێشوازی لێکرا، لە پێشی هەموویانەوە کوردان. بە ئومێدی پتەوکردنی برایەتی ڕاستەقینە لە نێوان خۆیان و برا عەرەبەکانیاندا و پابەندبوونیان بە خاکی نیشتمان و یەکێتی ڕۆڵەکانی، هەروەها دڵسۆزی بەرپرسان لە دەرکردنی ئەو بەیاننامەیە و جێبەجێکردنی بەندەکانی. نیازی کوردەکان لەو پێشوازییە گەورەیەدا دەرکەوت کە بەڕێزتان سەردانی باکوورتان کرد و لە هەموو سەردانەکانتدا بۆ باکوور لەلایەن گەلی کوردەوە پێشوازی گەرمتان لێدەکرا. ئەو پێشوازییە گەرمانە بەڵگەی ئەوەن کوردان هێشتا لایەنگری یەکێتی عێراقن و لە هەموو لایەك زیاتر سوورن لەسەری. هەروەها ئەو سەردانەیان بە ڕەنگدانەوەی دڵسۆزی ئێوە زانی بۆ تەواوی هاوڵاتیان بەبێ جیاوازی.

بەیاننامەی ناوبراو هیوای هەموو دڵسۆزان بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و سەردانەکەی بەڕێزیشتان هەلێك بوو بۆ گوزارشتکردن لە ڕەزامەندی و پێشوازی لە گەڕاندنەوەی پاکێتی. جەنابی سەرۆك پێمان ناخۆشە بە بەڕێزتان ڕابگەیەنین گومان و ناڕەحەتییەکی زۆر خەریکە دەکەوێتە نێو دڵی کوردانەوە، بە خۆدزینەوە و درەنگ هاتنە پێشەوە لە جێبەجێکردنی برگە و بابەتەکانی بەیاننامەکە. لەو کاتەوە تا ئێستا بەیاننامەکە جێبەجێنەکراوە. ئەمەش پرسیاری زۆری لە لای کوردان دروستکردووە کە دەشێت ئەو پرسیار و گومانانە هەرچی ئەو هیوا و ئومێدەی لە بەیاننامەکەدا هەڵیان چنیبوو بگۆڕێت بۆ بێئومێدی، ئەگەر

لایەنی پەیوەندیدار دەستپێشخەری نەکات لە زیندووکردنەوەی هیوا و ئومێد لە دڵاندا و ئەو متمانەیە بەهێز نەکات کە بەیاننامەکە دروستیکردبوو. ئەو متمانەیەی پێویستە هەمووکمان کاریکەین بۆ بەهێزکردنی، هەر ئەمەش ئامانجی ئەم یاداشتە سادەیەیە لە بەردەستی جەنابتاندا، لەو بارەیەوە بەڕێزتان دڵنیا دەکەینەوە کە لە جاران سوورتر و پێداگرترین لەسەر پاراستنی گیانی برایەتی نێوان کورد و عەرەب و کارکردن بە شێوەیەکی ڕاستەقینە بۆ ڕوونەدانی هەر کاردانەوەیەکی نەخوازراو لەم بارەیەوە، هەر ئەمەش وایلێکردین کار بکەین بۆ گێڕانەوەی ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دروستبوونی ئەو پرسیارانە لای هاوڵاتیانی کورد و ڕۆڵە دڵسۆزەکانی تری عێراق:

١. تا ئەمڕۆش یاسای پارێزگاکان بە شێوە هەموارکراوەکەی دەرنەکراوە.

٢. یاسای هەڵبژاردنەکان دەرنەکراوە، پێمان وایە دەبێت یەکەی هەڵبژاردن لەسەر بنەمای شارەدێ (ناحیە)، یان شارۆچکە (قەزا) بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ دەقەکانی کارنامەی یاسای پارێزگاکان و بڕگەکانی بەیاننامەکەدا پێکبێتەوە.

٣. چۆڵنەکردنی گوندە کوردنیشینەکان بە شێوە گشتییەکەی، تا ئێستا یاسایەك بۆ جێگیرکردنی دانەنراوە.

٤. بەندی تایبەت بە بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا جێبەجێ نەکراوە، بەشداریکردن لە دەسەڵات، بە دیاریکراوی مەبەستمان پۆست یان موچە

نییە، بەڵكو مەبەستمان بەشداریكردنی ڕاستەقینەیە لە داڕشتنی سیاسەتی وڵات و بەڕێوەبردنی كاروباری گشتی.

٥. بەو ئەندازەیەی لەگەڵ پێگەی كورداندا دەگونجێت لەم وڵاتەدا، تا ئێستاش وەزارەتەكان و فەرمانگەكانی ناوەند و دام و دەزگا گرنگەكانی وەك كۆمپانیای نەوتی نیشتمانی و ئەنجومەنی پلاندانان و هی تریش، كەسی كوردیان تێدا نییە كە پۆستێكی بەرپرسیارێتیان هەبێت.

٦. بەندی تایبەت بە دامەزراندنی بۆ كوردان لە ناوچەكانی خۆیان جێبەجێ نەكراوە.

٧. بەندی تایبەت بەوەی زمانی كوردی زمانی فەرمییە لە ناوچە كوردییەكان و دەبێت لە قوتابخانەكاندا بخوێندرێت، جێبەجێ نەكراوە.

٨. وێڕای دەركردنی یاسای لێبوردنی گشتی بۆ ئەو كوردانەی بەشدارییان كردووە لە بزووتنەوە سەربازییەكان لە باكووردا، بەڵام ئەو شێوازەی گیراوەتەبەر لە جێبەجێكردنی هەندێك لە دەقە یاساییەكاندا، ئاستەنگێكی گەورە دروستدەكات لە ئازادكردنی گیراوان و زیندانیان.

٩. وا چاوەڕوان دەكرا دوای دەركردنی بەیاننامەكە فەرمانبەران و كارگوزارانی كورد بگەڕێنەوە سەر كارەكانیان، بەڵام ئەم بڕگەیە تا ئێستا پشتگوێ خراوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەوانەی وەزیفە و پۆستی گرنگیان هەبووە، هیچ كەسیان تا ئێستا نەگەڕاونەتەوە، ژمارەی ئەو فەرمانبەرە بچووكانەش گەڕاونەتەوە ٥٪ی كۆی نەگەڕاوەكان تێناپەڕێنن. تەنها ژمارەیەكی كەمیش لە ئەفسەران گەڕێنراونەتەوە، ئەوانی تریان تا ئێستا

بە بێکار ماونەتەوە.

١٠. لە ڕووی خوێندن و ڕۆشنبیرییەوە، وێڕای قبوولکردنی بنەمای یەکسانی و دابینکردنی هەلی کار لە یاسادا هاتووە، بەڵام تێبینی ئەوە دەکرێت دەرگای کۆلێژەکان و بە تایبەت کۆلێژی پۆلیس و سەربازی و فڕۆکەوانی تا ئێستاش بە ڕووی قوتابیانی کورددا داخراون، وێڕای ئەوەی هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان دان بەوەدا دەنێن قوتابیانی کورد چەندین ساڵە تووشی میحنەت و دەردیسەری دەبن، کە وا دەخوازێت دۆزەکانیان بە نەرمی و دڵسۆزانە و ڕێزەوە چارەسەر بکرێن. کوردان لە خوێندنی باڵا بێبەش کراون، ئەی کەواتە چۆن دەتوانن بەشدار بن لە بنیاتنانی ئایندەدا؟ لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا چۆن بەشی دادپەروەرانەی خۆیانیان دەستبکەوێت لە وەزیفەکاندا؟

١١. بەو دواییانە تێبینیمانکرد چەندین بابەتی گرنگ، کە پەیوەندی پتەویان لەگەڵ ئێستا و ئایندەی وڵاتدا هەیە، هێشتا بابەتی لێکۆڵینەوە و قسە لەسەرکردنن، لەو کۆبوونەوە تایبەتانەدا بۆ ئەو مەبەستە دەبەسترێن، بەڵام ڕێگە نەدراوە بە هیچ کەسایەتییەکی کورد لەو کۆبوونەوانەدا بەشدار بێت، کە بێگومان باش دەزانن کوردان پایەیەکی گرنگن لە پایەکانی وڵات، هەر کێشەیەك یان مەسەلەیەك بارودۆخی وڵات ئاڵۆز بکات بەشێکی گەورەی ئەوانیش دەگرێتەوە، بۆیە هێشتنەوەیان لە دەرەوەی ئەو کاروبارە گرنگانە، بۆچوونێکی ناخۆش و ناپەسەندیان لا دروست دەکات.

زیادەڕەویمان نەکردووە ئەگەر بڵێین گرنگتر لە هەموو ئەوانەی باسمانکرد بابەتی ئاوەدانکردنەوەی باکوورە، چونکە بابەتێکە پەیوەندی بە سەدان هەزار کوردەوە هەیە. وێڕای بوونی وەزارەتێك بە ناوی (وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەی باکوور) زیاتر لە پێنج مانگە، بەڵام خەڵکی باکوور کە تووشی ئەو هەموو ماڵوێرانی و دواکەوتنە بوون، کەچی تا ئێستا یەك دەستپێشخەری کردارییان نەبینیوە، کە هیوا و ئومێدیان بە بەردا بهێنێتەوە، وەزارەتەکە تەنها وەك پەیکەرێکی بێگیان ماوەتەوە و تا ئێستا دەسەڵاتی یاسایی و پێکهاتەی ئیداری و هونەری و دارایی تەواو نییە. کە بە پارە نەبێت هیچ پرۆژەیەکی ئاوەدانکردنەوە ناکرێت و ناتوانرێت هیچ کارێکی ئاوەدانکردنەوە بکرێت. بۆیە ناوچەکە بە مەحرومی ماوەتەوە لە هەر پێشکەوتنێکی ئابووری و ئاوەدانکردنەوە وەك لە ناوچەکانی تردا بەدیدەکرێت، وەزارەتی ناوبراو بۆتە بابەتێکی گەرمی ڕۆژنامە و ئێزگەکان.

جەنابی سەرۆك تراجیدیاکانی ئەم کێشەیە لە کەس شاراوە نییە. لە ئەمڕۆشدا نامانەوێت هەست و سۆزەکان بوروژێنین یان زیندوویان بکەینەوە، بەڵکو هیوادارین کاری باش و دڵسۆزانە بکەن و لایەنەکان دەست لە نێو دەستی یەکتر بنێن بۆ لابردنی تارماییەکانی، کە تا ئێستاش بەدبەختی و ماڵوێرانی دەهێنێت بە سەر زۆرینەی ڕەهای کورددا، لە ئێستادا کۆمەڵێك بەبێ خانە و لانەن و بەشێکیتریش بەبێ نان و کار. جومگەکانی ژیان وەستاون و دەرگای قوتابخانەکان داخراون و خزمەتگوزارییە پزیشکییەکان لە خاڵی سفردان، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا،

دڵسۆزان ئومێدەوارن، ئەوەی پرۆگرامی ناوبراو لەخۆیی دەگرێت جێبەجێبکرێت بۆ ئەوەی ژیان بگەڕێتەوە سەر رێچکەی ئاسایی خۆی و خۆشەویستی و برایەتی بگەڕێتەوە دۆخی جارانی. وەك دەزانین بەرنامەی ئاماژەپێکراو بەرنامەیەکی چاکسازییە و هەردوو کابینەی یەك لە دوای یەك پێوەی پابەندبوون و بەڕێزیشتان قبووڵتان کرد و ڕەزامەندبوون لەسەری. لەبەرئەوە بوو، بە پلانی فەرمی دەوڵەت جێگیریکرد بۆ دەوڵەت، بۆیە نابێت ئەو بەرنامە و پرۆگرامە هەڵسپێردرێت یان بە مەرج کاری پێبکرێت.

فەرمانی وردەکارییەکانی بۆ بەڕێزتان جێدەهێڵین، بەو هیوایەی لەلایەن بەڕێزتانەوە گرنگی پێبدرێت بۆ چارەسەرکردنی و کۆتایی پێهێنانی بەو جۆرەی لەگەڵ گرنگییەکەیدا دەگونجێت، چونکە کێشەیەکە لایەنێکی مرۆیی و لایەنێکی نیشتمانی هەیە، پەیوەستە بە بەرژەوەندی چینێکی زۆر لە رۆڵەکانی گەلی عێراقەوە، ئەگەر جێبەجێنەکرێت، زیان بە بەرژەوەندی تەواوی عێراق دەگەیەنێت، چارەسەرکردن و جێبەجێکردنی بە هەنگاوی گەڕانەوەی بارودۆخەکە دەبێت بۆ سەر رێچکەی دروستی خۆی، نەك تەنها لە باکووردا، بەڵکو لە تەواوی عێراقدا. جەنابی سەرۆك ئەم یاداشتە هەرچەندە واژۆی تەنها ئێمەی لەسەرە (وەك دوو کەس)، بەڵام لە واقیعدا گوزارشتە لە دید و بۆچوونی ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی کورد لە بەغداد، کە لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوانیاندا ئەم یاداشتەیان ئامادە کردووە.

خوداش ئاگای لە نیازەکانە

بەغداد ۱۹۶۷/۱/۱۹

فوئاد عارف

بابا عەلی شێخ مەحموود

### وتەیەك:

کاتێك بەشەکانی پێشووی ئەم یاداشتە بە دوای یەکدا تایپ دەکران و پیشانی هاورێ نزیکەکانم دەدا، پرسیاری ئەوەیان دەکرد بۆچی باسی زۆر شتم نەکردووە کە لە بۆنە جیاجیاکاندا بۆیانم باسکردووە، پێداگرییان دەکرد لەوەی ئەوانەش بنوسم و بڵاویان بکەمەوە، چونکە پەند و ئامۆژگارییان تێدایە، قەناعەتم بە قسەکانیان هێنا و بریارم دا ئەم بەشەش بخەمە سەر بەشی یەکەمی یاداشتەکانم، نمونەیەکی کەم لە یاداشتەکانم هەڵبژارد، کە شانازی بە رووداونیانەوە دەکەم، وایدەبینم بڵاوکردنەوەیان سوودێکی هەیە، بەو هیوایەی بە پشتیوانی خوای گەورە، بتوانم لە بەشی دووەمدا نمونەگەلێکیان لێبڵاوبکەمەوە.

### بەرێز سەید موحسین شەلاش

ساڵی ١٩٤٧ بەرێوەبەری تەجنیدی ناوچەی کەربەلا بووم، سوور بووم لەسەر ئەوەی دەبێت مامەڵەی هیچ هاوڵاتییەك لە کاتی خۆی دوانەکەوێت. رەچاوی بارودۆخی موراجیعەکانم دەکرد و بۆ ئاگاداربوون لە بەرێوەچوونی کارەکانیان بەسەر فەرمانگەی تەجنید و نفوسدا دەسوڕامەوە، ئەمەش وایکرد خەڵکەکە خۆشیان بوێم. رۆژێکیان پیاوێکی عەمامە بەسەری عەبا لەسەر شانی بە هەیبەت و سەنگین سەردانی کردم، تەمەنێکی کردبوو، زۆر خۆشحاڵبووم بە سەردانەکەی و بێئەوەی بیناسم رێزێکی زۆرم لێگرت و چاییم بۆ بانگکرد، تێگەیشتم هیچ کارێکی نییە و

تەنها بۆ سەردانیکردنم هاتووە، لەگەڵیدا قسەم دەکرد و مامەڵەی موراجیعەکانیشم بەڕێدەکرد.

لەو کاتەدا زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا، عەبدولموحسین ئەلوەقفی بەڕێوەبەری ئەوقافی کەربەلا بوو. داوای سەیید موحسین شەلاشی کرد، پێمگوت: بەڕێز موحسین شەلاش لێرە نییە، میوانەکە وتی: "من موحسین شەلاشم کە لە تەلەفۆن داوا دەکرێم". ئەوجا زانیم میوانەکەم وەزیری دارایی ساڵی ١٩٢٣یە.

قسە و باسمان کردەوە، باسی خۆی کرد کاتێك لە ساڵی بیستەکان وەزیری دارایی بووە، بەر لەوەی بکرێتە وەزیر مەرجی ئەوە بووە ڕێگری لێنەکرێت لە بەردەوامیی لە کارە تایبەتەکانی، بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، هەر کاتێك حکومەت پارەی لێبڕایە بە قەرز پارەی دەدایە حکومەت، وتی هیچ کارێکی نەبووە و لە نەجەفەوە تەنها بۆ ئەوە هاتووە بمناسێت، لەبەر ئەوەی بیستوویەتی کە هەڵسوکەوت و مامەڵەم لەگەڵ خەڵکیدا باشە و بە تەنگەوەم بۆ زوو خستنەڕێی مامەڵەی هاوڵاتیان.

وتی: "زۆر ئاسوودەبووم پێت، خۆشمویستی بۆ ئەو مامەڵە جوانەی لەگەڵ خەڵکیدا دەیکەیت، ئەو ڕێزەی لە منت گرت بێئەوەی بمناسی، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە پەروەردەیەکی باش کراوی". بەو بۆنەیەوە باسێکی بۆ گێڕامەوە کاتێك کە وەزیری دارایی بووە، وتی: "جارێکیان چووم بۆ بەسرە بۆ ئەنجامدانی هەندێك کاری تایبەتی خۆم، لە گەڕانەوەدا بە شەمەندەفەر بۆ بەغداد، لە فارگۆنەکەدا کەسێك لە کورسییەکەی

بەرامبەرم دانیشتبوو، منیش عەمامە و عەبام لەبەر بوو. هەر کە شەمەندەفەر کەوتە ڕێ، هاوڕێی سەفەرم بوتڵێك مەی و هەندێك موقەبیلات و میوەی دەرهێنا، میوەی پێشکەشکردم و دەستمان بە قسانکرد، داوای لێبوردنم لێکرد، چونکە داوایکرد لەگەڵیدا بخۆمەوە و منیش ڕەتمکردەوە، پێداگری دەکرد لەگەڵیدا بخۆمەوە، منیش بە ئەدەبەوە داوای لێبوردنم لێکرد. وردە وردە سەرخۆش بوو دەستی کرد بە گاڵتەکردن بە خۆم و عەمامە و عەبا و ڕیشم و گۆرانی دەگوت و دەیگوت:

عەمامەکەت ڕەشە چەلەبی

ڕیشـت بـۆگـەنە چەلـەبی

جلوبەرگت پیسە چەلـەبی

منیش هەر ئارامگرت و دەنگم نەکرد، تا چوومە سەر سەرینەکەم و خەوتم، ئەو هێشتا لە گاڵتە و گەپی خۆی نەکەوتبوو، کە بەیانی گەیشتینە بەغداد و لە شەمەندەفەر دابەزیم، هەندێك هاتبوونە پێشوازیم و جانتاکەیان لێوەرگرتم، ئەویش دابەزی و هێشتا هەندێك لە سەرخۆشییەکە لە سەریدا مابووەوە ویستی داوای لێبوردن بکات وتی: "قوربان، شەوێکی خۆش بوو، دەترسم بێزارم کردبێت، هەرچییەکت ویست لە بەغداد هیوادارم دوودڵی نەکەیت و بێیت بۆ لای خۆم، خۆمت پێدەناسێنم مەمدوحی پشکنەری دارایی، لە وەزارەتی دارایی". منیش وتم: "چ عەیبی نییە منیش با خۆمت پێبناسێنم، موحسین شەلاش وەزیری دارایی".

چی لێهات! بە دەستێك عەباکەمی گرتبوو، بە دەستەکەی تری لە خۆی دەدا و دەیگوت:

خـراپ تێیکـەوتـم چەلەبی

مندالّم هەتیو کـەوت چەلەبی

مالّت ڕووخـــاندم چەلەبی

قوربـانی عـابـات چەلەبی

قوربـانـی ڕیشت چـەلەبی

بە یارمەتی ئامادەبووان خۆمم لێ ڕزگار کرد، دوای چەند ڕۆژێك لە وەزارەت ناردم بە شوێنیدا و پێمگوت: "کوڕم ئەگەر منت نەدەناسی چ پێویست بوو ئەو ڕەفتارەم لەگەڵ بکەیت"، لەگەڵ ئەوەشدا وتم قەیناکات، هەندێك ئامۆژگاریم کرد و لێی خۆشبووم.

### میری ئەلڕەبیعە

دۆستایەتی کۆنم لەگەڵ میری هۆزی ئەلڕەبیعە موحەممەد ئەلئەمیر و بە تایبەت عەلی ئەلئەمیری برایدا هەیە و سەردانی یەکتر دەکەین، کاتی سەرەتای هاوسەرگیریم لە ساڵی ١٩٣٨ ئەو کاتەی ماجید مستەفای خاڵم پارێزگاری کوت بوو، لەگەڵ هاوسەرمدا لە کوت بووینە میوانیان.

عەبدولئیلاه، هیامی کچی موحەممەد ئەلئەمیری هێنا بوو، دوای شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ کە وەزیر بووم لە حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسمدا، دایکی هیام (خێزانی موحەممەد ئەلئەمیر) لەگەڵ خاڵۆژنمدا

سەردانیان کردم و داوایکرد یارمەتی بدەم لە وەرگرتنەوەی پاشینەی (مؤخرة) زەواجی کچەکەی لە حکومەت، کە ١٢٠٠٠ دینار بوو بەهۆی کوژرانی شازادەی پێشوو عەبدولئیلاهەوە، چونکە بەهۆی دەرکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی کەوتبوونە هەژارییەکی قورسەوە.

هیام دادوەرێکی لە بنەماڵەی -ال العبطة- کردبووە بریکاری خۆی بۆ ئەوەی لە بری ئەو لەبەردەم دادگا بەرگری لێبکات، من و پارێزەرەکەی سەردانی مستەفا عەلی وەزیری دادمان کرد و لە بارەی بابەتەکەوە قسەمان لەگەڵکرد، وایزانی بۆ ئەو کارە لەلایەن عەبدولکەریمەوە ڕاسپێردراوم، چونکە لەو کاتەدا پەیوەندیم لەگەڵ عەبدولکەریمدا خۆشبوو. لە ڕاستیدا عەبدولکەریم هیچ ئاگاداری بابەتەکە نەبوو. دوای ئەوەی ڕێکارە یاساییەکان ڕێچکەی خۆیان گرت، توانیمان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دادگا لە بەرژەوەندی هیام خان بڕیار بدات و مامەڵەکە نێردرا بۆ فەرمانگەی جێبەجێکار.

بیرمە دوای چەند ڕۆژێك چوومە ژوورەکەی تەنیشت نوسینگەکەی عەبدولکەریم قاسم لە وەزارەتی بەرگری، ئەلمەهداوی و تەها شێخ ئەحمەدیش لەوێبوون، دەبینم عەبدولکەریم قاسم زۆر بە تووڕەییەوە قسەی دەکرد لەسەر بڕیاری قازی بە خەرجکردنی ١٢٠٠٠ دینار بۆ ژنەکەی عەبدولئیلاه، بێدەنگبووم و هیچم نەگوت، دوای چەند خولەکێك مستەفا عەلی وەزیری داد پەیدا بوو، کە عەبدولکەریم بانگیکردبوو، هەر کە چووە ژوورەوە، عەبدولکەریم دایگرتەوە بە قسە و سەرزەنشتکردن و شانی

دەگرت و دایدەتەکاند، لەسەر ئەو کارەی کراوە کە عەبدولکەریم بە شکاندنی هەیبەتی حکومەتی دادەنا، کە دوای ئەم بڕیارە چەندین حوکم و بڕیاری تری لەو جۆرەی بەدوادا دێت. وەزیری داد لایەکی کرد بەلامەوە بۆ ئەوەی بە قسەیەك پشتگیری بکەم و وتی: "ئەوەندەی من بزانم کاکە فوئاد لە خۆیەوە قسە ناکات". عەبدولکەریم قاسم وتی: "لە خۆیەوە قسە ناکات مانای چییە؟" وەڵامم دایەوە و وتم: جەنابی زەعیم من بە فەرمانی تۆ، بەدوای ئەم بابەتەدا کەوتم، بیرتە پێش ماوەیەك وتت: ئەو ژنە عێراقییە و لەو داواکارییەی کە هەیەتی، لەسەر حەقە و یاسا لەگەڵیدایە و دەبێت ئێمەش بە ویژدان بین لەگەڵیدا؟

بە تووڕەییەوە وتی: "کوا من شتی وام گوتووە؟". وتم: بەڵێ گوتووتە، بەڵام پێدەچێت بیرت نەمابێت، هیچ ماقوڵ نییە بەبێ ئاگاداری تۆ بە دوای بابەتێکی وادا بڕۆم". نیشانەی سەرسوڕمان لە دەموچاویدا دەرکەوت و چووە ژوورە تایبەتەکەی خۆی و دەرگاکەی داخست، بە وەزیری دادم وت: فەرموو تۆ بڕۆ. کە خوداحافیزیی لێکردم وتی: "باوکی فەرهاد خوا تەمەنت درێژکات". بە ئەلمەهداوی و تەها شێخ ئەحمەدم وت: فەرموو ئێوەش بڕۆن و بە تەنیا جێمان بهێڵن.

بە تەنیا لە ژوورەکەدا مامەوە، دوای چەند خولەکێك عەبدولکەریم هاتە دەرەوە و دوای ئەوەی ئارام بووەوە پرسیاری کرد: "تۆ دڵنیای من تۆم بۆ قەزیەکەی هیامی کچی میری ئەلرەبیعە ڕاسپارد؟" پێمگوت: پێدەچێت ماندووبیت، ئەمجا بۆچی هێندە تووڕەیت، ئەی باسی ئیمپراتۆر فەردەریك

و ئاشەکەت نەبیستووە یان نەخوێندۆتەوە. وتی: "نەخێر، بەڵام فەردەریك و ئاشەکە چ پەیوەندییەکیان بەم بابەتەوە هەیە؟" وتم: کەواتە گوێبگرە.

فەردەریکی گەورەی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا، ماوەی جارێك دەچوو بۆ شوێنێکی زۆر خۆش لە گوند بۆ پشوودان و دوور لە ژاوەژاو، بەڵام ئاشێك لەو نزیکانە هەبوو هی پیاوێك بوو، هەر کە کاری بکردایە هەموو ئەو ماوەی پڕ لە هاڕەهاڕ دەکرد و ئیمپراتۆری بێزار دەکرد. پیاوانی ئیمپراتۆر چوون بۆ لای خاوەن ئاش و پێیان وت: "یەکێك لەم دووانە هەڵبژێرە، یان ئاشەکەت لێرە دەگوزایتەوە، یان پێمانی دەفرۆشیت، چونکە بە دەنگەکەی ئیمپراتۆر بێزار دەبێت". کابرا وتی: "نە پێتانی دەفرۆشم و نە لێرەش دەگوازمەوە، چونکە سەرچاوەی بژێوی منە و کەی بمەوێت وەگەڕی دەخەم". لە دادگا سکاڵا کرا و دادگا لە بەرژەوەندی خاوەن ئاش بڕیاری خۆی دا.

کاتێك خاوەن ئاش بڕیارەکەی وەرگرت، چوو بۆ لای ئیمپراتۆر و پێیگوت: "جەنابی ئیمپراتۆری پروسیا ئاشەکەم لەگەڵ بڕیارەکەی دادگا پێشکەشتان دەکەم، کە هێمای دادپەروەرییە لە وڵاتەکەماندا، هەر ئەوەندە شانازییە بۆ من هاوڵاتی وڵاتێکم تیایدا هاوڵاتییەکی سادە دەتوانێت شکات لە گەورەترین ئیمپراتۆر بکات و حوکمەکەش بباتەوە". ئەنجام عەبدولکەریم قاسم بۆچوونەکەی قبووڵکردم.

عەبدولکەریم قاسم ناردی بە شوێن موحەممەد ئەلئەمیردا و پرسیاری

کرد بۆچی ئەو داواکارییەتان کردووە، بە بەرچاوی منەوە پێیگوت: "جەنابی زەعیم من برسیمە! هەر ئەمەش هۆکار بوو داوای پاشینە -مؤخرة-کەی هیام بکەین".

عەبدولکەریم ووتی: تۆ هەندێك کارگەت هەیە لەسەر زەوییە دەست بەسەراگیراوەکانت کە بە ٤٥٠٠٠ دینار دەخەمڵێنرێت و دەوڵەت دەستی بەسەردا گرتووە، ئێمە ئامادەین ئەو پارەیەت بدەینێ ئەگەر بابەتی پاشینەی کچەکەت دوابخەیت. موحەممەد ئەلئەمیر وتی: "ئەگەر دەوڵەت ئامادە بێت پارەی کارگەکانم بدات ئەوا پاشینەکەی ناوێت". عەبدولکەریم قاسم وتی: "نەخێر، پاشینەکەش دەدەینەوە، بەڵام دوای ماوەیەکی تر نەك ئێستا، ئێستا بەپێی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەتوانین قەرەبووی کۆمپانیاکانت بدەینێ".

### یاداشتێك بۆ سەرۆك کۆمار عەبدولسەلام عارف

لە ساڵی ١٩٦٣وە پەیوەندیم لەگەڵ ڕەشید عالی ئەلکەیلانی و شێخ موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبیدا بەهێزتر بوو، تا ڕادەی سەردانی خێزانیی، پەیوەندییەکانمان گەشتە ئەوەی کاری هاوبەشی سیاسیی پێکەوە بکەین، لە ڕاستیدا من جێی متمانەی هەردووکیان بووم، خوالێخۆشبوو کامل ئەلچادرچی لەگەڵ نەسیری کوڕیدا لە ماڵدا سەردانیانکردم، دیاربوو کامل ئەلچادرچی دەیزانی پەیوەندیم لەگەڵ شێخ موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبیدا هەیە، بۆنی ئەوەشی کردبوو پەیوەندییەکی سیاسیی پێکمان دەبەستێتەوە، لەو بارەیەوە پرسیاری کرد و بە (بەڵێ) وەڵامیم دایەوە.

پێکەنی و وتی "تۆ کورد و ئەو شیعە، بۆنی تائفییەت لە چالاکییەکانتان دێت". پرسیارم کرد: چی لە مێشکتدا دەخولێتەوە؟ وتی: "ئەگەر نیشتمانی دیموکراتی بکەوێت لەگەڵتان، ئەوا چالاکی سیاسی سیفەتێکی گشتی نیشتمانی لەخۆدەگرێت. وتی: "باوکی فەرهاد، ماوەیەکی زۆر دوورودرێژە شێخ ڕەزا ئەلشەبیبیم نەبینیوە، ئەو پیاوێکی بەڕێز و دڵسۆز و نیشتمانپەروەرە، حەز دەکەم چاوم پێبکەوێت و لە کاروباری گشتیدا هاوکار بم لەگەڵی، بەڵام ماقوڵ نییە ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ ئامادەسازییەك بچم بۆ ماڵی، یان بانگهێشتی بکەم بۆ ماڵی خۆمان. بەوەی تۆ دۆستی هەردوولای، دەتوانیت بانگهێشتمان بکەیت بۆ چاخواردنێك بۆ ماڵی خۆتان و لەوێدا چاومان بە یەکتر دەکەوێت و بابەتەکەش باس دەکەین. چووم بۆ لای شێخ ڕەزا ئەلشەبیبی و باسەکەم لەگەڵ کردەوە، ئەویش زۆر مەدح و سەنای کامل ئەلچادرچی کرد و بیرۆکەکەی پێباش بوو. دوای نیوەڕۆیەك هەردووکیانم بانگکرد بۆ چاخواردنەوەیەك لە ماڵی خۆمان. لەو چاوپێکەوتنەدا باسی بارودۆخ و کێشەکانی عێراق کرا. ڕێککەوتن لەسەر نووسینی یاداشتێك بۆ عەبدولسەلام عارف و تیایدا کێشەکانی عێراق و چارەسەرەکانیشی بخەنە ڕوو. دوای ئەوە لەسەر خاڵە سەرەکییەکان ڕێککەوتن، بڕیار درا کامل ئەلچادرچی یاداشتەکە بنوسێت، شێخ موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی وتی: "کاتێك لای تۆ کۆدەبینەوە، لەگەڵ بەڕێز ڕەشید عالی ئەلگەیلانیدا واژۆی دەکەین". ئەلچادرچی وتی: "ئەگەر گەیلانیمان لەگەڵ بێت واژۆی ناکەم". شێخ موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی وتی: "کاك فوئاد ئاگاداری پەیوەندی ئێمەیە لەگەڵ ڕەشید عالی

ئەلگەیلانیدا و ئێمە بەبێ ئەو هیچ کارێك ناکەین، کۆبوونەوەمان لەگەڵ ئێوە بەبێ ئاگاداری ئەو نابێت، لەو باوەڕەوە بوو کە هیچ ناڕەزایەتییەك لەلایەن ئێوەوە نییە، لە ڕاستیدا لە سەرەتاوە نەمدەزانی ناکۆکی لە نێوان ڕەشید عالی و ئەلچادرچیدا هەیە، ئەلچادرچی وتی ئامادە نییە یاداشتێك ئامادە بکات، ئەگەر ڕەشید عالی ئەلگەیلانی واژۆی لەسەر بکات. دوای گفتوگۆ و تاوتوێکردنی بابەتەکە، ئەلچادرچی پێشنیاریکرد لاری نییە لە واژۆی ڕەشید عالی ئەلگەیلانی لەسەری، بە مەرجێك ژمارەی واژۆکەران زیاد بکرێت. ئەلچادرچی یاداشتەکەی ئامادەکرد کە یاداشتێکی تەواو تێروتەسەل بوو، لەگەڵ ئەلچادرچیدا چووین بۆ ماڵی شێخ ڕەزا ئەلشەبیبی و یاداشتەکەمان لای دانا بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە و بۆچوونی خۆی لەسەر بدات، لەبەر ئەوەی لە سەردانەکەماندا چەند کەسێکی سەر بە حکومەت لای دانیشتبوون بۆیە گفتوگۆی بابەتەکەمان نەکرد، دوای چەند ڕۆژێك بۆی گەڕاندینەوە، هێندەی گۆڕانکاری تێدا کردبوو، کە هیچ لە وێنە ئەسڵەکەی نەدەچوو، کە وایکرد ئەلچادرچی واژۆی لەسەر نەکات و پێیگوت: شێخمان، تۆ گەورەمانی و دەتوانیت بەناوی هەمووانەوە واژۆی لەسەر بکەیت. منیش لای خۆمەوە واژۆم لەسەر نەکرد. نازانم ئایا خوالێخۆشبوو شێخ ئەلشەبیبی یاداشتەکەی پێشکەش کرد یان نا، چونکە دوای ئەوە یەکسەر دوورخرامەوە بۆ عەین ئەلتەمر.

## دیاریی مەلیك غازی

کۆشکی شاهانە چەند پارچە زەوییەکی لە ناوچەی وەزیرییە، بەسەر هەندێك کەس و پاسەوانەکاندا دابەشکرد، بەڵام من ڕەتمکردەوە پارچە زەوییەکە وەربگرم، هەروەها کۆشك ئۆتۆمبێلی بەسەر کارمەندانی کۆشکدا دابەشکرد، عەقید ڕەشید عەلی پاسەوانی یەکەم ئۆتۆمبێلێکی دۆجی درایە، ڕائید زاهیر ئەلزوبەیدیش هەمان شت ئۆتۆمبێلێکی دۆج. منیش ئۆتۆمبێلێکی شۆفرلێت، بەڵام ڕەتمکردەوە و وەرمنەگرت، لە ڕاستیدا هۆکارەکەشی ئەو ئامۆژگارییەی بەکر سدقی بوو لە مێشکمدا چەسپا بەر لەوەی وەك پاسەوانی مەلیك غازی دەستبەکار بم، پێیگوتم کە بە پاڵنەری تەماحی ماددی کارنەکەم، بەڵکو دەبێت بە مانایەکی گەورە وەزیفەکەم بپارێزم.

کاتێك ژنم هێنا، مەلیك غازی پرسیاری کرد چیت دەوێت بۆت بکەم، دوای ڕەتکردنەوەی پارچە زەوی و ئۆتۆمبێلەکە. پێمگوت: تەنها وێنەیەکی خۆتم پێشکەش بکە بەسە. وێنەیەکی خۆی بەدەستخەت و واژۆی خۆی لەگەڵ کاتژمێرەکەی دەستیدا پێشکەشکردم، پێمگوت: بەڵێنت دەدەمێ ئەم وێنە و کاتژمێرە لە ڕۆژی زەواجکردنیدا پێشکەش بە کوڕەکەم دەکەم، هەرواش بوو، کاتێك فەرهادی کوڕم زەواجی کرد پێشکەشیم کرد.

تا ئێستاش ئەو ئامۆژگاریەی بەکر سدقیم وەك خۆی لە بیرە، کە ئامۆژگارییەکی یەکجار بەنرخ بوو و لە ژیانی کارکردنمدا زۆر سوودم لێبینی.

## زیندانی سلێمانی

لە ساڵی ١٩٣٩ وەك یاریدەدەری فەرماندەی فەوج گواسترامەوە بۆ سلێمانی، بارودۆخی سلێمانی نائارام بوو، خەڵکی شار و عەشایەریش بە نارەزاییەوە لە عەبدولمەجید ئەلیەعقوبی پارێزگاریان دەڕوانی، هۆکارەکەشی ئەوەبوو دوو کەسی ناودار کە حەمەڕەشید خانی بانە و سەیید عەتا کە کەسایەتییەکی ناسراوی سلێمانی بوو و خزمەتێکی زۆریان بە دەوڵەتی عێراق کردبوو، لەگەڵ ئێراندا جەنگابوون و زیانی گەورەیان کردبوو، بەڵام هەر کە حکومەتی عێراق لەگەڵ ئێراندا ڕێککەوت پشتی لە هەردووکیانکرد و سپڵە دەرچوو لە بەرامبەریان، دوای ئەوەش گرتیانی و چەکی کردن، ئەمەش نارەزایی لای خەڵکە گشتییەکە دروستکرد.

دوای ڕێککەوتن لە نێوان پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکاندا، شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود هات بۆ لام تا دەربارەی رزگارکردنی ئەو دوو کەسە قسەم لەگەڵ بکات. ڕەزامەندیم دەربڕی و لەو بارەیەوە قسەمانکرد. وا ڕێکەوت لەو ڕۆژانەدا بە بۆنەی تاج لەسەرنانی مەلیکەوە ئاهەنگێکی چاخواردنەوەمان لە یانەی سەربازی ڕێکخست، لە کاتی ڕێکخستنەکەدا پێشنیارم بۆ پارێزگار کرد هەندێك کێك بۆ زیندانییەکان بنێرین بۆ ئەوەی ئەوانیش لای خۆیانەوە بەشداری ئەم ئاهەنگە بکەن، ڕازی بوو. هەر لەوێدا دوو دەمانچەم بە ٢٠٠ فیشەکەوە خستە ژێر کێکەکە و سەرم داپۆشی و بۆ خۆم بردم بۆ زیندان بۆیان و بانگی حەمەڕەشید خانم کرد و بە گوێیدا چرپاندم کە چی لە ژێریدایە، بە دەنگی بەرز هاواریکرد: "بۆ خۆم دیارییەکە دابەش دەکەم". ئیتر من هاتمە دەرەوە.

شەوەکەی حەمەڕەشید خان و سەیید عەتای هاوڕێی توانیبوویان پاسەوانەکان بگرن و دەستبگرن بەسەر جبەخانەکەدا و لە زیندان هەڵبێن. بە هەڵاتوویی مانەوە، تا حاجی ڕەمەزان کرایە پارێزگاری سلێمانی، ئەو کاتە بە ویستی خۆیان گەڕانەوە و خۆیان ڕادەستکردەوە، پارێزگاری تازەش توانی لێبوردنێکی تایبەتییان بۆ بەدەست بێنێت و هەردووکیان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان.

## ناکۆکی نێوان بارزانی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد

بارزانی خۆی بە سەرکردەی میللەتی کورد دەزانی، بڕوای بە حیزب یان ژیانی حیزبایەتی نەبوو، بۆیە لە گەڵدا ڕووبەری زیاتر دەبینی وەك لەوەی لە حیزبدا بەرتەسك بکرێتەوە. ئا لێرەوە ناکۆکیی لەگەڵ جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیدا دەرکەوت و هەرزوو ناکۆکییەکە ئاشکرا بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ گەیشتە لوتکە. بارزانی نامەیەکی بۆ ناردم و داوای کردبوو بێمە کوردستان بۆ نێوەندگیری ناکۆکی نێوان خۆی و باڵی مەکتەبی سیاسی. لە نامەکەیدا نووسیبووی جگە لە تۆ متمانەم بە کەسی تر نییە قسە لەم بابەتەدا بکات و پێویستە ئامادە بیت.

هاوکات نامەیەکیشم لە ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری ئەو کاتەی پارتی دیموکرات پێگەیشت، داوای کردبوو پێویستە بچمە کوردستان و قسە و نێوەندگیرییەك لە بابەتی ئەو جیابوونەوەیە بکەم کە دروست بوو بوو. تەنانەت لە نامەکەدا نووسیبووی ئەگەر ئامادە نەبیت بە خیانەت بۆت حیساب دەکرێت.

لەو كاتەدا لە بەغداد لە ژێر چاودێریدا بووم، وەك باسمكرد بۆ هەر جێیەك دەچووم ماتۆڕسكیلێك بە دوامەوە بوو. كەوتمە دۆشدامانێكی گەورەوە، چۆن بڕۆم لە كاتێكدا لە ژێر چاودێریدام، لەبەر داواكەی ئەوانیش حەزمدەكرد بڕۆم، بۆیە هەڵوێستەكە بۆ من زۆر تەنگەژە بوو. پەیوەندیم كرد بە خوالێخۆشبوو ڕەشید عارفەوە و داوام لێكرد لە ماڵی خۆیان لە بەغداد هەندێك كەسایەتی كورد بانگهێشت بكات. داواكەی جێبەجێ كرد، كەشی دانیشتنەكە زیاتر لە كۆبوونەوەیەكی دۆستانە دەچوو، چونكە ئامادەبووان هۆكاری كۆبوونەوەكەیان نەدەزانی.

كە هەموو گەیشتن، دەرگاكەم داخست و گفتگۆكەم كردەوە و هۆكاری كۆبوونەوەكەم بۆ باسكردن و ئاگادارمكردنەوە لە زمان لێدان و گەیاندنی كۆبوونەوەكە. ئەوەندە تووڕەبووم تا ڕادەی جنێودان بەوانەی هەواڵی ئەم كۆبوونەوەیە دەگەیەنن. بە پێچەوانەی عادەتی خۆم و ئەوانەی من دەناسن دەزانن كەسێكی دەمپیس نیم. ئەمجا هەردوو نامەكەی بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەدم دەرهێنا و پیشانی ئامادەبووانم دا بۆ ئەوەی بیخوێننەوە و چی دەكرێت لە گفتوگۆ لەسەری بكرێت، چونكە من لە ژێر چاودێریدام و ڕۆیشتنم بۆ كوردستان كارێكی ئاسان نییە.

پێشنیارمكرد كۆمەڵێك لە ئامادەبووان بەبێ من ئەو سەفەرە بكەن بە مەبەستی نێوەندگیری، دەبینم كەسیان ئامادەنین بڕۆن. ئیتر هیچ چارەیەك نەما، بۆیە بێ ئەوەی گوێبدەمە ئەوەی چی ڕوودەدات بڕیارم دا خۆم بڕۆم بۆ كوردستان، ئەوجا هەموو ئامادەبووان لەگەڵمدا بێن، چەند

کەسێکمان هەڵبژارد بۆ چوونە کوردستان کە بریتیبوون لە هەریەك لە د.عەبدوڕەحمان عەبدوڵڵا و عەلی کەمال و لیوا مەجید عەلی و عەقید ڕەئوف ئەحمەد و ڕەشید عارف و چەند کەسێکی تر.

بەیانی ڕۆژی دواتر تاهیر یەحیا کە ئەو کات سەرۆك وەزیران بوو، تەلەفۆنی بۆ کردم کە حەز دەکات بمبینێت.

چووم بۆ لای پێیگوتم: سەرۆك کۆمار عەبدولسەلام عارف حەز دەکات چاوی پێت بکەوێت. پەیوەندیم پێوەکرد، گوتی: چاوەڕوانتانم. کە چووم بۆ لای، دەبینم موجامەلەم دەکات. پرسیاریکرد "دوێنێشەو بۆچی بەو ڕادەیە تووڕەبوویت، ئێمە براتین و ڕێگر نابین لەوەی هەرکات دەتەوێت بچیت بۆ باکوور". پرسیارم لێکرد چۆن بابەتی کۆبوونەوەکەی زانیوە؟ وتی: "فلان و فلان تەواوی کۆبوونەوەکەیان تۆمار کردووە و یەکێکیان داویەتی بە ئاسایشی گشتی و ئەوی تریشیان داویەتی بە هەواڵگری سەربازی، ئەمجا کاسێتەکانیان هێنا و گوێمان لێگرت و دڵنیابووم دووان لە ئامادەبووان کە لە نێو ئەوانەدا نین ناومان هێنان کۆبوونەوەکەیان تۆمارکردووە، بە هەرحاڵ خودا لە ماڵی تەنیاییاندا لێیان خۆشبێت. هێندە خۆیانیان نەگرتبوو تا سبەی ڕۆژ دەبێتەوە ئەوجا ڕاپۆرتە تۆمارکراوەکەیان ڕادەست بکەن.

ئێمە هاتینە کوردستان و بارزانی لە دوکان پێشوازی لێکردین و چووینە ڕانیە و مام جەلالیش لەلایەن حیزبەوە ئامادە بوو و گەیشتنە ئەنجامی زۆر باش. پێشتر دکتۆر عەبدوڕەحمان عەبدوڵڵا ئاگاداری بارزانی و

ئیبراهیم ئەحمەدی کردبووەوە، کە ئێمە بە ڕێگاوەین بۆ لایان.

## سەید نووری نەقیب "گلەزەردەیی" بەرزنجی

دوای بە دیلگرتنی شێخ مەحموود لە شەڕی دەربەندی بازیان لە ساڵی ١٩١٩و هەڵهاتنی هەندێك لە سەرکردەکانی شۆڕش بۆ شاخ بۆ بەردەوامیدان بە شۆڕش، تا ئەو کاتەی شێخ مەحموود دەگەڕێتەوە و گرتنی هەندێکی تریان لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەریتانیاوە. دەست بەسەر حاڵ و ماڵیاندا گیرا و بە زیادکردنی ئاشکرا لە گۆڕەپانی سەرای سلێمانی فرۆشران. ڕۆژێکیان سەید نووری نەقیب بەوێدا تێدەپەڕێت و دەپرسێت: "ئەو ماڵ و کەرەستانە هی کێن؟ دەڵێن هی ماڵی ماجید مستەفایە"! بۆیە زۆر پێی ناڕەحەت دەبێت و دەچێتە لای مێجەر (سۆن)ی حاکمی سەربازی بەریتانی و پێی دەڵێت هەندێك پارەم لای ماجید مستەفایە، بۆیە تکات لێدەکەم ئەو ماڵ و کەرەستانەیم بدەرێ لە بەرامبەر ئەو قەرزەم کە لایەتی، ئەویش ڕازی دەبێت کەرەستە و کەلوپەلەکانی دەداتێ، سەید نووریش لای خۆی هەڵیان دەگرێت تا کاتێك شێخ مەحموود لە دیلی دەگەڕێتەوە و ماجید مستەفاش دێتەوە بۆ سلێمانی ئەوجا هەرچی ماڵەکەیەتی دەیداتەوە.

ئەمە نمونەیەك بوو لە مەردایەتی نیشتمانی ئەخلاقی بەرزی پیاوانی ئەو سەردەمە، خودا لە هەموویان خۆشبێت.

## بەشی دووەم

### وشەی پێشەکی:

دوای بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی یاداشتەکانم، کەسانێکی زۆر لە ناسیاو و دۆستە نزیك و دوورەکانم، داوا دەکەن بەشی دووەمی یاداشتەکانم بنووسمەوە بە هەمان گیانی نووسینەوەی بەرگی یەکەم، کە تیایدا وتوومە: هەوڵمداوە بەوپەڕی وردی و ئەمانەتەوە باسەکان بنووسمەوە بە ئەندازەی ئەوەندەی مێشکم یاریمەتیم دەدات. هەمان کات تەرکیزکردن و دوورکەوتنەوە لە ناوهێنانی ئەوانی تر بە گوێرەی توانا و چەندم توانیبێت، ئامانجی سەرەکی و باڵام ئەوە بوو ڕاستییەکان بۆ گەنجانمان تۆمار بکەم کە لە سەختترین و تەنگەژەترین ساتەوەختەکانی ژیانمدا زیاتر بڕوام پێیان هەبووە، هەمیشە لە ژیاندا پێم وابووە مرۆڤی دڵسۆز بۆ گەل و نیشتمانی دەبێت ڕاستگۆبێت لەگەڵ خۆی و خەڵکانی تریشدا، وەفادار بێت، بۆ هەرچی نزیك و دوورەکانە، باوەڕی بەوە هەبێت مرۆڤی بە هەڵوێست و بە مەبدەئە، دەبێت بوێر و خاکی و مەردبێت، بەهێزبێت لە بەرامبەر فریودەرەکانی دونیا، ناخی جیاواز نەبێت لە ڕووکەشی، ئەگەر وابێت خوای گەورە هەمیشە پشتیوانیەتی، من خۆم ئەمەم چەندین جار و بە درێژایی تەمەنم لە نێو گەرمەی ڕوداوەکاندا بە کردار بینیومە، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هیچیان هەڵنەهاتووم.

لە هەلی دەرکردنی بەشی دووەمی بیرەوەرییەکانم ڕێز و سوپاسی بێپایانم پێشکەش بە جگەرگۆشە ئازیزەکانم دەکەم، بە تایبەت شێرزاد و

ئیسماعیل و کچی زۆر خۆشەویستم کوێستانی خێزانی ئیسماعیل. بە شەو و ڕۆژ و لە سەختترین บارودۆخدا، خزمەتێکی بێوێنەیان کردم، خودا نموونەیان زۆر بکات لە پێناو نیشتمانی خۆشەویستدا.

فوئاد عارف

سلێمانی پێنجی کانوونی یەکەمی ساڵی ۲۰۰۸

## پێشەکی

یاداشتی کەسیی، بێگومان یەکێکە لە گرنگترین سەرچاوە مێژووییە ڕەسەنەکان، مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی یەکەم شارستانی مرۆڤایەتی، کۆنترین پادشایان و دەسەڵاتداران لە ڕێگەی تۆمارکردنی کارەکانییانەوە بە پیتی مێخی و هیرۆگلیفی، ویستوویانە ژیان و سەردەمی خۆیان بە زیندوویی بهێڵنەوە، لەگەڵ نەخش و نیگاری دەگمەن، کە بە وێنە کێشاویانە و ئامانجیان زیندووهێشتنەوەی یاداشت و تۆمارکردنی کارەکانیان بووە. ئا لێرەوە بە دیاریکراوی لە لاتینی کۆندا زاراوەی بیرەوەرییەکان سەریهەڵدا.

بە حوکمی پێگەی تایبەتییەوە، هەر لە دێر زەمانەوە باسی کورد و کوردستان لە یاداشتە گشتیی و تایبەتییەکاندا هاتووە. نموونەی زۆرمان لەو بارەیەوە هەیە، بۆ نموونە، تابلۆی دارا (داریوش) لە شاخی بێستونی نزیك شاری کرماشان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات. هەروەها ئەوەی فەیلەسوف و سەرکردەی سەربازی یۆنانی زەینەفون (گەسنیفۆن) کردی لە کتێبە بەناوبانگەکەی (ئەناباسیس) لە ساڵی ٤٠١ی پێش زایین، کە لە

ڕێگەی گەڕانەوەی دە هەزار سەربازی یۆنانی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ وڵاتەکەیان، هەرچییەکیان بینی نووسییان. لەوانە وەسفکردنی ئازایەتی و بەرەوڕوو وەستانەی بەهێزی کورد لە بەرامبەر سوپاکەیدا کە لە ئێران کشابوونەوە. وەك هەرچی دیاردەکانی تری ژیان، یاداشتی کەسیی و گشتیی، لە سەردەمی سەرمایەداریدا گەیشتە لوتکە. ئا لێرەشدا کورد و وڵاتەکەیان پێگەیەکی تایبەتیان هەبوو بە تایبەت لە نووسینی گەشتیارانی –الرحالة– بیانی، بەڵام کوردان خۆیان لەو بوارەدا لە کاروان بەجێمان و دیارە هۆکارەکانیشی دیارن. سەرکردەیەکی ناوداری وەك شێخ مەحموود، کاتی ئەوەی نەبووە یاداشت یان ڕۆژانەی خۆی بنوسێتەوە ئەگەر بە کورتیش بێت. ناچار چەند کەسێکی نزیکی وەك ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجە و ئەحمەد تەقی ئەو کارەیان ئەنجام دا، وێڕای یاداشتەکانی شێخ ڕەئوفی کوڕە گەورەی بە زمانی عەرەبی، لە قۆناغی کۆتایی تەمەنیدا بارزانی بیری لەوە کردەوە یاداشتەکانی بنووسێتەوە، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٤ هەردوو خوالێخۆشبووان دارا تۆفیق و سامی عەبدوڕەحمان باسی ئەوەیان لەگەڵ کردم هەستم بە نووسینەوەی گرنگترین یاداشتەکانی لە کاتێکدا دەستی بەتاڵە، بەڵام نسکۆی شۆڕشی کورد لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ وایکرد ئەو کارە گەورەیە ئەنجام نەدرێت کە بێگومان کەلێنێکی گەورەی پڕ دەکردەوە لە مێژووی سەرکردەیەکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا.

لە چوارچێوەی یاداشتی کەسایەتییە ناسراوە کوردەکاندا، ناوی لیوای خانەنشین و وەزیر و جێگری سەرۆك وەزیرانی پێشوو و هاوڕێ و

پاسەوانی مەلیك غازی، فوئاد عارف دێت بە شێوەیەکی تایبەت، چونکە ئەم پیاوە بۆ خۆی هاوسەردەمی گرنگترین ڕوداوەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بووە، لە هەموو قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی هاوچەرخی عێراقدا ژیاوە و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەشداری تیایاندا کردووە. ئەمەش وایکرد بەرگی یەکەمی یاداشتەکانی دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبێت لای خوێنەران، بە جۆرێك زیاد لە جارێك چاپکرایەوە، بەڵام نەخۆشکەوتنی خاوەنی ئەم پێشەکییە وایکرد بەشی دووەمی یاداشتەکانی ناوبراو تەواو نەبێت. بەڵگەی تر زۆرن لەسەر گرنگی یاداشتەکانی فوئاد عارف، لەوانە بوێری خاوەنەکەی و ڕاشکاویی و پەیوەندی زۆر و زەبەند و بیرتیژی. ساڵانێکی دوور و درێژ بە تایبەت لە دانیشتنە گەرم و گوڕەکاندا چەندین جار باسی ئەو یادەوەرییانەی گێڕاوەتەوە، کە بۆ خۆم هیچ جیاوازییەك لە نێوان گێڕانەوە و نووسینەکانیدا لە ڕووی کات و شوێنەوە نابینم. بۆیە زانیارییە جۆراوجۆرەکانی زیاتر لە یەك ڕووەوە بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ توێژەرەوان.

بۆ شاهیدی هێندە بەسە ئاماژە بدەم بە ڕاستییەکی تازە، سەبارەت بە نامەیەکی ماستەر کە بەڕێز "موحەممەد سەلمان مونەووەر ئەلتەمیمی" لە بەشی مێژووی کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی ئەلموستەنسەرییە ئامادەیکردووە، بە سەرپەرشتی دکتۆر لوتفی جەعفەر فەرەج، بە ناونیشانی "فوئاد عارف و ڕۆڵی سەربازیی و سیاسیی لە عێراق تا ساڵی ١٩٧٥". نامەکە ١٩٦ لاپەڕەیە و لەلایەن لیژنەی زانستی لە ١٤ ئەیلولی

٢٠٠٨ گفتوگۆی لەسەرکرا و بە پلەی نایاب وەرگیرا. نووسەری ئەم چەند دێرە گومانی لەوە نییە بەشی دووەمی یاداشتەکانی پیری بەرێز فوئاد عارف دەنگدانەوەیەکی باشی دەبێت و پێشوازییەکی گەرمی لێدەکرێت لەلایەن خوێندەوارانەوە و بۆشاییەکی گەورەی زانستی لە کتێبخانەی مێژوویی عێراق پڕ دەکاتەوە.

لە کۆتاییدا خاوەنی ئەم یاداشتە ڕێز و سوپاسی خۆی پێشکەش دەکات بۆ هەریەك لە لیوا خالید عەبدولحەبار ئەلخەیات (ئەبو وەلید)و بەرێز عەبدولکەریم جاسم ئەلعوبەیدی (ئەبو زەینب) کە لەو کاتەوەی لە ساڵی ١٩٧٥ لە کوردستانەوە گەڕایەوە بۆ بەغداد، هاوکاری و خزمەتێکی زۆریان لە هەموو بوارە جیاوازەکاندا پێشکەشکرد.

کەمال مەزهەر

بەغداد ٢٣ ئەیلول ٢٠٠٨

یەکەم جار بە هۆکاری لۆژیکی پەیوەست بە یادەوەریی و ئەمجا بە سرووشتی ئەو دەسەڵاتەی لە عێراقدا هەبوو لە کاتی بڵاوکردنەوەی بەشی یەکەمی بیرەوەرییەکانم، بە پێویستی دەزانم بە هەندێك بابەتدا بچمەوە کە لە بەشی یەکەمدا باسکراوە، یان لانی کەم وێنەکەی وەك خۆی بخەمەڕوو.

بەر لە هەموو شتێك بە ئەندازەی گەردێك ڕاوبۆچوونم ناگۆڕم بەرامبەر پیاوانی سەردەمی پاشایەتی، کە بە زۆری لای من کەسانی باشبوون و هەندێك جاریش خراپ، ئەوەی کار نەکات هەڵەش ناکات. ئەم دوو حاڵەتە بەسەر بنیاتنەری دەوڵەتی نوێی عێراق خوالێخۆشبوو شا فەیسەڵی یەکەمدا جێبەجێ دەبێت، تا دەگاتە مەلیك غازی و نزیکترین یاریدەدەرەکانیان و دیارترین کەسانی سەردەمیان، نمونەی نووری ئەلسەعید و جەعفەر ئەلعەسکەری و موحەممەد ڕەزا ئەلشەبیبی و بەکر سدقی و ساڵەح جەبر و ڕەشید عالی ئەلگەیلانی و هی تریش. لە ڕاستیدا دانانی کەسی گونجاو لە شوێنی گونجاو بنەمایەکی نەگۆڕ بوو لە سەردەمی پاشایەتیدا. کە بنەمایەکی عەقڵانی جێبەجێ دەکرد، خۆشبەختانە شا فەیسەڵی یەکەم بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات بەر لە زۆربەی وڵاتانی تری ناوچەکە چاوی بە سەربەخۆیی عێراق کەوت. هەمان کات مەلیك غازیش هەوڵێکی بێ پسانەوەی دا لە پێناو ئەوەی سوریا و لوبنان سەربەخۆیی سیاسیی خۆیان وەربگرن.

بۆچوونەکانی مەلیك غازی لە چوارچێوەی گرنگترین ئەو هۆکارانە بوون

کە لە دۆخێکی ناڕوون و تەمومژاویدا کۆتایی بە ژیانی هێنا. پەیوەندی تا ئەوپەڕی دۆستانەی نێوان مەلیك غازی و شازادە تەلال، یەکێك بوو لە هۆکارە بزوێنەرەکان.

## پەیوەندی نێوان مەلیك غازی و شازادە تەلال

لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانمدا بە درێژی باسی پەیوەندییەکانم لەگەڵ مەلیك غازی کردووە، بە حوکمی ساڵانی خوێندنمان لە کۆلێژی سەربازی و دوای ئەوە بوونی بە پادشا و ئەمجا هەڵبژاردنم وەك پاسەوانی تایبەتیی و ئەو متمانە ڕەهایەی بە منی هەبوو، هەروەها متمانەی شاژنە عالیەی خێزانی، وایکرد هەندێك ڕاستی بزانم کە بە دەگمەن نەبێت کەسانی تر نەیانتوانی بیزانن. لەم چوارچێوەیەدا ئاماژە بە ڕاستییەك دەکەم، لەبەر ئەوەی غازی پیاوێکی ڕاستگۆبوو، لە نیشتمانپەروەری و خۆشەویستی بۆ عێراق و عێراقییەکان و ئەمجا ڕقێکی شاراوەی بۆ بەرپرسانی بەریتانی هەبوو، هەوڵی زۆر درا بۆ ئەوەی ناوبانگی لەکەدار بکرێت، کە وای کرد بەشێکی زۆر لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانم بۆ ئەو لایەنە تایبەت بکەم. بە درێژایی ساڵانێکی دوور و درێژ لەو هەموو چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیی و تەلەفزیۆنییانەی لەگەڵم کراون، بە هەموو ئەمانەت و دڵسۆزییێکەوە هەمیشە بەرگریم لێکردووە، بە خستنەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە ڕاستییەکان کە پەیوەستن بەو بابەتەوە.

نایشارمەوە ئینگلیزەکان حەزیان دەکرد لەسەر ڕێگەی مەلیك فەیسەڵی یەکەمی باوکی بچێت بەڕێوە، بە تایبەت ئەوان دەیانتوانی وازبێنن لە

پێگە و دەسەڵاتیان لە عێراقدا، وەك چۆن وازیان لێهێنا بوو لە ڕۆژهەڵاتی ئوردن، لە دۆخێکی تێکچووی خراپی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بەهۆی چاوچنۆکی و پلانەکانی هیتلەرەوە کە هەردوو ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دوور و ناوەڕاستی گرتبوو، کە دوو ناوچەی گرنگبوون بە هەنگاوی خێرا جیهانی بەرەو جەنگی جیهانی دووەم دەبرد، لە هەمان سیاقدا کۆتاییەکی خێرایان دانا بۆ دەسەڵاتی شازادە تەلال، کە هەڵوێستێکی تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی هەڵوێستی مەلیك غازیی لە بەرامبەر ئینگلیزەکان گرتبووەبەر. مەلیك عەبدوڵلا بە بیانووی تێکچوونی عەقڵییەوە تەلالی کوڕی لە شازادەیی دوورخستەوە، لە کاتێکدا هەمووان باوەڕیان وابوو لە درۆیەك بەولاوە هیچی تر نەبوو.

بەڵام بە بڕوای من کارەکە لە بەرامبەر مەلیك غازیدا بەو ئاسانییە نەبوو، مامەڵەکردن لەگەڵیدا بە دوو قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕی، یەکەمیان لەگەڵ ئەو ساڵانەی ئەرشیباڵد مۆریس باڵوێزی بەریتانیا بوو لە عێراق و دووەم لەگەڵ ئەو ساڵانەی مۆریس پیتەرسۆن باڵوێزی بەریتانیا بوو لە عێراقدا.

ئارشیباڵد مۆریس، لەو کاتەوەی غازی لە لەندەن دەیخوێند باشترین پەیوەندی لەگەڵدا هەبوو، زۆر بە قووڵی لە سیفاتەکانی غازی تێگەیشتبوو، هەروەها بە قووڵی پاڵنەری هەڵوێستە سیاسییەکانی دەزانی لە بەرامبەر بەریتانیا بۆ عێراق بە تایبەتی و عەرەب بە گشتی. هەوڵی زۆری لەگەڵ غازی دا بەوەی قەناعەتی پێبهێنێت پێداچوونەوە بکات بە

تەواوی هەڵوێست و ڕەفتارەکانیدا بۆ مانەوەی لە ئاییندەدا، بە شێوەیەکی دۆستانە ئامۆژگاری دەکرد بەوەی گرنگی بدات بە کاروباری نێو ماڵی خۆی، واتە وڵاتەکەی بەر لە هەر شتێکی تر و واز لە داواکردنی کوەیت بهێنێت. پێم وایە ئەو نزیکییەی نێوان غازی و ئارشیباڵد مۆریس وای لە حکومەتی بەریتانیا کرد بیگوێزێتەوە بۆ چین و هێنانی باڵوێزێکی تازە بۆ بەغداد کە مۆریس پیتەرسۆن بوو، بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە لە نزیکەوە، نکوڵی لەوە ناکرێت سێرمۆریس پیتەرسۆن بە هەموو جۆرێك هەولی دا کار بکاتە سەر مەلیك غازی، بەڵام هەولەکانی بە با چوون، بە تایبەت لە بۆ ئەوە هاتبووە شوێنی ئارشیباڵد مۆریس، غازی هیچ حەزی لە چارەی نەبوو. لە هەمان ئەو ماوەیەدا شازادە عەبدوللا مامی مەلیك غازی زۆر سەردانی بەغدادی دەکرد کە ئەوەی لێدەخوێنرایەوە کار بکاتە سەر برازاکەی بەو جۆرەی لە بەرژەوەندیی دەبینێت، بەڵکو داوای لێدەکرد شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ شازادە تەلالی کوڕی بگۆڕێت، هەموو جارێك غازی لە مامی دووردەکەوتەوە و لە تەلالی کوڕی نزیك دەبووەوە. بە گوێرەی توانا هەوڵمدەدا هەمیشە مەلیك غازی لە هەڵەکردن دووربخەمەوە، باشم لە بیرە چۆن جارێکیان داوای لێکردم شازادە تەلالی لە عەممانەوە بە تەلەفۆن بۆ وەربگرم، تووڕەییەکی یەکجار زۆر لە دەموچاویدا دیار بوو، فەرمانەکەیم جێبەجێکرد و درەنگانێکی شەو پەیوەندیم کردە کۆشکی ڕەغدانەوە لە عەممان، بەڵام بەرپرسی بەدالەی کۆشك وەڵامی دامەوە و وتی: "شازادە تەلال لە کۆشکدا نییە".

لە ڕاستیدا وەڵامەکەیم زۆر بەلاوە سەیر بوو، بە تووڕەییەوە وتم: بەم

درەنگانی شەوە دەشێت شازادە بۆ کوێ بچێت؟ ئەوجا بە ڕاشکاوی وەڵامی دایەوە و وتی: "برام، ئاغای گەورەمان ناهێڵێت پەیوەندی بکرێت بە شازادە تەلالەوە". مەبەستی شا عەبدوڵلا بوو. دیارە مەلیك غازی ئاگاداری هەوڵەکانم بوو بۆ پەیداکردنی شازادە تەلال لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە، بۆیە بێئەندازە تووڕە بوو و وتی: "من نامەوێت لەگەڵ مامم قسە بکەم، بەڵکو دەمەوێت لەگەڵ تەلالی برام قسە بکەم"، پێدەچوو شا عەبدوڵلا گوێی لە هەرچی ئەو قسانە بووبێت کە مەلیك غازی کردنی، بۆیە ویستی قسەی لەگەڵ بکات، چونکە لە تەلەفۆنەکەوە گوێم لێبوو وتی: "ئەلو" بەڵام غازی بە تووڕەییەکی زۆرەوە تەلەفۆنەکەی بە ڕوودا داخست. گفتوگۆکە بەوە کۆتایی هات، ڕێك کاتژمێرێك دوای ئەوە کە بەرەبەیان بوو، مەلیك غازی داوای لێکردم پەیوەندی بە مەندوبی سامییەوە بکەم لە قودس و بە ناوی ئەوەوە قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵکو بە خۆی بێتە ناو مەسەلەکەوە و بتوانێت پەیوەندی لەگەڵ شازادە تەلالدا بکات، زۆر سەرم سوڕما لە داواکەی مەلیك غازی، چونکە داوایەکی لەو جۆرە هیچ مەعقولییەکی تێدا نەبوو لەو کاتەدا کە نوقم بووبووم لە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی دەریچەیەك بۆ ئەو تەنگەژەیە، ئامۆژگارییەکەی خوالێخۆشبوو فەریقی ڕوکن بەکر سدقیم بیرهاتەوە، کاتێك بە پاسەوانی مەلیك غازی هەڵبژێردرام، بانگی کردم و پێی وتم:

"بە وریاییەکی گەورەوە مامەڵە لەگەڵ هەموو ڕەفتار و فەرمان و قسەکانی مەلیکدا بکە، هەر کام لەوانە بە فەرمانی شاهانە دادەنرێن و دەبێت جێبەجێ بکرێن، بەڵام کاتێك هەست دەکەیت هەندێکجار لە ژێر

کاریگەری توورەبوونیدا داوای ئەنجامدانی کارێکت لێدەکات و دەزانیت بە زیان بۆی دەگەڕێتەوە، لەو حاڵەتەدا دەتوانیت هەوڵی ڕازی کردنی بدەیت و لە لایەکی ترەوە هەرچیت لە توانادایە بیکەیت بۆ ئەوەی نەکەوێتە تەنگەژەیەکەوە، دواتر لەوەی کردوویەتی پەشیمان بێتەوە".

لەبەر ئەو ڕۆشناییە، داوام لە بەرپرسی بەدالەی کۆشك کرد ئەگەر خاوەنشکۆ داوای پەیوەندیکردنی بە دەرەوە کرد، پێی بڵێ: "هێڵی دەرەوە پچڕاوە" بۆ هەمان مەبەست پەیوەندیم بە مستەر بیلی پشکنەری پۆستە و گەیاندنی گشتییەوە کرد کە پەیوەندیەکی خۆشی لەگەڵ مەلیك غازیدا هەبوو، هەمان داواکاریم لێکرد کە بە غازی ڕابگەیەنێت هێڵەکانی دەرەوەی عێراق پچڕاون.

هەرواش بوو، ئەوەی پێشبینیم کرد ڕووی دا، غازی بە ڕەحمەت بێت ڕۆژی دواتر لەو کارەی کردبووی پەشیمان بووەوە، کاتێك ڕاشکاوانە پێمگوت دوێنێ چۆن لەگەڵ داواکەیدا ڕەفتارم کردووە، زۆر سوپاسیکردم، بەڵام ئەو کارانەی زیاتر قەناعەتی بە بەرپرسانی ئینگلیز هێنا، بە هەر نرخێك بووە دەبێت غازی لەسەر عەرشی عێراق لاببەن، وەك ئەوەی لەگەڵ شازادە تەلالدا کردیان. بە تایبەت جیهان بە تەواوی نزیك بووبووەوە لە لێواری جەنگی جیهانی دووەم، بەهۆی چاوچنۆکییەکانی هیتلەر و هزری نازییەوە، ئەوە مۆسۆلینی و فاشیزمی ئیتاڵی با لەولاوە بوەستێت. دوورخستنەوەی غازی لە سەر عەرش هەروا کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیە بەرپرسانی بەریتانیا پەنایان بردە بەر هەموو جۆرەکانی

شێوازی لەکەدارکردن و ناشیرینکردنی ناوبانگی و دوورخستنەوەی جەماوەری عێراقی لێی. سەرەتا زۆربەی ئەوانەی یاریدەدەری بوون لە کۆشکدا گۆڕدران، لەوانە ژمارەیەك لە پاسەوانەکانی، تەنانەت خزمەتکارە تایبەتییەکانیشی، لە هەمان کات بەر لە تیرۆرکردنی دەستیاندایە پڕوپاگەندەگەلێك کە ڕاستەوخۆ ناوبانگیان دەزڕاند و تەنانەت ناویان لەگەڵ ئافرەتێکی بەدڕەوشتدا دەهێنا بە ناوی فەریحە. هەموو ئەوە بۆ ئەوەبوو قەناعەت بە گەلی عێراق بێنن، ئینگلیزەکان لەسەر حەقن و هەرکاتێك بیانەوێت لەناوی بەرن. لە ساڵی ١٩٣٩ مەلیك غازی بە ڕوداوێکی ئاشکرای هاتوچۆ کۆتایی بە ژیانی هێنرا. هەرچۆنێك بێت سەردەمی مەلیك غازی بە سەردەمێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا، پڕە لە وانە و ئەزموونی بەسوود، بەلای منەوە خوالێخۆشبوو مەلیك غازی بە کەسێکی دەگمەن دەمێنێتەوە تا هەتایە. نمونەی خاکیبوون و دڵسۆزی بوو، زیادەڕەوییم نەکردووە ئەگەر بڵێم نزیکترین کەس بووم لێیەوە، لە کاتێکدا زۆر بە باشی هەستی کوردبوونی دەزانیم.

## لاسەنگییەکانی پێکهێنانی وەزارەتی کاروباری باکوور

لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانمدا دەقی ئەو یاداشتەم بڵاوکردەوە کە بۆ سەرۆك کۆمار عەبدوڕەحمان موحەممەد عارف لە بەرواری ١٩ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٧ ناردبوومان، کە واژۆی من و بابا عەلی شێخ مەحموودی پێوە بوو، یاداشتەکە گوزارشتی دەکرد لە واقیعی ژمارەیەکی

زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد و ئەو کەسانەی لە بەغداد پێگەیەکیان هەبوو. ئەوانەی لە ماڵی ئێمەدا کۆدەبوونەوە و بە شێوەیەکی چڕوپڕ گفتوگۆیان لەسەر بابەتەکانی کرد، تا گەیشتە ئەوەی خوالێخۆشبوو مەسعود موحەممەد بە زمانە عەرەبییە جوانەکەی نووسییەوە.

یاداشتەکە لە سیازدە خاڵی جەوهەری پێکهاتبوو و چارەسەرێکی واقیعی و دادپەروەرانەی بۆ کێشەی کورد لە عێراقدا دەدۆزییەوە، بە جۆرێك کە یەکێتی نیشتمانیشی بەهێز دەکرد. بابەتی وەزارەتی کاروباری باکوور لە سەرووی هەموو خاڵەکانەوە بوو، یاداشتەکە بەناوی من و شێخ بابا عەلییەوە پێشکەشکرا، کە هەوڵی زۆری دا واز لە بیرۆکەی وەزارەتی ناوبراو بێنین، بۆچوونی بارزانی و حەبیب موحەممەد کەریمی نوێنەری و هەروەها من و بابا عەلی شێخ مەحموود و مەسعود موحەممەد، پێکهێنانی وەزارەتێکی تازە بوو بەناوی "وەزارەتی کاروباری باکوور". خوالێخۆشبوو بابا عەلی تا ئەوپەڕی دڵگەرم بوو لەسەر بابەتەکە، تا ڕادەیەك حەزیدەکرد خۆی وەزارەتەکە وەرگرێت. بڕیارم دا بیکەینە یاداشتێك و لە دوای مردنی لەناکاوی سەرۆکی پێشوو عەبدولسەلام موحەممەد عارف وەك باسمکرد. پێشکەشی حکومەتی بکەین، بەهەرحاڵ حکومەت ڕازیبوو یاداشتەکە بنێرێت بۆ خوالێخۆشبوو موسلیح نەقشبەندیی وەزیری داد، بۆ داڕشتنەوەی یاسایی بۆی، بەڵام جارێکی تر سەرلەنوێ ناونیشانەکە گۆڕدرا بۆ وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەی باکوور لەبری (وەزارەتی کاروباری باکوور). ئەمەش سەرسوڕمان و تووڕەبوونی لادروستکردم و پەیوەندیم بە موسلیح نەقشبەندییەوە کرد و ڕاشکاوانە

وتی:

"جەنابی سەرۆك كۆمار عەبدورەحمان عارف پێشنیاری كردووە ناونیشانی وەزارەتەكە لە كاروباری باكوورەوە بگۆڕم بۆ ئاوەدانكردنەوەی باكوور". كە بێئەندازە تووڕەی كردم، بابەتەكەم زۆر بە تووڕەبوونەوە لە كۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران باسكرد و وەك ناڕەزاییەك دەستلەكاركێشانەوەی خۆم پێشكەشكرد و هەرچی ئەو پەڕاوانەی پەیوەندی بە بابەتەكەوە هەبوو هەموویم دڕی و لە هۆڵی كۆبوونەوەكە هاتمە دەرەوە، بەڵام تاهیر یەحیا كە جێگری سەرۆك وەزیران و جێی متمانەی كورد بوو و پەیوەندییەكی دۆستانەی بەهێزم لەگەڵی هەبوو، دوای دواخستنی دانیشتنەكە بە دوامدا هات و قەناعەتی پێكردم بگەڕێمەوە، هەمان كات گلەیی زۆری لە خوالێخۆشبوو عەبدورەحمان موحەممەد عارف كرد لەسەر ئەو هەڵوێستەی. دوای دە خولەك كە كۆبوونەوە دەستپێكردەوە، من سووربووم لەسەر دەستلەكاركێشانەوە، لەگەڵمدا مامۆستا ئیحسان شێرزاد كە وەزیری شارەوانییەكان بوو دەستیلەكاركێشایەوە.

دوای ماوەیەكی كەم كابینەیەكی تازە بە سەرۆكایەتی خوالێخۆشبوو تاهیر یەحیا پێكهێنرا، تیایدا فەتاح سەعید شاڵی لە شوێنی ئیحسان شێرزاد بوو بە وەزیری شارەوانییەكان. كاتێك چاوم بە بارزانی كەوت زۆر گلەیی كرد لەسەر ئەو هەڵوێستە توندەم، ئەڵبەت لەبەر گیانی خۆم، كاتێك شۆڕشی حەڤدەی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨ ڕووی دا، سەرلەنوێ

بابەتەکە هێنرایەوە بەر باس، لە بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ پێکهێنانی وەزارەتێکی تازە بەناوی (وەزارەتی کاروباری باکوور) ڕاگەیەنرا، کە خوالێخۆشبوو سامی عەبدوڕەحمان کرایە وەزیری.

## نهێنی کوشتنی ناسر ئەلحانی

کاتێك کودەتای ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ ڕووی دا، من لە لەندەن بووم، دوای دوو ڕۆژ بیستم سەرۆکی پێشوو عەبدوڕەحمان موحەممەد عارف گەیشتۆتە لەندەن و میوانی کازم خەڵەف باڵوێزی عێراقە لە بەریتانیا. بڕیارم دا سەردانی بکەم، ئیحسان شێرزادیش کە ئەویش لە لەندەن بوو لەگەڵم هات، لە دانیشتنی ئەو ڕۆژەدا ئەوەی باسکرد وتی: "خودای گەورە خۆی ڕزگاری کردم"، بە شێوەزاری بەغدادی وتی: "بەخوا قوربانیی دەوێت".

دواتر زانیمان حەردان ئەلتکریتی کە پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ عەبدوڕەحمان عارفدا هەبوو، بردبوویە ماڵەکەی خۆی و پاشان بە فڕۆکەیەکی تایبەت ناردبووی بۆ لەندەن. دوای ئەوە چەند ڕۆژێکی کەم لە لەندەندا مامەوە و دوای ئەوە چووم بۆ پراگی پایتەختی چیکۆسلۆڤاکیا. دە ڕۆژیش لەوێ مامەوە، دوای ئەوە چووم بۆ هەنگاریا (مەجەر)، خوالێخۆشبوو خەسرەو ڕەشید جەودەتی خزمم سکرتێری دووەم بوو لە باڵوێزخانەی عێراق لە بودابست، لە ڕێگادا هەواڵیان دامێ کودەتایەکی تازە لە بەغداد ڕوویداوە. کە بەڕاستی حەپەسام، هەرچۆنێك بێت گەیشتینە وێستگەی شەمەندەفەری بۆدابستی پایتەختی هەنگاریا،

خەسرەو پێشوازی لێکردم و باڵوێزی عێراق لە هەنگاریا کە ناویم لە بیر نەماوە، لەگەڵی هاتبوو.

ماوەیەك لە بۆدابست مامەوە و پاشان بە ئۆتۆمبێلەکەی باڵوێزی عێراق هاتمەوە بۆ پراگ و لەوێوە بە فڕۆکە گەڕامەوە بۆ بەیروت، چونکە دایکی فەرهاد چاوەڕێی دەکردم. لە بەیروت لە باڵەخانەیەکدا مامەوە، بەڵام هەر کە کەمال جونبەلات زانیی لە بەیروتم سەردانی کردم و چەند جارێکی تریش دوای ئەوە، پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و دۆستانەم لەگەڵی هەبوو، خوالێخۆشبوو ناسر ئەلحانیش لە شوێنی مانەوەم سەردانی کردم. ئەلحانی تا بڵێی کەسێکی ڕووخۆش و نەرمونیان بوو لە پەیوەندییەکانیدا. یەکێك بوو لە زیرەکترین کەسایەتییە عێراقییەکان لەو کاتەدا. بڕیار درا بگەڕێنرێتەوە بۆ بەغداد و بکرێتە وەزیری دەرەوە لە حکومەتی تازەدا، بەر لەوەی بەیروت جێبهێڵێت ئاهەنگێکی ماڵئاوایی ڕێکخست، داوایکرد بە ناوی ئەوەوە خوالێخۆشبوو کەمال جونبەلاتیش بانگهێشت بکەم، جونبەلات وتی حەزم لە ئامادەبوونی ئەم جۆرە یادانە نییە، بەڵام لەبەر خاتری تۆ دێم.

لەو ئاهەنگەدا ئەلحانی ڕێزێکی تایبەتی لێگرتین، تەنانەت لە بیرمە داوام لێکرد لەگەڵ کەلوپەلەکانی خۆیدا هەندێك دیاری منیش کە لە دەرەوە کڕیبووم بباتەوە، زۆر بە دڵگەورەییەوە وتی بەسەرچاوان، کە چاوەڕێی ئەو دڵگەرمییەی نەبووم.

دوای ماوەیەکی کورت لە ڕۆیشتنەوە بۆ بەغداد، بیستمان لە ماڵەکەی

خۆیدا کوژراوە. وا بڵاوبووەوە هۆی کوژرانەکەی لەبەر ئەوە بووە نهێنی پەیوەندی سەرکردە تازەکان بە ئەمریکاوە بەر لە کودەتاکەیان بشاردرێتەوە، ویستیان بە کوشتنی هیچ بەڵگەیەك نەمێنێت ئاماژە بەو پەیوەندییە بکات، چونکە ئەلحانی بەعسی نەبوو و زانیاری زۆری نهێنی کودەتا تازەکەی لابوو، خراپ نییە ئاماژە بدەم بەوەی خێزانی خوالێخۆشبوو ناسر ئەلحانی هاوڵاتییەکی ئینگلیزی بوو، پەیوەندییەکی زۆر خۆشی لەگەڵ دایکی فەرهاددا هەبوو وماڵیان نزیکی ماڵی ئێمە بوو لە شەقامی ئەلمەغریب لە بەغداد.

## گەڕانەوە بۆ بابەتی پەیوەندیم لەگەڵ عەبدوڕەحمان عارف

لە ڕاستیدا بە درێژایی سەردەمەکەی، پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆك عەبدوڕەحمان عارف بە باشی مایەوە، هەرچەندە هەڵوێستی لە بابەتی وەزارەتی کاروباری باکوور گۆڕانی بەسەردا نەهات، نکوڵی ناکەم لەوەی چاکەکە لای ئەوەوە بوو. لەو ڕۆژەوەی تووڕە بووم هەرچی پەڕاوەکانی پەیوەندیدار بە بابەتی دامەزراندنی وەزارەتی کاروباری باکوورم دڕی، خۆشەویستی بۆ دەربڕیم و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ ژوورە تایبەتەکەی و لەوێدا زۆر بە نەرمونیانی موجامەلەی کردم و باشم لە بیرە بە سوعبەتەوە وتی:

"فوئادی برام چۆن دڵت دێت جێمبهێڵی؟". پێمگوت: نامەوێت بەجێتبهێڵم، بەڵکو دەمەوێت دڵسۆزانە یارمەتیت بدەم، لە پێناو خۆت و عێراق و برایەتی کورد و عەرەبدا.

کاتێك پێداگری کرد لە سەرۆکایەتیدا لەگەڵی بمێنمەوە، بە ڕاست و ڕوونی پێمگوت: ئامادەم تا ئەوپەڕی لەگەڵت بمێنمەوە، بەو مەرجەی ڕازی بیت لەسەر ئەو پێشنیارانەی بۆتی دەکەم، لە پێناو عێراق و پەیوەندییەکانی نێوان کورد و عەرەب.

کە پرسیاری پێشنیارەکانی کرد، پێمگوت: باشترین شتێك کە بیکەیت هەڵبژاردنێکی گشتییە بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار و دەتوانرێت لە سێ مانگدا ئەنجام بدرێت، من بۆ خۆم ئامادەم ئەو ئەرکە بخەمە سەر شانی خۆم و بە باشترین شێوە ئەنجامی بدەم، هیچ گومانم نییە لەوەی ئەگەر کارێکی وا بکەیت خۆشەویستی و متمانەی گەلی عێراق بەدەست دەهێنیت و بۆ پۆستی سەرۆك کۆماریش هەڵدەبژێردرێیتەوە".

خوالێخۆشبوو بزەیەك گرتی کە بۆنی گاڵتەی لێدەهات، بە جۆرێك لە فیز و لەخۆباییبوونەوە وتی: "عەقڵ دەیبڕێت ئێمە شۆڕش بکەین و گیانی خۆمان و ماڵ و منداڵمان بخەینە مەترسییەوە و پاشان بیدەینە دەستی ئەفەندییەکانەوە؟" ئیتر خۆم پێڕانەگیرا و پێمگوت: سوێند بە خوا بۆ ئەو قسەیەی کردت، بەزەییم پێتدا دێتەوە.

زۆر سەری سوڕما لە وەڵامەکەم، بەڵام نەمهێشت قسە بکات و وتم تا گۆمەکە قووڵ بێت مەلەی خۆشترە، ئەمجا باسی چارەنووسی زۆربەی فەرمانڕەوایانی عێراقم بۆ کرد هەر لە سەردەمی خەلیفەکانەوە تا دەگاتە ئەم سەردەمە کە چی بەسەر بنەماڵەی پاشایەتیدا هات هەر لە مەلیك فەیسەڵی یەکەمەوە کە دەوترێت بە ژەهر کوژراوە و مەلیك غازی کە لە

ڕوداوێكی تەمومژاویدا كوژرا و چۆن بە چاوی خۆمان چارەنووسی مەلیك فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاهی خاڵیمان بینی، هەروەها چارەنووسی عەبدولكەریم قاسم و عەبدولسەلامی برایم بیرهێنایەوە.

پێدەچێت قسەكەم كاری تێكردبێت، ڕێككەوتین دوای دوو یان سێ ڕۆژ بگەڕێمەوە بۆ لای، تا وەڵامی كۆتایی لێوەربگرمەوە، تا ئەگەر ڕەزامەندی دەربڕی دەست بە كارەكانمان بكەین و دەستلەكاركێشانەوەكەم بكێشمەوە.

لە كاتی دیاریكراودا چوومەوە بۆ لای، بەڵام دەبینم سوورە لەسەر بۆچوونی جارانی، جارێكی تر پێمگوتەوە: بەخوا بەزەییم پێتدا دێتەوە و ئەم چیرۆكەم بۆ گێڕایەوە: پیاوێكی دەوڵەمەند هەبوو، سامانێكی زۆری بۆ كوڕە تاقانەكەی بەجێهێشت لەگەڵ سندوقێكی پڕ لە زێڕ و زیوی گرانبەها، وەسیەتی بۆ كوڕەكەی كرد بیداتە گێلترین پیاوی دونیا، كە ڕەفتارێك بكات هیچ عەقڵێك قبووڵی نەكات، كوڕە دوای مردنی باوكی وەسیەتی باوكی بەجێهێنا و بە وڵاتدا گەڕا كەسێكی وا بدۆزێتەوە، تا ڕۆژێك ڕێی كەوتە شارێك دەبینێت لە ئاپۆڕا و كۆبوونەوەیەكی جەماوەری گەورەدا خەریكن پیاوێك دەكوژن و لەولاشەوە بە هەمان جۆر خەریكن كەسێك گوڵباران دەكەن و تاجی لەسەر دەنێن، هەر كە پرسیاری كرد وتیان دەستووری وڵاتی ئێمە وایە، ئەوەی ئەمڕۆ دەبێتە پادشای وڵات، ساڵێكیتر ئەمڕۆ دەهێنرێتە خوارەوە و دەكوژرێت.

بۆیە كوڕەكە چوو بۆ لای پادشای تازە و پێیگوت: "باوكم ئەم دیاریەی بۆت ناردووە". پادشا وتی: "من باوكت ناناسم". كوڕەكە پێیگوت:

"باوکیشم تۆ ناناسێت، بەڵام وەسیەتی پێکردووم ئەم دیارییە بدەمە سەیرترین و گێلترین مرۆڤی سەرزەوی کە لە ژیانمدا بینیومە، لێتی ناشارمەوە ئەو کەسە تۆیت".

پێم وایە خوالێخۆشبوو عەبدوڕەحمان عارف لە ناخەوە گاڵتەی بەو قسە و مەرجەکانم هات و بەو جۆرە کاری دەستلەکارکێشانەوەم کۆتایی هات و هیچ پەیوەندیم لەگەڵیدا نەما تا کاتی ڕووخانی لە دەسەڵات و هاتنی بۆ لەندەن، کە لەگەڵ ئیحسان شێرزاد سەردانیمان کرد.

### پەیوەندی دۆستانەی بارزانی لەگەڵ کەمال جونبولات

لە بەشی یەکەمی یاداشتەکانم و لە چەند بۆنەیەکی تردا باسم لە پەیوەندی دۆستانەی نێوان بارزانی و کەمال جونبولات کردووە، لەم بەشەشدا باسێکی دەکەمەوە، لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو بارزانی هەواڵی نارد بۆ خوالێخۆشبوو کەمال جونبولات زۆر حەز دەکات چاوی پێیبکەوێت و تەنانەت بۆ پێشوازیشی ئەگەر بتوانێت دێتە بەغداد، بانگهێشتی کرد بۆ چۆمان و بە هیلیکۆپتەرێکی تایبەت برایە ئەوێ و لەلایەن بارزانی و هەردوو کوڕەکەی ئیدریس و مەسعود و سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. دەبێت ئاماژەی پێبکەم خوالێخۆشبوو کەمال جونبولات ڕووەکی بوو، بەڵام کە بارزانی داوای لێکرد ئەو پارچە گۆشتە بخوات و بە خۆی پێشکەشی کرد ڕەتی نەکردەوە، جونبولات زۆر بە چاوپێکەوتنی لەگەڵ بارزانیدا ئاسوودە بوو.

## پەیوەندیم لەگەڵ خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا سەلوم ئەلسامەڕائی

دوای دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ لە گەڕانەوەم بۆ بەغداد، سەردانی ئەو ناسیاوانەم کرد لە ڕژێمی تازەدا وەك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و حەردان ئەلتکریتی و ساڵەح مەهدی عەماش بۆ پیرۆزبایی لێکردنیان، سوودم لەو سەردانانە بینی تا جەخت بکەمەوە لە گرنگی جێبەجێکردنی دۆزی کورد بە شێوەیەکی دادپەروەرانە، هەروەها هەمان ڕۆژ چاوم کەوت بە ئەندامی قیادەی قوتری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دکتۆر عەبدوڵڵا سەلوم ئەلسامەڕائی کە داوای لێکردم بە تایبەت لە کۆشکدا سەردانی بکەم، هەرچەندە بابا عەلی شێخ مەحموود ئاگاداری کردمەوە کە نەڕۆم، بەڵام من هەر سەردانیم کرد.

عەبدوڵڵا سەلوم لە کۆشکدا زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم و سەعدون غەیدانیشی لەگەڵ بوو. لەو دانیشتنەدا زۆر گلەیی و گازندەم لە بەعسییەکان کرد و پێمگوتن بیستوومە ئێوە ڕەخنە قبووڵ ناکەن و هەر کەسێك ڕەخنەتان لێبگرێت ڕەوانەی زیندانی دەکەن، ئەگەر وایە، ئەوا هیچ قسەیەك ناکەم و بێدەنگ دەبم.

خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا سەلوم وەڵامی دامەوە و سەعدون غەیدانیش پشتگیری کرد، کە زۆر لۆمەم کرد لەوەی دەستلەکارناکێشێتەوە لە کاتێکدا دەبینێت ڕژێمی تازە سووکایەتی بە تاهیر یەحیای هاوڕێی دەکات. هیچ وەڵامی نەدامەوە و سەری داخست. ئەوجا عەبدوڵڵا سەلوم سەری ماچکردم و وتی: "برای ئازیزم باوکی فەرهاد، تۆ من ناناسیت،

بەڵام من لە نزیکەوە تۆ دەناسم، تۆ لە ساڵی ١٩٥٩ گیانی منت ڕزگار کرد، کاتێك لە کەتیبەی دەبابات گیرابووم و مامم تەلەفۆنی بۆ کردیت و باسی منی بۆ کردی و منت لە سێدارە ڕزگارکرد، دوای ئەوە دوورخرامەوە بۆ هەولێر، لەوێش تووشی دەردەسەریی هاتم بە تایبەت لەلایەن شیوعییەکانەوە. بۆیە مامم جارێکی تر پەیوەندی پێوە کردیتەوە لای حاکمی سەربازی ئەو کاتە کە ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی بوو بۆ ئەوەی بمگەڕێنێتەوە بۆ بەغداد، من زۆر باش دەزانم تۆ ڕاستگۆیت لە هەرچی دەیلێیت و دەتەوێت، من بۆ خۆم ئامادەم لەسەر پەڕەی سپی واژۆت بۆ بکەم".

سوودم لەو کەشە دۆستانە و ئارامە وەرگرت و دەستمکرد بە باسکردنی ڕەوایەتی دۆزی کورد و پێویستی چارەسەرکردنی لە پێناو عێراق و پاراستنی پەیوەندی مێژوویی نێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەب و مافەکانی گەلی کورد بریتی نییە لە دامەزراندنی کۆمەڵێك فەرمانبەر، ئەوجا عەبدوڵڵا سەلوم پرسیاری کرد ئەو مافانە چین؟ پێمگوت: دەتوانیت پەیوەندی بە سەرکردایەتی کوردەوە بکەن، کە لە گۆڕەپانەکەدان بۆ ئەوەی داواکارییەکان بزانن.

وەڵامی دایەوە: "دوو گرووپی کوردی لەسەر گۆڕەپانەکەن، جەماعەتی مستەفا بارزانی و جەماعەتی جەلال تاڵەبانی.." بەر لەوەی قسەکانی تەواو بکات، پێمگوت: هیوادارم کار نەکەن بۆ ئەوەی ناکۆکی بخەنە نێوانیان، دواجار هەردوو گرووپەکە لە کۆتاییدا لە یەك خاڵدا یەکتر

دەگرنەوە، کە ئەویش داواکارییە ڕەواکانی میللەتی کوردە.

بە کردار حکومەت بە قسەکانی منیان نەکرد، بەرپرسان وەك هەمیشە ناکۆکییان خستە نێوان هەردوو باڵەکەوە و بە هەموو جۆرێك فیتنە و دووبەرەکییان لە نێواندا دروستدەکرد. دوای چەند ڕۆژێك لەوە باڵی مام جەلال لە جەنگێکدا لە قەرەداغ سەرکەوتبوون، لەو ڕۆژانەدا لە ئاهەنگی باڵوێزخانەی سۆڤێت عەبدوڵلا سەلومم بینی زۆر دڵخۆش بوو بە ئەنجامی شەڕەکە، بۆیە ڕەخنەم لێگرت کە حکومەت بەو بارەوە هەڵەیە.

لەو ڕۆژانە بەردەوام سەردانی ماجید مستەفای خاڵمم دەکرد، شەوێکیان دەوروبەری کاتژمێر ١١ی شەو گەڕامەوە، دەبینم ماڵەوەمان زۆر شپرزە و شڵەژاون، بەهۆی گیرانی فەرهادی کوڕم و زیندانیکردنی لە زیندانی سەرای بەغداد، پەیوەندیم بە زیندانەوە کرد، بەرپرسی زیندان وەلامی دامەوە، هیچ ئاگادار نیە لە هۆکاری گیرانی فەرهادی کوڕم، کە ئەو کاتە ملازمی یەکەم بوو لە بەڕێوەبەرایەتی سەفەر و ڕەگەزنامەی بەغداد، بەلام بەرپرسەکە پێیگوتم: "بەپێی ئەو فەرمانەی دەرکراوە دەبێت فەرهادی کوڕت سبەینێ ڕەوانەی بەسرە بکەین". داوام لێکرد ناردنەکە دوابخات، ئەویش پەیمانی دامێ. بەیانی زوو چووم بۆ لای عەبدوڵلا سەلوم ئەلسامەڕائی لە دیوانی وەزارەتی ڕاگەیاندن - ڕۆشنبیری- کاتێك بابەتەکەی زانی زۆر ناڕەحەت بوو، یەکسەر پەیوەندی کرد بە لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە و دەرکەوت هۆکارەکەی ڕفاندنی بەرپرسێکی ئاسایشە لەلایەن پێشمەرگەوە و ساڵەح مەعدی عەماشی

وەزیری ناوخۆ فەرمانی گرتنی فەرهادی کوڕمی دەرکردووە، تا ببێتە هۆکارێك بۆ ئازادکردنی بەرپرسەکەی ئاسایش. زۆر گاڵتەم بەو ڕێکارە ناشیرینە هات لە بەرامبەر فەرهاد و عەبدوڵڵا سەلوم هەر لەوێدا پەیوەندی کرد بە سەرۆك کۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرەوە و فەرهادیان ئازاد کرد و زۆریش داوای لێبوردنیان لێکردم.

## یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەدام حسەین

بارودۆخ وایکرد پەیوەندییەکی نزیکم لەگەڵ سەدام حسەیندا بۆ دروست ببێت، کە بە درێژایی ساڵانێکی درێژ چەندین هەڵکشان و داکشانی زۆری بەخۆوە بینی. بیرم نایەت ناوی سەدامم بەر لە ساڵی ١٩٦٨ بیستبێت، بەڵام لە دوورەوە خەیروڵڵا تلفاحی خاڵیم دەناسی. ڕەنگە دوای هەوڵی تیرۆرکردنی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٩ لە مەجلیسەکانمدا ناوی سەدام برابێت.

دوای گەڕانەوەم لە دەرەوە بە درێژایی چەند مانگێك، پەیوەندی و هاتوچۆکانم تەنها بۆ لای کەسانی سەربازی بوو لە سەرکردە تازەکان، دکتۆر عەبدوڵڵا سەلوم ئەلسامەڕائی تەنها کەسی مەدەنی بوو پەیوەندیم لەگەڵی خۆشبوو، وەك ئەوەی باسمکرد دەستپێکردنەکانی سەردەمی نوێ ئەنجامێکی وای لێنەکەوتەوە و هەرزوو بەر لە هاتنی ساڵی ١٩٧٠ بۆچوونەکانیان لە بەرامبەر دۆزی کورددا گۆڕی.

لەو کاتەدا سەرۆك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بانگهێشتی کردم بۆ کۆشکی کۆماری تا چاوی پێم بکەوێت، ئەو ڕۆژە باسگەلێکی هێنایە پێشەوە کە بۆنی ئەو گۆڕانکارییەی لێدەهات، بە کورتی ئاماژەی دا بەوەی دۆخەکە وادەخوازێت لەگەڵ بارزانی لێککەیشتن بکەین و گەنجان دەیانەوێت لەو بارەوە قسەت لەگەڵ بکەن و وا چاوەڕێتن لەو ژوورەی دەکەوێتە پشتی ژوورەکەی منەوە. مەبەستی لە گەنجان ئەندامانی قیادەی قوتری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوو.

کە چوومە ژوورەکەوە حەوت یان هەشت گەنج دانیشتبوون، هیچکامیانم نەدەناسی و دکتۆر عەبدوڵڵا سەلوم سامەڕائیشیان لەگەڵ نەبوو. لەوانەی ئەو ڕۆژە لەوێ بوون بریتیبوون لە عەبدولکەریم شێخلی و مورتەزا سەعید عەبدولباقی ئەلحەدیسی و سەمیر عەزیز ئەلنەجم، لە نێویاندا کوڕێکی باڵابەرزی گەنم ڕەنگی (ڕەشتاڵەی) لێبوو دواتر زانیم سەدام حسەینە.

سەرەتا جگە لە سەدام حسەین هەموویان زۆر بە تووڕەیی و بە زمانی هەڕەشە و فیزێکەوە قسەیان دەکرد. هیچکامیان ئامازەیان نەدا بەو هۆکارە ڕاستەقینانەی بوونەتە هۆی ئاڵۆزبوونی کێشەی کورد کە بە قەناعەت و ئەزموونی درێژی خۆم هەر لە منداڵییەوە لەگەڵیدا گەورە بووبووم، هەوڵم دا بۆیانی باس بکەم، بەڵام دەبینم هیچ لە کەللەڕەقی و ملهوڕی خۆیان نایەنە خوارەوە، بۆیە ڕاشکاوانە پێمگوتن: ئێوە گەنجن و ئەزموونتان نییە، هەمووتان یان خوێندکاری زانکۆن یان مامۆستان، دۆخی ئێوە، کوڕی ئەو سوارچاکە چاونەترسەم دێنێتەوە یاد ویستی کوڕە گەورەکەی دوای مردنی لاسایی بکاتەوە، بۆیە بە فیزێکەوە سواری باشترین ئەسپی کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەسپسواری نەدەزانی بە بەرچاوی هەموانەوە لە ئەسپەکەی بەربووەوە، ئەسپی باش بۆ خۆی تەنیا هیچ شتێك ناگەیەنێت، ئەگەر خاوەنەکەی ئەزموون و شارەزاییەکی نەبێت کە بیکاتە سوارچاکێکی بە توانا و سەرکەوتوو.

هەموویان قسەکەمیان پێناخۆش بوو، تەنها کوڕە ڕەشتاڵەکە نەبێت

کە قسەکەمی بە دڵ بوو، عەبدولکەریم شێخلی کە وەزیری دەرەوە بوو، دەبوو لە هەموویان دیبلۆماسیتر بووایە، زۆر توورە بوو، لە شوێنی خۆی بە توورەییەوە هەستا و وتی:"ئەمە سووکایەتییە و ئێمە قبووڵی ناکەین".

ئەوجا گەنجە ڕەشتاڵەکە بۆ یەکەمجار هاتە ناوەوە و سەری ماچکردم و بە زمانێکی هێمن دەستی بە قسان کرد، زۆر جوان قسەی کرد و بە متمانەیەکی زۆرەوە پشتگیری تەواوی قسەکانی کردم و زۆر بە ئەدەبەوە داوای لێبووردنی کرد بەوەی میوانداریمیان کردووە لە کۆشکدا، لە کاتێکدا دەبوو ئەوان لە ماڵی خۆمدا سەردانیان بکردمایە. ئەو کات هەموویان بێدەنگ بوون و بە گەرمی بەڕێیان کردم.

ئەم چاوپێکەوتنە سەرەتایەکی تازە بوو بۆ پەیوەندیم لەگەڵ ژمارەیەك لەو سەرکردە تازانەی پێم وابێت مەعدەن و ڕاشکاویی منیان زانی، لەگەڵ ڕادەی دڵسۆزیم بۆ دۆزی نەتەوەکەم، کە هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕووم لێوەرنەچەرخاندووە. دوای ماوەیەکی کورت، ئەحمەد حەسەن ئەلەبەکر و سەدام حسەین داوایان کردم بچمە کۆشك، گفتوگۆیەکی دوور و درێژ لە نێوانماندا کرا، تیایدا جەختیان کردەوە قەناعەتی تەواویان هەیە کە پێویستە گفتوگۆ لەگەڵ بارزانیدا بکەن. کاتێك پرسیارم لێکردن بڕیاری تازەتان چییە؟ وتیان: "حکومەت ئامادەیە لە هەموو شتێکدا ئۆتۆنۆمی بداتە کورد، جگە لە سوپا و وەزارەتی دەرەوە". لێمپرسین: مەرج و پێشنیارەکانی حکومەت چییە بۆ لایەنی کوردی". وتیان: "تەنیا

مەرجمان ئەوەیە بارزانی هەموو پەیوەندییەکانی دەرەوەی بپچڕێنێت بە تایبەت لەگەڵ ئێراندا". وتیان: "ئێمە جەماعەتی جەلال تاڵەبانیمان تووشکردووە، نازانین هەڵوێستی بارزانی لە بەرامبەریان چۆن دەبێت".

وتم: ئەمەیان کێشەیەك نییە، جێبەجێبوونی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کورد خەونی هەموو لایەنە دڵسۆزەکانی کوردە، باڵی مام جەلالیش بۆ هەمان ئامانج خەبات دەکەن. من باش دەزانم بارزانی خۆشەویستییەکی تایبەتی هەیە بۆ جەلال تاڵەبانی و هەمیشە مام جەلال دەستەڕاستی بووە لە کارکردن لە پێناو دۆزی کورددا.

دوای ئەوەی قەناعەتیان هێنا بە پێشنیارەکانم و بەوەی پێمگوتن، پێشنیاری ئەوەیان کرد بە خۆم ئەو بڕیارە ببەمە لای بارزانی، بەڵام داواکەیانم وەرنەگرت، کە زۆر بەلایانەوە جێی سەرسوڕمان بوو، کە پرسیاریان کرد بۆچی؟ وتم: چۆن ڕێگە بە خۆم دەدەم لە بابەتێکی وادا بە ناوی ئێوەوە قسە بکەم، کە هیچ سیفەتێکی فەرمیم نییە، جگە لەوەی کوردم و عێراقیم، بەڵام لاریم نییە ئەگەر بەرپرسێکی باڵای دەوڵەت لەگەڵمدا بێت و ئەو قسانەی لە نێوانماندا کراون وەك خۆی بباتە لای سەرکردایەتی کورد، منیش دەبمە شاهید بەسەر هەر چییەکەوە دەیڵێت.

ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و سەدام حسەین، پێشنیارەکەمیان قبووڵکرد و بڕیاریان دا سەمیر عەزیز ئەلنەجمی ئەندامی قیادەی قوتری ڕاسپێرن بۆ گەیاندنی بڕیاری سەرکردایەتی بە بارزانی. پێکەوە بە ئۆتۆمبێل هاتینە کەرکوك و لەوێوە بە فڕۆکە بۆ جوندیان و لە جوندیانیشەوە بۆ بارەگای

بارزانی لە دیلمان. بارزانی بە خۆی پێشوازییەکی گەرمی لێکردین و بۆچوونەکانی هەردوولا زۆر ڕاشکاوانە خرانەڕوو، لە گەڕانەوەماندا خوالێخۆشبوو دارا تۆفیق ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کە زۆر جێی متمانەی بارزانی بوو لەگەڵماندا هاتە بەغداد.

پەیوەندییە داخراوەکانی نێوان هەردوولا تا ماوەیەك بەو جۆرە بەردەوام بوو، چەندم لە تواناد‌ا بووایە هەوڵمدەدا بەبێ هیچ زیادەڕەوییەك بۆچوونی نێوان هەردوولا لە یەکتر نزیك بکەمەوە. دواى ئەوە حکومەت بە سەرۆکایەتی حەمادی شەهاب ، وەزیری بەرگری شاندێکی فەرمی ناردە کوردستان کە پێکهاتبوون لە ژمارەیەك لە ئەندامانی قیادەی قوتری، بۆ گفتوگۆ کردن دوو لیژنە پێکهێنرا، یەکێکیان حکومی و ئەویتریان کوردی، دواى ئەوە کاروبارەکان بە تەواوی ئامادەبوون، بڕیار درا شاندێکی گەورە بە سەرۆکایەتی سەدام حسەین، بچن چاویان بە خودی بارزانی بکەوێت بۆ ئیمزاکردنی کۆتایی لەسەر ڕێککەوتنەکە. بیرمە شاندەکە پێکهاتبوو زیاتر لە سی کەس، بە فڕۆکە لە هەولێرەوە هاتنە جوندیان، ڕۆژی ٩ یان ١٠ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ بوو کاتێك شاندەکە بە ئۆتۆمبێل لە جوندیانەوە دەچوون بۆ چۆمان بۆ بینینی بارزانی، سەدام حسەین داوای لێکردم لەگەڵ ئەودا بە ئۆتۆمبێلەکەی ئەو سواربم کە خۆی لێی دەخوڕی و کاك مەسعودیش لەگەڵمان لە کورسی دواوە دانیشتبوو، سەدام زۆر ڕوون و ڕاشکاو بوو لە قسەکانیدا، دانی نا بەوەی هەردوولا پێویستییان بە لێکتێگەیشتن و ڕێککەوتن هەیە. پێی وابوو کێشەی کەرکوك بە ڕێکەوتنی نێوان هەردوولا دەبێت. وتی: "من دەزانم بارزانی ناتوانێت بڵێت کەرکوك

کوردی نییە، منیش ناتوانم بڵێم کەرکوك عەرەبی نییە، لە ترسی تۆمەتی ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، بۆیە وام پێباشە بگەینە چارەسەرێکی مامناوەند و ڕووباری خاسە بکەینە سنوورێکی ئیداری جیاکەرەوە لە نێوان هەردوولادا، بەشی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك بکەوێتە چوارچێوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و بەشی ڕۆژئاواشی لانی کەم لەبەر ئەو هەموو کۆمپانیا نەوتییەی تیایدا سەر بە ناوەند بێت، ئەوەندەی من بزانم زۆربەی بیرە نەوتەکان دەکەونە بەری ڕۆژهەڵاتی ڕوباری خاسە". سەدام هەروەها جەختی کردەوە ئامادەیە بە ژمارەیەك ناوچەی تری هاوسنووری وەك خانەقین و مەندەلی و شێخان و شنگال ئاسانکاری بکات ئەگەر توانرا کێشەی کەرکوك چارەسەر بکرێت. دوای ئەوە سەرکردایەتی بارزانی دەستی بپەرژێتە سەر کارکردن لە پێناو دۆزی کورد و ئێمەش دەستمان بپەرژێتە سەر کارکردن بۆ دۆزی عەرەب و پێم وایە بەر لە کۆتایی ئەم سەدەیە دوو دەوڵەتی تازە لە ناوچەکە دروست دەبن یەکێکیان حکومەتێکی عەرەبی لە فەلەستین و ئەوی تریان حکومەتێکی کوردی.

بۆ وەڵامدانەوەی بۆچوونەکەی جەختمکردەوە زۆر پێویستە دەسەڵات پەنا نەباتە بەر هیچ جۆرە گۆڕینێکی دیموگرافی دانیشتووان لە ناوچە کوردییەکان. تا ئێستاش باوەڕم وایە گرنگترین ڕەگ و ڕیشەی سەرهەڵدانی ئەو کێشە چارەسەر نەکراوانە، لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتی تەعریبە لە سەردەمی پاشایەتییەوە پەیڕەویان کرد.

دوای گەیشتنمان بە چۆمان بە تەنیا لەگەڵ بارزانیدا قسەمکرد و

هەرچی سەدام حسەین وتبووی پێمڕاگەیاند، بارزانی وتی: "ئەی تۆ چی دەڵێیت؟" وتم: تۆ لە دۆخێكدایت بتوانیت ئەو ڕێككەوتنەی لەگەڵدا نەكەیت؟

وتی: "نەخێر، دوژمنان و ناحەزان لە هەموو لاوە دەورەیان لێداوم، تەنها دۆستێك دەمپارێزێت یەكێتی سۆڤیێتە، كە ئەویش لای خۆیەوە فشارم لێدەكەن ڕێككەوتنەكە واژۆ بكەم". هەرواش بوو، ئەو ڕۆژانە پریماكۆف لە چۆمان بوو، سەبارەت بەو بابەتە هاتبووە كوردستان و بارزانیی بینیبوو. بۆچوونەكان لەسەر ئەوە وەستان قسەكردن لەسەر بابەتی كەركوك دوابخرێت، بەو مەرجەی ئیدارەیەكی هاوبەشی تێدا دروستبكرێت، تا ئەو كاتەی متمانەی نێوان هەردوولا بە یەكتر بەهێز دەبێت، بەڵام بەو مەرجەی هیچ گۆڕانكارییەكی تازە لە دیمۆگرافیای دانیشتووانیدا نەكرێت.

بۆچوونەكەی بارزانیم هێنایەوە بۆ سەدام حسەین، ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پێشنیاری تایبەت بە شاری كەركوك و دەوروبەری، زۆر حەزی دەكرد هەرچی زووە ڕێككەوتنی نێوان هەردوولا واژۆ بكرێت. بەو جۆرە دوای چوار یان پێنج دانیشتن لە دانوستان گەیشتنە ئەوەی، كە بە بەیاننامەی ١١ ئاداری ساڵی ١٩٧٠ ناسرا. خراپ نییە لێرەدا ئاماژە بدەم بەوەی سەرۆكی لیژنەی لایەنی كوردی بۆ دانوستانەكان دكتۆر مەحموود عەلی عوسمان بوو، بەڵام سەرۆكی لیژنەی دانوستانكاری لایەنی حكومی بە بەردەوامی دەگۆڕدرا. سەدام حسەین هەمیشە پێداگری دەكرد من و

عەزیز شەریف بەشداری ئەو کۆبوونەوە و گفتوگۆیانە بکەین لە نێوان هەردوولادا کە لەو ڕۆژانەدا بەڕێوە دەچوون، بۆ ئەوەی شاهید بین لەسەر ئەوەی لە نێوانیاندا دەگوزەرێت. من وەك نوێنەرێکی سەربەخۆی لایەنی عێراقی و خوالێخۆشبوو عەزیز شەریفیش وەك نوێنەرێکی لایەنی چەپی عێراقی، کە ئەویش زۆر بە پەرۆش بوو هەردوولا بگەنە ڕێککەوتن. خودی بارزانیش ئەو بۆچوونەی بەدڵ بوو – واتە بەشداری کردنی ئێمە لە دانیشتنەکانی نێوانیان– چونکە بڕوای ڕەهای بە هەڵوێستەکانی من و ڕێزی زۆریشی بۆ عەزیز شەریف هەبوو. بەپێی ڕێککەوتنەکە بڕیار درا پێنج وەزارەت بدرێتە کورد و وەزارەتێکی تایبەتیش پێکبهێنرێت بەناوی "وەزارەتی کاروباری باکوور" کە خوالێخۆشبوو سامی عەبدوڕەحمان کرایە وەزیری.

لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بەوە بدەم بارزانی پێشنیاری کرد پۆستێکی وەزاری، یان هەر پۆستێکی تری بالآ وەربگرم، بەلآم داواکارییەکەیم ڕەتکردەوە و وتم: کورد پێویستی بە دروستکردنی نەوەیەکی نوێ هەیە لە کەسانی سیاسیی بە توانا، من بۆ خۆم دوای ئەوەی زۆریم تاقیکردەوە لە ژیانمدا، لەم دونیا هیچ پلە و پۆستێك دڵخۆشم ناکات تەنها بەختەوەری گەلەکەم بەلامەوە گرنگە. هەروەها دڵنیامکردەوە بابا عەلی شێخ مەحموودیش هەمان بۆچوونی هەیە و بیر لە هیچ پۆست و پلەیەك ناکاتەوە.

بارزانی وتی هەمان بیرکردنەوەی هەیە بۆ هەموو کوڕەکانی و بە

تایبەت بۆ هەردوو کوڕەکەی ئیدریس و مەسعود. لە ڕاستیدا خاڵێك نابێت باسی نەکەم ئەوەیە، ژمارەیەك لە سەرکردەکانی "پارتی دیموکراتی کوردستان" هیچ ئاسوودە نەبوون بەو پەیوەندییە گەرمەی من لەگەڵ بارزانیدا، بەڵکو هەندێکیان لای بارزانی زمانیان لێدەدام، هەندێك جار لە شێخ بابا عەلیش، وایاندەزانی کێبەرکێیان دەکەین لەسەر ئەو پۆستانەی دوای ڕێککەوتنی ١١ ئاداری ١٩٧٠ درابوونە کورد. بارزانی ڕاشکاوانە جەختی کردەوە پێویستە نوێنەرانی لە حکومەتدا بەردەوام لە هەموو گەورە و بچووکێکدا ڕاویژمان پێبکەن.

دوای واژۆکردن لەسەر ڕێککەوتنەکە کوڕانی بارزانی ئیدریس و مەسعود، لەگەڵ دکتۆر مەحموود عەلی عوسمان هاتنە بەغداد، بەغداد ئاهەنگگەلێکی خۆڕسکی بۆ ماوەی چەندین ڕۆژی بەخۆوە بینی، بە تایبەت لە گۆڕەپانی (ئەلتەحریر) لە ناوەڕاستی بەغدادی پایتەخت و باخچە و پارکەکانی سەدری قەنات و هەموو شارەکانی تری عێراق، خەڵکی وایاندەبینی بەیاننامەی یازدەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ سەرکەوتنێکی بێوێنەیە بۆ خەونی نیشتمانی گەورە.

## سەیرترین گفتوگۆم لەگەڵ سەدام حسەیندا

دوای ڕێککەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی کورد، پەیوەندییەکانم لەگەڵ سەدام حسەین پتەوتر بوون. ماوە ماوە لەماڵی خۆماندا سەردانی دەکردم و چەندین گفتوگۆ و بابەتی جۆراوجۆرمان باسدەکرد. بە ئەنقەست هەندێك بابەتی دیاریکراوی دەوروژاند. لە نێو ئەو بابەتانەی بە بیرم بێن، زیاتر لە جارێك داوای لێکردم پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار وەربگرم، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٢ ویستم کۆتاییەك بۆ ئەم بابەتە دابنێم و زۆر ڕاشکاوانە پێمگوت: جەنابی جێگر، من شانازی بە پۆستێکی واوە دەکەم، بەڵام دەزانم ئەرك و کاری من تەنها ڕووکەش دەبێت! هەوڵی دا قەناعەتم پێبکات لەو بۆچوونەدا هەڵەم، بەوەی متمانەی تەواوی پێمە و هیچ گومانی نییە لە دڵسۆزیم بۆ وڵات، بۆیە حەز دەکات ئەو پۆستە وەرگرم، لەسەر ئەو بنەمایەی کارەکە لەگەڵ بەرژەوەندی هەموو لایەکدا دەگونجێت. هەر لەو کاتەدا پرسیارێك کە بە مێشکمدا هات لێم کرد و وتم: باوکی عودەی! گریمان کەسێکی ناسیاوی من، یان ناسیاوی خزمەکانم گیرا بە تۆمەتێك و منیش دڵنیابووم بێتاوانە و تۆمەتەکەی بۆ دروستکراوە، بە حوکمی پێگەکەم داوا دەکەم ئازاد بکرێت، گریمان بابەتەکە خرایە بەر دەستی تۆ، تۆش داوای ڕاپۆرتێکی لەسەر دەکەیت لە بەرپرسێکی حیزبی، ڕاپۆرتەکە تۆمەتەکەی پشتڕاست کردبووەوە، تۆ لەم حاڵەتەدا قسەکەی من وەردەگریت یان قسەی بەرپرسە حیزبییەکە؟

یەکسەر وتی: "ئەڵبەت قسەی بەرپرسە حیزبییەکە" لە وەڵامدا وتم:

بۆیە منیش یەکسەر دەست لەکارکێشانەوە پێشکەش دەکەم، ئەگەر ئەوە نەکەم تا ڕۆژی قیامەت ویژدانم ئازارم دەدات، ئەڵبەت ئەو هەڵوێستەشم ڕەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر تۆ، بۆیە وەك گوتم من بۆ ئەو جۆرە شوێنانە بە کەڵك نایەم. وەڵامە ڕاست و ڕاشکاوەکەم هیچ لە هەڵوێستی دۆستانەی ئەوی لە بەرامبەرمدا نەگۆڕی، بەڵکو پێم وابوو ڕێزی زیاتر بوو بۆم و سەردانەکانی بۆ لام نەپچڕاند، بە پێچەوانەوە کار گەیشتە ئەوەی هەندێك بابەتی تایبەتی خێزانی بۆ باسدەکردم کە پێشبینیم نەدەکرد لەگەڵمدا باسیان بکات. لە سەردانێکیدا ئەم باسەی بۆ گێڕامەوە، کە بەر لە ساڵی ١٩٦٨ خوێنێك کەوتۆتە نێوان ئەندامانی هۆزەکەی و هۆزی عوبێد، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە سەدام حسەین لەگەڵ ئەحمەد حەسەن ئەلبەکردا سەردانی سەرۆك هۆزەکانی عوبێد دەکەن بۆ ئەوەی بە گوێرەی عورفی عەشایەری خوێنی کوژراوەکەیان بدەنێ، ئەوجا سەدام پێیان دەڵێت: "من بۆ خۆم ئاواتەخواز بووم ئەم ڕوداوە ڕووی نەدابا، بەڵام ئێمە ئێستاکێ لە بەردەم ئەمری واقیعداین، بۆیە پێمباشە پێشنیارەکەم قبووڵ بکەن و دڵەکانمان لە بەرامبەر یەکدا پاك بکەینەوە، لەبەر هۆکارێکی سادە، مادامەکێ ئێمە لە دەسەڵاتداین ئێوە ناتوانن تۆڵەمان لێبکەنەوە یان شتێکمان لە دژ بکەن، ئەگەر لە دەسەڵاتیش نەماین، تا ئێوە دەگەنە سەرمان خەڵکی تر لەناویان بردووین، بۆیە باشتر وایە خوێنەکە وەرگرن". هۆزی عوبێد لە ڕێگەی ئەو لۆژیکە دروستەوە، خوێنەکە وەردەگرن و کێشەکە چارەسەر دەبێت.

هەر لەو ڕۆژانەدا بە دیاریکراوی ئەم گفتوگۆ سەیرە لە نێوانی سەدام

حسەین و مندا لە ماڵی خۆماندا دروستبوو، باس لە پێگەی کرا لە نێو حیزب و دەوڵەتدا، ڕاشکاوانە وتی: "بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی حیزب، دەتوانم ببمە ئەمینداری حیزب و هەروەها سەرۆك کۆماریش، بەڵام پێمباشە لە ڕێگەی موماره‌سە کردنەوە زیاتر فێربم، چونکە حوکمداری هونەرێکی قورس و ئاڵۆزە و پێویستی بە پشوودرێژی و کەڵەکەبوونی ئەزموون هەیە".

قسەکەم لە دەم وەرگرتەوە و پێمگوت: هەر لە ئێستاوە وای دەبینم بەو نزیکانە دەبیتە پیاوی یەکەمی وڵات، لە ڕاستیدا بەبێ ئەوەش پیاوی یەکەمی وڵاتی، بۆیە بۆچوونێکم هەیە حەز دەکەم ڕاشکاوانە پێتی بڵێم. زۆر دڵخۆش بوو و هەرچی گیانیی بوو کردیە گوێ بۆ بیستنی بۆچوونەکەم، پێمگوت: باوکی عودەی! تۆ پیاوێکی قۆزیت و لە ڕووی کرداریشەوە باڵاترین پۆستت هەیە لە دەوڵەتدا، بێگومان هەندێك لە خەڵکی حەز دەکەن لێت نزیك ببنەوە، بەڵام دەبێت تۆ وەك باوکێکی میهرەبان و بەبێ جیاوازی لەگەڵ هەموو عێراقییەکاندا مامەڵە بکەیت، دەبێت وەك کچەکانی خۆت تەماشای کچانی عێراق و ژنەکانیشیان وەك خوشکی خۆت سەیر بکەیت.

لە مەبەستم تێگەیشت، یەکسەر وتی: "باوکی فەرهاد، شتێکت بیستووە وات لێبکات ئەو قسانە بکەیت؟" پێمگوت: بەڵێ، بیستوومە لە ئەلمەنسور خانوویەکی تایبەتت هەیە و لەگەڵ عەبدولکەریم شێخلی هاوڕێت شەوانی سوری تێدا دەبەنە سەر.

هەر لەوێدا ئەو باسەی جەمال عەبدولناسرم هێنایەوە بیری کە لە ساڵی ١٩٦٣ وەسفی عەلی ساڵەح ئەلسەعدی کردبوو بە (پیاوی چێژەکان). لە ڕاستیدا سەدام حسەین نکوڵی نەکرد لەوەی وتم و بە یەك ڕستە وتی: "باوکی فەرهاد سوپاست دەکەم، دڵنیابە لە ئەمڕۆ بەدواوە قسەیەك لەو بارەوە نابیستی". پێم وایە ڕاستگۆیی و نییەتپاکی و ڕاشکاویی من، کە لە ڕۆژهەڵاتدا دەگمەنە، وای لێکرد زیاتر خۆشی بوێم و تا ئەوپەڕی متمانەم پێبکات، تەنانەت جارێکیان ڕاشکاوانە پێیگوتم: "باوکی فەرهاد من باش دەزانم تۆ لە سەجلیسەکانتدا ڕەخنەمان لێدەگریت، من زۆر بە دڵفراوانی ئەوەت لێوەردەگرم، چونکە دەزانم دڵ و زمانت یەکن و یەکڕوویت و لە نیازە پاکەکانت تێدەگەم. لە کاتێکدا خەڵکانێکی تر هەن بە زمان قسەیەك دەکەن و دڵیان شتێکی تر دەڵێت، ڕاستی حەز دەکەم زمانی ئەو جۆرە کەسانە ببڕم".

لە هەمان دانیشتندا وتی: "مەبەستم لە وروژاندنی بابەتە مێژووییەکانی تایبەت بە کەسایەتییەکانی سەردەمی پاشایەتی، نمونەی مەلیك غازی و فەریق بەکر سدقی و جەمیل ئەلمەدفەعی ئەوەیە، من زۆر سوود دەبینم لەو چیرۆکانەی بۆمی دەگێڕیتەوە". بە جۆرێك دوای هەموو سەردانێکم بۆ لای تۆ هەست بە گۆڕانکاری دەکەم لە بیرکردنەوەمدا". تەنانەت وتی: "کە دێمە لات کەسێکم کە دەردەچم کەسێکی ترم".

پێمگوت: جەنابی جێگر، بەداخەوە هەست دەکەم زۆربەی ئەوانەی بە دەورتەوەن لە قوڕێکی ترن و وەك بزانم بە ئاڕاستەیەکی نادروستدا

دەتبەن. بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدامەوە و تووڕەبوونیشی لە نێو چاواندا بە دیار نەکەوت.

## گەڕانەوە بۆ ڕێککەوتننامەی "بەیاننامەی" ئادار

هەرگیز نایشارمەوە کە هیوایەکی زۆرم لەسەر ڕێککەوتنی ١١ی ئازار هەڵچنی بوو، نەك هەر من، بگرە هەموو دڵسۆزانی عێراق بە کورد و عەرەب و تەنانەت خەڵکانی تریش ئەو هیوایەیان هەڵچنی بوو، بەڵام هەرزوو بێئومێدی لە کەلەوە سەری دەرهێنا و گومان و نائومێدی سەبارەت بە نیازپاکی ڕاستەقینە لە زۆربەی ناوەندە حکومییە بەرپرسەکانەوە دەستیان بەدیارکەوتن کرد.

لەو ڕۆژانەدا وا ڕێکەوت دایکی برای بەڕێزم حەسەن ئەلنەقیب کۆچی دواییکرد، حەسەن زۆر دۆست و هاوڕێم بوو، سەردانی پرسەکەیمکرد لە ماڵی خۆیان لە شاری ئەفسەران، لە گەڕەکی ئەلیەرموك، زۆر بە گەرمی بەخێری هێنام و هات لە کورسییەکەی تەنیشتم دانیشت و وتی: "کاتێك دەڕۆیتەوە دەمەوێت دوو بە دوو هەندێك قسەت لەگەڵ بکەم، شتی گرنگ هەیە دەمەوێت پێتی بڵێم".

کاتێك لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە لەگەڵمدا هاتە دەرەوە و زیاتر لە کاتژمێرێك پێکەوە قسەمانکرد و ڕاشکاوانە پێیگوتم ڕازی نییە لەوەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی دەگوزەرێت و ئەم هەستەی نەشاردۆتەوە، بۆیە بە ماوەیەکی کەم بەر لە کۆچی دوایی دایکی وەك باڵوێزی عێراق دوورخراوەتەوە بۆ ئیسپانیا و بە نیازە بە یەکجاری عێراق بەجێبهێڵێت.

دوای ئەم پێشەکییە، چووە سەر ئەسڵی مەبەست و جارێکی تر باسی پەیوەندیی برایانەی نێوانمانی کرد کە چەند متمانە هەیە لە نێوانماندا، ئەمجا ڕاست و ڕەوان وتی: "من وەك برا گەورەی خۆم تەماشای تۆ دەکەم، بۆیە ئاگادارت دەکەمەوە لە نیازە خراپەکانی دەسەڵات و دەبێت بە زووترین کات خودی بارزانی ئاگادار بکەیتەوە تا ئەوپەڕی ئاگای لە خۆی بێت". ئەمجا ماچی خوداحافیزی لێکردم و دووپاتی کردەوە کە جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ عێراق، مادامەکێ ئەوانە لەسەر دەسەڵاتن، وتی: "من زۆر دڵگرانم بۆت و هیوادارم بارزانی ئاگادار بکەیتەوە کە ئەمانە مەبدەئی نین و هەموو شتێك لایان کاتییە و بۆ قۆناغێکە".

دەمزانی حەسەن ئەلنەقیب چەند ڕاست دەکات و چەندە پیاوێکی مەردە و هەرزوو قسەکانی ڕاست دەرچوون. قەدەر وابوو لەو ماوەیەدا عارفی کوڕم تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو، بۆ چارەسەر بردمە لەندەن، کاتێك پیلانی تیرۆرکردنی بارزانی ڕووی دا، دەزگای هەواڵگری عێراقی شاندێك لە پیاوانی ئایینییان، نارد بۆ کوردستان و بێئەوەی بە خۆی بزانێت لە یەکێکیاندا بۆمبێکیان چاندبوو، ئامێرێکی زۆر وردیان لە لاشەی دانا بوو، کە گوایە ڕیکۆردی تۆمارکردنی دەنگە، دەبوو ئەندامانی شاندەکە بیجوڵێنن بۆ ئەوەی ڕاشکاوانە قسە بکات. ئەگەر چایچییەکەی نەبووایە کە لە کاتی تەقینەوەکەدا چایی لە بەردەم بارزانی دانابوو و کەوتبووە نێوان خۆکوژەکە و بارزانییەوە، وە خۆکوژەکە و چایچییەکە هەردووکیان هەلا هەلا بوون و بارزانی سەلامەت دەرچوو. ئەو پیلانگێڕییە درزێکی گەورەی کردە پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و

حکومەتی بەعس و بێئومێدییەکی گەورەشی دروستکرد لە ڕیزی کوردە دڵسۆزەکان بەبێ جیاوازی. شتێکی ئاسایی بوو لایەنە نێودەوڵەتیی و ئیقلیمییەکانیش کار بکەن بۆ لەباربردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار.

ئەو کوردانەی سەر بە حکومەت بوون، هەندێکیان ڕۆڵی نەرێنییان بەو ئاراستەیەدا بینی. لەوانە بە نمونە هەندێکیان، ئەفسەری بنکەی قۆرەتوویان لە قەزای خانەقین ڕادەستی دەسەڵاتدارانی ئێران کرد بە بیانووی ئەوەی ئەو ناوچەیە دەکەوێتە سنووری خاکی ئێرانەوە. ئەم بابەتە سەدام حسەینی زۆر تورەکرد، پێش ڕۆیشتنم بۆ لەندەن بۆ چارەسەری عارفی کوڕم، لەلایەن حکومەتەوە سەدام حسەین و لەلایەنی کوردەوە حەبیب موحەممەد کەریم و مەحموود عوسمان و یەکێك لە کوڕەکانی بارزانی و من دانیشتبووین تاوتوێی ئەو دۆزانەمان دەکرد کە تایبەت بوون بە بەیاننامەی ١١ی ئادار. لەناکاو بەرپرسێك هاتە ژوورەوە و کاغەزێکی تایبەتی دایە دەستی سەدام حسەینەوە، هەر کە خوێندییەوە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و بە هەڵچوون و تووڕەییەکی زۆرەوە وتی: "ئەوەی یاری بە ئاگر بکات دەشێت دەستی بسووتێت".

کە مەبەستی قسەکەی ڕوونکردەوە، دەرکەوت بەرپرسی حیزبی ناحیەی قۆرەتوو "جەلیل فەیلی" معاونی پۆلیسی قۆرەتووی ڕادەستی دەسەڵاتدارانی ئێران کردووەتەوە. تووڕەیی و مۆنییەکی گەورە باڵی بەسەر ئەندامانی شاندی کوردیدا کێشا، ئەو ڕوداوە سەرەتایەکی مەترسیداری دروستکرد لە تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی

عێراق و سەرکردایەتی کورد.

ئەو ڕووداوە داخهێنەرانە وای لێکردم هەرزوو بگەڕێمەوە بۆ عێراق، دوای گەیشتنەوەم بە بەغداد، ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە وەزیرە کوردەکانەوە کرد و بە توندی گلەیی ئەوەم لێکردن بۆچی لە ئەنجامی هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانی دەستیان لەکار نەکێشاوەتەوە. هەر کە قسەم لەگەڵ بارزانیش کرد پێمگوت پێم باشبووە فەرمانی کشانەوەیانت بدایە.

دوای ئەوە سەردانی سەدام حسەینم کرد و گلەیی زۆرم لێکرد، ئەویش هەرچی پیلانەکەی خستە ئەستۆی نازم گوزاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی لەو کاتەدا. هەرچەندە بڕوام بە قسەکانی نەکرد، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نەبوو نازم گوزار دەستی لەو پیلانەدا نەبووبێت، بەڵام سرووشتی سەدام لەو جۆرانە نەبوو ڕێگە بدات یان بهێڵێت هیچ کەسێك بەبێ ئاگاداری خۆی هەنگاوێکی وا مەترسیدار بنێت.

دوای چەند ڕۆژێك سەردانی کوردستانم کرد و لە بارەگای خۆی چاوم بە بارزانی کەوت، گفتوگۆیەکی دوور و درێژمان لە نێواندا چوو، ئەوەی سەدام وتبووی هەموویم بۆ گێڕایەوە، بەڵام بڕوای نەکرد بە قسەکانی و هەمووی ڕەتکردەوە، ئەمجا باسی ڕووداوەکەی بۆ کردم، چۆن بە گەرمی پێشوازی لە شاندەکە کردووە و پێشمەرگەیەك لەو کاتەدا چایی لەبەردەستی بارزانیدا داناوە و کەوتۆتە نێوانی ئەم و خۆکوژەکە و خۆکوژەکە سوودی لەو کاتە بینیوە کە بارزانی ئەو نابینێت، ئەو ئامێرەی کە پێیان وتبوو ڕێکۆردە خستۆتە ئیش و تەقینەوەیەکی گەورە ڕووی

داوە و جەستەی هەردوو پێشمەرگە و خۆکوژەکە پارچە پارچە بووە.

## پلانی دووەم دژی بارزانی

بەو بۆنەیەوە دەمەوێت لێرەدا زۆر بە کورتی چیرۆکی پیلانێکی تر بۆ کوشتنی بارزانی کە دوای ماوەیەکی کەم لە پیلانی یەکەم ڕووی دا، تۆمار بکەم، کە تا ئێستا باس نەکراوە. ڕۆژێکیان لای بارزانی دانیشتبووم، خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی کوڕی هاتە ژوورەوە و چپەیەکی بۆ باوکی کرد، ئەویش ڕوخسەتی لێوەرگرتم و چووە دەرەوە، کە گەڕایەوە دەبینم دەموچاوی بارزانی سوور هەڵگەڕاوە و ئەم چیرۆکە سەیرەی گێڕایەوە:

"دەسەڵات ڕۆژنامەنووسێکی ناردووە بە مەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵم، بەڵام دەرکەوت لە نێو کەلوپەلەکانیدا جانتایەکی بۆمبڕێژکراوی بچووکی هەڵگرتووە بەو نیازەی لەبەردەم مندا دایبنێت و بەبیانووی دەست شوشتن خۆی بچێتە دەرەوە و جانتاکە بتەقێتەوە". دوای کۆتاییهاتنی چیرۆکەکە لەلایەن بارزانییەوە،پرسیارم لێکرد: کەواتە چۆن داوا لە من دەکەیت پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار وەربگرم؟! خوالێخۆشبوو بێدەنگ بوو و وەڵامی نەدامەوە.

## چیرۆکی یەکێك لە بازرگانەکان

بیرمە لە یەکێك لە ڕۆژانی ئەو قۆناغەی پڕ بوو لە ڕوداوی کتوپڕی چاوەڕواننەکراو، نەسیر کامل ئەلچادرچی هات بۆ لام و ناڕەحەتی و شڵەژان لە دەموچاویدا دیار بوو، کە پرسیارم لێکرد، ئەمەی بۆ گێڕامەوە: "پیاوانی ئاسایش زاواکەمیان کە بازرگانە لە شۆڕیجە دەستگیرکردووە، بە بیانووی ئەوەی هەندێك کاڵای بە نرخی گرانتر لە نرخی دیاریکراوی خۆی فرۆشتووە. وێڕای ئەوەی بێتاوانە سەریان تاشیوە و فیلمیان لێگرتووە بۆ ئەوەی ئەمشەو لە تەلەفزیۆن پیشانی بدەن، خوشکەکەم سوێندی خواردووە، ئەگەر لە تەلەفزیۆن پیشان بدرێت خۆی دەکوژێت. بۆیە داوات لێدەکەم لای کاربەدەستان کارێك بکەیت ڕزگاری بکەیت".

هیچ چارم نەما جگە لەوەی بە دەم داواکەیەوە بچم و قسەی تێدا بکەم، بە تایبەت ڕێزێکی زۆرم بۆ نەسیر و کامل ئەلچادرچی باوکی هەبوو. بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە سەرۆك کۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرەوە کرد و پێمگوت زۆر پێویستە هەر ئەو ڕۆژە سەردانی بکەم. تکای کرد ئەگەر دەکرێت بابەتەکە دواخەم بۆ ڕۆژی شەممە، ئەو ڕۆژەی پەیوەندیم لەگەڵی گرت ڕۆژی پێنج شەممە بوو، بەڵام پێداگریم کرد هەر دەبێت ئەو ڕۆژە ببینم، بۆیە یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی.

کە چووم بۆ کۆشك دەبینم عەزیز شەریفیش لەوێیە و پێکەوە چووینە لای سەرۆك، کە بە درێژی بابەتەکەم بۆ گێڕایەوە، پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە کرد و فەرمانی پێکردن کە ئەو فیلمە پیشان نەدەن،

بۆیە منیش زۆر سوپاسیم کرد بۆ ئەو هەڵوێستە دۆستانەیەی.

بەڵام کاتێك خوالێخۆشبوو عەزیز شەریف بابەتی ئەو کەسەی لەگەڵ باسکرد، کە حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرکراوە، کاتێك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر پەیوەندی بە سەدام حسەینەوە کرد، سەدام پێیگوت: "لەسێدارە دراوە و دۆسییەی تایبەت بە حوکمدانەکەیتان بۆ دەنێرین کەی حەزت کرد ڕەزامەندی لەسەر دەربڕە".

کاتێك ئەوەم بیست بۆم دەرکەوت، چیتر ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لە ڕوویەکی ڕووکەشی دەسەڵاتی عێراق زیاتر هیچی تر نییە و هەموو شتێك لە عێراقدا بە دەستی سەدامە. لە کۆتایی ئەم باسەدا دەمەوێت بە خێرایی بگەڕێمەوە بۆ بابەتی دۆزی کورد، هەموو ڕۆژێك بەربەستێکی تازە لە بەردەم جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاردا دروستدەکرا. دوژمنانی کورد زۆر بوون، لەوانە کۆمپانیاکانی نەوت و وڵاتانی دراوسێ و وڵاتانی زلهێز، هەریەکەیان هێندەی پێکرابا بەربەست و ئاستەنگیان لە بەردەم جێبەجێکردنیدا دروستدەکرد. هیوادارم ئەوەی باسمکرد وانەیەکی بەسوود بێت لە پێناو وڵات و عەرەب و کورد و تورکمان و کەمە نەتەوایەتیی و ئایینییەکانی تردا.

## ئەوانەی پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو

دوای ئەوەی پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەتی ناوەندی تێکچوو، حکومەت دەستیکرد بە دەرکردنی خێزانی هەموو ئەو کەسایەتییە کوردانەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو، بۆ ئەوەی قورساییەکی زیاتر بکەوێتە سەرشانی پێشمەرگە، چووم چارەنووسی منداڵەکانم بزانم، بەڵام تیایاندا نەبوون، دواتر زانیم خێزانی من لە سەرەوەی ئەو خێزانانە بوون کە بڕیاری دەرکردنیان درابوو، بەڵام کە ناوەکان دەچنە بەردەستی سەدام، ناوەکەیانی ڕەش کردبووەوە.

هەرواش بوو دەرکردنی خێزانەکان بارگرانییەکی زیاتری دروست کردبوو بۆ سەرشانی شۆڕش. خێزانی دەوڵەمەند و داراکان دابەشکران بەسەر گوندەکانی ناوچەکەدا، بەڵام خێزانە هەژارەکان چ تاڵاوێکیان چەشت، حکومەتی ئێرانی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەسەر سنوور ڕایگرتن، بەر لەوەی ئۆردوگایان بۆ دروستبکات و خێوەتیان بۆ هەڵدات و شۆڕش مانگانەیەکی بەسەریاندا دابەش دەکرد.

ڕۆژانی دواتر لە چایخانەیەکی کۆندا دەژیام لە گوندێك بەناوی کانی ڕەش لەسەر شەقامی گشتی، کە تەنها نزیکەی سێ کیلۆمەترێك لە سنووری ئێرانەوە دوور بوو، بە چاوی خۆم دەردەسەری ئەو هەزاران کەسەم دەبینی، بە تایبەت چۆن بە دەست سەرماوە دەیانناڵاند، قەت چیرۆکی ئەو پیاوەم بیر ناچێت کە هات داوای پاچ و بێڵی کرد، پرسیارم کرد بۆچیتە؟ بە غەمبارییەکی گەورەوە وەڵامی دامەوە: "دەمەوێت

کوڕەکەم ئەسپەردەی خاك بکەم، کە دوێنێ ئێوارە بەهۆی سەرماوە گیانی لەدەست دا".

دوای ئەوەی تاران ڕەزامەندی دەربڕی، خێزانە کوردەکان چوونە ناو خاکی ئێرانەوە و ئەوانەیان دەستڕۆیشتوو و پارەداربوون لە گوند و شارەکان خانوویان بە کرێ گرت و ئەوانەشیان هەژار و کەمدەست بوون، برانە ئۆردوگاکان و ژیانێکی سەختیان تیادا گوزەراند. ژمارەیەکی کەمی خێزانەکانیش لە حاجی ئۆمەران لە نزیك سنوورەکانی ئێران مانەوە.

## دۆخی ڕۆشنبیران

بێجێ نییە لێرەدا ئاماژە بدەین بەوانەی ئاوارە بووبوون، ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە باشترین ڕۆشنبیرانی کوردی لەخۆدەگرت، لەوانە مامۆستایانی زانکۆکانی عێراق و بە تایبەت زانکۆی سلێمانی و ژمارەیەك لە شاعیران و ڕۆژنامەنوسە دیارەکان و ئەفسەرانی سوپا، چەندینی تری لەو شێوەیە، کە دەتوانرا سوودی زۆریان لێوەربگیرێت، ئەمە وایکرد ئەم بابەتە لەگەڵ خودی بارزانی باس بکەم، کە جەختمکردەوە دەشێت لیژنەیەکی ڕاوێژکاری تایبەت لە باشترین ئەو کەسانە پێکبهێنرێت، بەڵام وەڵامدانەوەی نەبوو بۆ پێشنیارەکەم و وتی دەترسم کەسانێك لە نێویاندا هەبێت حکومەتی ناوەندی ناردبێتنی بۆ ئەوەی زیان بە شۆڕشەکەمان بگەیەنن، هاوڕا نەبووم لەگەڵ بۆچوونەکەی و وتم: دەشێت ناحەز و نێردراو لە ڕیزی خودی سەرکردایەتی کورددا هەبێت. بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، هەرچۆن بێت زۆربەی ئەو مامۆستایانەی زانکۆ هاتبوونە ڕیزی

شۆڕشەوە، ناچار بوون کوردستان جێبهێڵن و ڕوویانکردە وڵاتانی ئەورووپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

## سەردانم بۆ لای دوو ئەفسەری عەرەب

لە بیرمە لەو ڕۆژانە سەردانی دوو ئەفسەری عەرەبم کرد، کە پەیوەندییەکی زۆر باش و کۆنیان لەگەڵ بارزانیدا هەبوو، یەکێکیان لیوا ڕوکن کەمال مستەفا عەلەمداری سەرکردەی فیرقە و بەداخەوە ناوی ئەوی تریانم بیر نەماوە، بەڵام وەك عەلەمداری هاوڕێی، ئەویش لە ئەفسەرە باشەکان بوو. لەو ڕۆژانەدا بڕیاریان دابوو بێنە کوردستان، بەڕاستی سەردانەکەم بۆ لایان زۆر سەردانێکی بە نرخ بوو، ڕێکەوت وابوو خودی بارزانی و مەسعودی کوڕیشی هاتبوونە سەردانیان، کە بەردەوام سەردانیان دەکردن. زۆر دڵخۆشبووم بەو سەردانە، هەمووان هەروا لە هەریەك لە لیوا کەما مستەفا عەلەمدار و هاوڕێکەیان دەڕوانی، کە باشترین پەیوەندی مێژوویی ڕەسەنە لە نێوان چین و توێژەکانی گەلی عێراقدا، منیش بەردەوام و ئەوەندەی پێمبکرایە سەردانم دەکردن.

## تێکچوونی باری تەندروستیم

ئەو ڕۆژەی سەردانی ئەو دوو ئەفسەرەم کرد زۆر ناساغ بووم، بە جۆرێك بە زەحمەت هەناسەم بۆ دەدرا، مەسعود بارزانی هەستیکرد زۆر نەخۆشم، گرنگییەکی تایبەتی پێدام و بۆ چارەسەر ڕەوانەی تاران کرام و برامە یەکێك لە باشترین نەخۆشخانەکانی، بە جۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ کردم لە ژیانمدا لە بیرم ناچێت، دوای ئەوە بۆ پشوودان گواسترامەوە بۆ

یەکێك لە کۆشکەکانی بابوڵ لەسەر دەریای خەزەر، بە هەردوو شاری قەزوین و ڕەشتدا تێپەڕین و بەرپرسان بە گەرمی و ڕێزەوە پێشوازییان لێکردم.

ئێوارەکەی گەیشتینە یەکێك لە کۆشکەکانی شاهانە لە بابوڵسەر، کە لە ڕاستیدا بەهەشتێکی خودا بوو لەسەر زەویدا، بەڵام لەبەر ئەوەی تەنیا و بێتاقەت بووم، بۆیە نەمتوانی لە ڕۆژێك زیاتر لێی بمێنمەوە، ڕۆژی دواتر گەڕامەوە بۆ تاران، شەوێکیش لە تاران لە هوتێلدا مامەوە و دوای ئەوە بە فڕۆکە گەڕامەوە بۆ ورمێ، لە فڕۆکەخانەی ورمێ هەمان ڕۆژ بە ئۆتۆمبێل هاتمەوە حاجی ئۆمەران و لە چۆمان نیشتەجێ بووم.

## ڕێزلێنان لە غەریبێك

لە چۆمان سەرم سوڕما بە ئەندامی "کۆمەڵەی مانگی سور" دامەزرابووم، کە بە سەرۆکایەتی دکتۆر کەمال عەبدوڵڵا ناجی پێکهێنرابوو، کۆمەڵەکە زیاتر لە دوازدە ئەندامی لەخۆدەگرت، چەند مەلا و ژنێکی تێدا بوون، ڕیزبەندی ناوی من وەك لە بیرم بێت، دەیەم بوو. دامەزراندنەکەم بە سووکایەتیکردن بۆ خۆم دانا، خوالێخۆشبوو عەبدولوەهاب ئەتروشی فەرمانەکەی پێڕاگەیاندم، لەو کاتەدا ناوبراو کە هاتە ژوورەوە و فەرمانەکەی بۆ هێنام، هەندێك میوان لام دانیشتبوون بۆیە دەقی فەرمانەکەم بۆ میوانەکانم خوێندەوە و وتم:

کاتی خۆی پۆستی جێگری سەرۆك کۆمارم قبووڵ نەکرد وا لێرە برادەران ڕێزیان لێگرتووم کە ببمە ئەندام لە کۆمەڵەیەکدا نە سەنگ و نە

کارێکی نییە.

قسەکانم تا ڕادەیەك ئامادەبووانی تووڕە کرد، بۆیە چووم بۆ لای بارزانی، ئەویش لای خۆیەوە بڕیارەکەی بە سووکایەتی دانا، بەڵکو لە من زیاتر ناڕەحەت بوو. لە ڕاستیدا هەستمدەکرد ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی کورد ڕقێکی شاراوەیان بەرامبەرم هەیە، بەهۆی ئەو ڕەخنانەی ڕاشکاوانە دەمگرت، بۆیە هەوڵیان دەدا بە هەر شێوەیەك بێت بمشکێنن، لای هەندێکیان کار گەیشتە ئەوەی لە لای بارزانی تۆمەتبارم بکەن بە سیخوڕی بۆ حکومەتی عێراق.

بەو بۆنەیەوە بە بارزانیم گوت: دڵڕەقی هەندێك لە سەرکردەکانت وام لێدەکات بچمە سەر ئەو باوەڕەی ئەوان ئەگەر خوانەخواستە لە ئایندەدا پێگەیەکی هەستیار وەرگرن، ببنە هۆی وێرانکردنی کوردستان، خۆشبەختانە ئەوان ژمارەیان لە پەنجەکانی یەك دەست تێنەدەپەڕی. لە کاتێکدا زۆربەی سەرکردەکانی تری کورد، کوردی دڵسۆز بوون و باشترین پەیوەندییان لەگەڵم هەبوو، ڕێککەوتنی شوومی جەزائیر ڕووی ڕاستی هەموو ئەو کەسانەی دەرخست کە پەیوەندی گوماناوییان هەبوو لەبەر خاتری پاراستنی ناوبانگی کەسوکارەکانیان، منیش نامەوێت ئاماژە بە ناوەکانیان بکەم.

## ڕێككەوتننامەی جەزائیر، پیلانێكی نێودەوڵەتی گەورە

لەو قۆناغە ناهەموارەدا ڕێككەوتننامەی جەزائیر كرا، خەنجەرێك بوو درا لە پشتی نەتەوەی كورد بە گشتی و كوردی عێراق بە تایبەتی، هەر كە دەستكرا بە جێبەجێكردنی خاڵەكانی ڕێككەوتننامەكە، ئێمە ناچار بووین بچینە نێو خاكی ئێرانەوە، من و چەند هاوڕێیەكم سەرەتا چووینە شاری نەغەدە و دوای ئەوە بۆ تاران، لە تاران سەردانی بارزانیم كرد و پێمگوت: بڕیام داوە لێرە بمێنمەوە و نەگەڕێمەوە، بەڵام ڕازی نەبوو، وتی: "دەبێت بێدەنگ بگەڕێیتەوە بۆ عێراق، لەبەر ئەوەی سەدام فەرهادی كوڕتی گرتووە، ئەو هیچ بەزەییەك نازانێت، تكا دەكەم بگەڕێوە، بەڵكو ببێتە هۆی ڕزگاربوونی، ئەگەر بارودۆخ گۆڕا و گەڕاینەوە بۆ گۆڕەپانی خەبات، ئەو كات داوات لێدەكەین بگەڕێیتەوە ناومان".

هەر لەو دانیشتنەدا بارزانی پێیگوتم: "كاك فوئاد لە كاتی خۆیدا كە گوێم لە بۆچوونەكانی تۆ و بابا عەلی شێخ مەحموود دەگرت جڵەوی كەشتییەكەم باشتر لێدەخوڕی، بەڵام لەو دواییانە گوێ بۆ بۆچوونی كەسانێك دەگرم كە نەدەبوو هیچ گرنگییەكیان پێبدەم و گوێیان لێبگرم" ناوی هەموویانی یەك یەك هێنا، بەڵام لەبەر ئەو هۆكارەی پێشتر باسمكرد نامەوێت لێرەدا ناویان تۆمار بكەم.

## دوایین چاوپێکەوتنم لەگەڵ بارزانی

لە دوای رێککەوتننامەی جەزائیر تا رادەیەکی زۆر چاوپێکەوتنەکانم لەگەڵ بارزانیدا کەمتر بووەوە، کە لێرەدا هەوڵدەدەم تیشک بخەمە سەر چەند لایەنێکی، بەر لە هەموو شتێك لە ورمێوە گەرامەوە بۆ چۆمان و جلی کوردیم لەبەرکرد و تفەنگەکەم کردە شان و چوومە ریزی بەرگریکارانەوە. بیرمە چۆن کاك موحسین دزەیی لە رۆژی راگەیاندنی رێککەوتنەکەدا بە شلەژانەوە هات بۆ لام و چاوەکانی فرمێسکیان دەرژاند. باسی لەو پیلانە نێودەوڵەتییە گەورەیە دەکرد لەسەر نەتەوەی کورد. پێیگوتم: بارودۆخی هەردوو کورانی بارزانی ئیدریس و مەسعود زۆر خراپە، داوای لێکردم بچم بۆ لایان. بەبێ دەنگ چووم بۆ لایان و قسەم لەگەڵ کردن و کاریگەری بەلا و چورتمەکەم لەسەر کەمکردنەوە. دڵنیامکردنەوە کە متمانەم بە میللەتەکەم زۆرە، پێشمەرگە زیاتر لە جێگەیەك دەستی باشیان لە هێزەکانی حکومەت وەشاندبوو و زیاد لە شوێنێکیش پێشرەوی هێزەکانیان وەستاندبوو، ئەمەش ئومێدێکی تازەی دا بە خەڵکەکە و لە چۆمان و ناوچەکانی تر دەستیان بە خۆشی کرد.

لەو ساتەوەختەدا هەوڵم دا ئەوپەری مەحاڵ بەکاربهێنم بۆ رزگارکردنی ئەوەی دەشێت رزگار بکرێت، بۆیە بریارم دا نامەیەکی تایبەت بۆ سەدام حسەین بنووسم و داوای لێبکەم لەو رێککەوتنە پاشگەزببێتەوە، کوردانیش ئامادەن تا ئەوپەری لەو بارەیەوە هاوکاری لەگەڵ بکەن. بیرۆکەکەم بۆ هەریەك لە ئیدریس و مەسعود بارزانی و چەند هاورێیەکی تری نزیکم

باسکرد، ئەوانیش هانیان دام بەبێ دوودڵی نامەکە بنووسم، بۆیە داوام لە خوالێخۆشبوو خەسرەو تۆفیق کرد بیرۆکەکە داڕێژێت کە ئەویش لای خۆیەوە پێشوازی لێکرد، نامەکە بەم جۆرە داڕێژرا:

برای بەڕێز

سلاوێکی برایانە لە دڵەوە

من مەردایەتی و نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی لە تۆدا ڕادەبینم، بۆیە بە ئەرکی خۆمم زانی ئەم نامەیەتان بۆ بنووسم، لە کاتێکدا بەداخەوەم بەوەی بە خەتی خۆم نەمنووسیوە بۆ ئەو بارودۆخەی لە بەڕێزتان شاراوە نییە.

بێگومان دەزانن من هەمیشە لایەنگری ئاشتی بووم و هەرگیز باوەڕم وانیە کێشە چارەسەر نەبووەکانی نێوان هەردوو نەتەوە بە هێزی چەك یەکلایی ببێتەوە. حەتمەن هەوڵەکانی منتان لە ساڵی ١٩٦٩ لە بیرە لەو بارەیەوە. چەندم گفتوگۆ لەگەڵتان کرد، کاتێك ناکۆکییەکان لەو کاتانەدا لە لوتکەدا بوون و بۆچوونم ڕوون و ئاشکرا بوو لەو چەند جارانەی بەر لە ڕێککەوتننامەی ئادار و دانوستانەکانی ئاداری ١٩٧٤ گفتوگۆو چاوپێکەوتنمان لەگەڵ یەکتر کرد، کە دواینیان ئەو هەوڵی ئاشتییە سەرنەکەوتووە بوو، لە ئەنجامیدا هاتم بۆ ئێرە و لە پێناو بەدواداچوونیدا لێرە مامەوە بۆ ئەوەی بگەمە ئەنجامێکی دڵخۆشکەر. بەردەوام بووم لە هەوڵەکانم تا بەداخەوە کار گەیشتە ئەم ئەنجامە. واتە تا ڕادەی قبووڵکردنی ڕێککەوتنێکی لەو جۆرە کە لە بەرژەوەندی عێراق نییە،

عێراقی عەرەب و کورد کە لە هیچ سەردەمانێکی پێشوودا ئێران نەیتوانیوە لێی بپچڕێنێت.

بەوەی متمانەم بە نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی ئێوە هەیە، قووڵی ئەو برینە کە خوێنی لێدەتکێت لە دڵتان لە ئەنجامی واژۆکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە زۆر باش تێدەگەم، هەروەها ئەو پاڵنەرانەش تێدەگەم کە پاڵی پێتانەوە نا تا ئەم ڕێگەیە بگرنەبەر.

بۆیە لە بەر خۆشەویستیم بۆ تۆ، حەز ناکەم واژۆی تۆ لەسەر ڕێککەوتنێك ببینم پێشێلی سەروەری سنووری عێراق بکات، کە من وەك کەسێکی سەربازی دڵسۆز سوێندم خواردووە سنوورەکانی بپارێزم، بۆیە هێشتا هەلێك لەبەردەستدا ماوە بۆ دەرچوون لەم ڕێککەوتنە، لەبەر ئەو بارودۆخە سەختەی هەردوولا، بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم داواتان لێبکەم بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەك بۆ ڕزگاربوون لێی، بە تایبەت بە بیانووی بوونی هەندێك مەرجی تەعجیزی کە لایەنەکەی تر قبووڵی ناکات، بەوەش هیچ ئیحراجبوونێکتان بۆ دروست نابێت لە بەرامبەر لایەنەکانی تر.

بۆیە لێرە لەگەڵ هەندێك لە براياندا قسەم کردووە، قسەی ئەوانیش کە سەنگێکی قورسی هەیە، تێکەڵ بە بۆچوونەکانی من بوون. ئەگەر بەڕێزیشتان پشتگیری لێبکەن وەك هەمیشە پشتگیریت لێکردووە، ئەوا سەنگ و قورساییەکی زیاتری پێدەدەیت. وەك برایان دەیانەوێت ئەم ڕێککەوتنە نەبێتە هۆی ئەوەی مەرجی قورس نەخرێتە سەر عێراق و بەشێك لە خاکەکەی لێدانەبڕێنرێت.

وێڕای حەز نەکردن لە بەردەوامی ڕقایەتی و هەڵپڕژان لە نێوان هەردوو میللەتدا بە شەڕی بەردەوام، ڕوداوەکانی ڕۆژ هیچ بوارێك ناهێڵنەوە جگە لە بەردەوامی ئەو کوشتارە خوێناوییە بۆ چەند ساڵێکی تر، بەڵام بەداخەوە کوردان لەو ڕێگەیە زیاتر هیچ ڕێگەیەکی تریان لەپێش نییە. من بە دڵنیاییەکی تەواوەوە دەڵێم ئەگەر نەرمی بنوێنن ئەوا ئەرێنییەکی تەواو دەبینن، بۆ گەیشتنە ئەنجامێکی خێرا و شەرافەتمەندانە، کە کەرامەتی عێراق و گەلی عێراق بپارێزێت.

بۆیە جارێکی تر داواتان لێدەکەم هەوڵ و ڕیرەکی خۆتان بنوێنن بۆ خۆدزینەوە لەم ڕێککەوتنە، کە هێشتا کات ماوە بەر لە گفتوگۆی وەزیرانی دەرەوە لە تاران، دڵنیاتان دەکەمەوە هەر دەستپێشخەرییەك لە بەڕێزتانەوە بە ئەرێنی و مێشکێکی کراوەوە وەردەگیرێت، بۆ پاراستنی کەرامەتی عێراق و یەکێتی خاکەکەی.

پێم وایە دوو مەسئەلە هەیە ڕقی بەردەوام دروست دەکات لە نێوان هەردوو میللەتدا، ئەوانیش قبووڵکردنی ڕێککەوتنەکە و بەردەوامی شەڕەکە و هەردووکیشیان پەیوەستن بە یەکترەوە. ئەگەر هەوڵی بۆ بدەن دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، بەمەش مێژوو ئەم هەوڵە جوانەتان بۆ تۆمار دەکات.

لە کۆتاییدا چاوەڕێی ئەنجامی ئەرێنی خێرا لە ئێوە دەکەم، بەو جۆرەی بە گونجاوی دەزانن. ڕێز و سڵاومان بۆ هەمووان قبووڵ بکەن.

**دڵسۆزتان: فوئاد عارف ئاداری ١٩٧٥**

لە ڕێگەی ملازمی یەکەم یەعقوب موسا کە ئەفسەرێکی خەڵکی ناسرییە بوو، نامەکەم نارد بۆ بەغداد و دوای گەڕانەوەم بۆ بەغداد پەیوەندییەکی دۆستانەم لەگەڵی دروستکرد و ناوە ناوە سەردانی دەکردم.

هەرچەند چاوەڕوانی وەڵامێکی ئەرێنی یان هەر وەڵامدانەوەیەکی تر بووم لەلایەن سەدامەوە، بەڵام سەدام حسەین نامەکەی پشتگوێ خست و وەڵامی نەدایەوە.

بەو بۆنەیەوە بیرمە خوالێخۆشبوو ساڵەح یوسفیش لای خۆیەوە نامەیەکی هاوشێوەی نارد بۆ حیزبی بەعس، بەڵام وەڵامێکی توندی لە ڕاگەیاندنەکاندا درایەوە، کەچی یوسفی دوای ئەوە بەپێی خۆی گەڕایەوە بۆ لای حکومەت و لە تەلەفزیۆنی عێراق پیشان درا بە مەبەستی بێئومێدکردنی تەواوی خەڵکی کورد. لە ڕۆژی بیست و یەکی ئاداری ١٩٧٥ کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاری تایبەت کرا دەربارەی ئەوەی دەبێت لەو بارە سەختەدا چی بکرێت. ژمارەمان نزیکەی ٤٠ کەس دەبوو لە دەستەبژێرانی کورد، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا بڕیار درا من و ساڵەح یوسفی بچینە لای بارزانی و پێی بڵێین ئێمە سوورین لەسەر مانەوە و مقاوەمەکردن بەو مەرجەی دەست وەرنەدەیتە کاروبارەکانمان، لە کاتێکدا پێمان ڕاگەیاند ئێمە بەناوی ئەوەوە درێژە بە خەبات دەدەین، بەڵام داواکەی قبووڵ نەکردین.

لەو ڕۆژانەدا زوو زوو سەردانی بارزانیم دەکرد، یەکەمجار بوو ببینم هێندە بێئومێد بێت، چونکە چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستە خیانەتکارییەی لە

شا نەدەکرد کە لە بەرامبەر میللەتی کورددا کردی. هەولّم دەدا کاریگەرییەکەی لەسەر کەم بکەمەوە. بەوەی کاریگەرییەکەی زۆر لەسەر قورس بوو، بەلاّم هیچ وەلاّمێکی نەدەدامەوە، تا جارێکیان پێمگوت: باوکی ئیدریس، من هیچ بێئومێد نیم، هێندەی سەرە نینۆکێك گومانم نییە کورد جارێکی تر چەك هەلّدەگرنەوە.

ئەوجا بارزانی هاتە قسە و وتی: "سوپاسی هەستی بەرزتان دەکەم، لەو کاتەوەی دەتناسم بۆ یەك چرکەش گومانم لە دلّسۆزیتان نەبووە، بەلاّم تۆ دەبێت بە زووترین کات بگەڕێیتەوە بۆ عێراق، هەوالّم پێگەیشتووە سەدام فەرهادی کوڕتی گرتووە، بۆ ئەوەی بیکاتە فشار لەسەر تۆ. گومانم نییە دوای گەڕانەوەت ئازادی دەکات، ئەگەر ئێمە جارێکی تر خەباتمان دەست پێکردەوە، ئەو کات دەتوانیت بە ئاسانی پەیوەندیمان پێوە بکەیتەوە".

هەرچۆن بێت چوومە بەیروت، بۆ شوێنێك دەگەڕام لێی ببمە پەنابەر، بەلاّم حکومەتی لوبنان وێڕای هەولّێکی زۆری خوالێخۆشبوو کەمال جونبولات، ئامادە نەبوو پەنابەریم بداتێ، کەمال جونبولات تەواوی ئامادەیی خۆی دەربڕی لەگەلّم بێتە بەغداد لە پێناو مسۆگەرکردنی سەلامەتی گیانم، هەر ئەو ڕۆژە دکتۆر موکەڕەم تالّەبانی هاتە بەیروت، سەردانیم کرد و پێیگوتم: "سەدام زۆر لێت زویرە و دەلّێت فوئاد عارف تەنها خۆی لە دژمان نەوەستاوە، بەلّکو ئازادی کوڕیشی دوای کۆتاییهاتنی هەموو شتێك لە ئێزگەی یاخیبووانەوە قسەمان پێدەلّێت،

نەك هەر ئەوە بەڵکو فوئاد عارف سەردانی پاریس و لەندەنی کردووە و لە کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسیدا قسەی دژ بە ئێمە وتووە". دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی لەسەری ڕۆیشت و وتی: "لە ڕاستیدا من نەمتوانی هیچ بەرگرییەکت لێبکەم، چونکە نەجمەدین عەونی[1] وای لە سەرت بڵاوکردۆتەوە کە بە خۆی تۆی لە لەندەن بینیوە". لە کاتێکدا لە بەیروت دەرنەچووبووم، دکتۆر موکەڕەم وای بە باش زانی بگەڕێمەوە بۆ بەغداد بە تایبەت دوای ئەوە سەدام حسەین فەرمانی گرتنی فەرهادی کوڕمی دەرکردبوو

دوای دوو ڕۆژ گەڕامەوە بۆ بەغداد و خرامە ژێر چاودێرییەکی توندەوە، لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەڵوێستێکی شەریفانەی ئەفسەرێکی ڕوکن، لە ئیستخبارات تۆمار بکەم بەناوی (عەبدولئەزەل) کە خەڵکی کەرکوك بوو پێیگوتم: "هەر نامەیەکت پێگەیشت و گومانت لێهەبوو، یان هەر تەلەفۆنێکت بۆ دێت و سەغڵەتت دەکات، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە پەیوەندی بکە بە ئاسایشی گشتییەوە و ئەوان لای خۆیانەوە کارەکەت بۆ چارەسەر دەکەن". هەروایش بوو، هەندێك نامەم بۆ هات و چەند کەسێکی نەناسراویش تەلەفۆنیان بۆ کردم، جارێك لە جارەکان کەسێکی کوەیتی تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی ڕۆژنامەنووسە و دەیەوێت چاوپێکەوتنم لەگەڵ بکات، پەیوەندیم بە ئاسایشەوە کرد، کە لای خۆیانەوە چارەسەری هەموو ئەو کارانەیان دەکرد و وردە وردە ئەو چاودێرییەی لەسەرم بوو کەمکرایەوە.

---

[1]) خوالێخۆشبوو نەجمەدین عەونی لە کوردانی تورکیا، برای محەممەد عەلی عەونی، سەرۆکی بەشی وەرگێڕان لە زمانی فارسییەوە لە کۆشکی شاهانە لە میسر.

## ردنی دایکی فەرهاد

لە بەغداد گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم لە شەقامی ئەلمەغرب و ژمارەیەکی زۆر لە برایانی عەرەب و کورد سەردانیان دەکردم، لە ڕۆژی ٥ تەموزی ١٩٧٩ دایکی فەرهاد کۆچی دواییکرد، لە هۆڵی مزگەوتی (البنية) پرسەمان بۆ دانا، خەڵکێکی زۆر هاتنە پرسەکەی، ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتییەکان وەك خاوەن پرسە لەگەڵم دانیشتن، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر غەم و پەژارەی کەمکردمەوە.

## موڵکەکانم لە ولّوبە

لێرەدا دەمەوێت باسێك لە موڵکەکانم بکەم لە گوندی ولّوبە لە ناوچەی کارێزی شێخ عەبباس و جێشانە، کە لە دایکمەوە بۆم مابوونەوە و حکومەت بە بیانووی چاکسازیی کشتوکاڵی ویستی دەستیان بەسەردا بگرێت، بەڵام برایان موکەڕەم تاڵەبانی و ئیحسان تاڵەبانی برای و ئەحمەد زرنگی برای خوالێخۆشبوو فایەق هۆشیار هەڵچوونەوەیان بە بڕیارەکەدا کرد و دادگا لە بەرژەوەندی من بڕیاری دا، بەڵام دوای ئەوە بە نرخێکی هەرزان هەمووم فرۆشت.

## هەڵگرتنی قەدەغەی گەشتکردن لەسەرم

چەند ڕۆژێك دوای کۆچی دوایی دایکی فەرهاد، خوالێخۆشبوو شەوکەت ئاکرێیی سەردانی کردم، کە لەو کاتەدا پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ حکومەتدا هەبوو، پێمگوت: قسە لەگەڵ لایەنی بەرپرسدا بکات بۆ ئەوەی بڕیاری قەدەغەکردنی گەشتکردن لەسەرم هەڵبگرن، کارەکە جێبەجێ بوو و چووم بۆ لەندەن، دوای ماوەیەك فەرهادی کوڕیشم کە نەخۆش بوو هاتە لەندەن، داخلی نەخۆشخانەمان کرد و دەرکەوت کێشەی نەخۆشی درێژخایەنی دڵی هەیە و چوار لە دەمارەکانی دڵی گیرابوون. پزیشکەکان وتیان هەرچی زووە نەشتەرگەری بۆ بکرێت، نەشتەرگەرییەکە زیاتر لە ٥٠٠٠ پاوەنی ئیستەرلینی تێدەچوو. بڕە پارەیەك بوو لە توانای مندا نەبوو، بەڵام ئەگەر لە بەغداد بوومایە پێم چارەسەر دەکرا. ناچاربووم سەردانی باڵوێزی عێراق لە لەندەن دکتۆر هیشام ئەلشاوی بکەم، کە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم، لەو کاتەدا وەزیری ناوخۆش لای جەنابی باڵوێز بوو، داوام لێکرد پشتگیری بابەتەکە بکات، یان بە دابینکردنی ئەو بڕە پارەیە تا دەگەڕێمەوە بۆ بەغداد، یان ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە لەسەر گیرفانی حکومەت بە تایبەت فەرهاد یەکێك بوو لە ئەفسەرانی وەزارەتی ناوخۆ.

وەزیر بەڵێنی دا هەرچی لە توانایدایە دەیکات بۆ ئەوەی حەقدەستی نەشتەرگەرییەکە لەسەر حکومەت بێت. بەڵێنی دا ئەگەر ڕەزامەندی فەرمی و ئوسولی وەرگرت بۆ خۆی لە بەغدادەوە ئاگادارم دەکاتەوە،

بەڵام نەیتوانی هیچم بۆ بکات، چونکە لەو ماوەیەدا بە ڕادەیەکی مەترسیدار پەیوەندییەکانی نێوان عێراق– ئێران تێکچووبوون، جەنگی نێوان هەردوو وڵات لە بەرپابووندا بوو. بۆیە وەزیری ناوخۆ بە ئەدەبێکی زۆرەوە داوای لێبوردنی کرد کە بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی هەموو وەزارەتەکان، ناتوانێت هیچ یارمەتییەکم بدات، بەڵام ئەلشاوی پەیوەندی کرد بە طارق حەمەد عەبدوڵڵای سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتییەوە کە هاوڕێی فەرهاد و دەرچووی یەك خول بوون لە کۆلێژی سەربازی، ئەویش بەبێ دوودڵی پشتگیری لە بابەتەکە کرد و قسەی لەگەڵ سەرۆك سەدام حسەیندا کرد و سەدامیش یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی. سەدام بۆ خۆی پەیوەندی بە دکتۆر هیشام ئەلشاوییەوە کرد و لەسەر تەلەفۆن داوای کردم، بەڵام باڵوێز داوای لێبوردنی کرد کە ئێستا ئەو لە باڵوێزخانە نییە. پێی وتبوو: پێی بڵێ سەرۆك دەڵێت نەشتەرگەرییەکە لەسەر گیرفانی دەوڵەت دەبێت و هەرچی ڕێنومایی پێویستە بۆ جێبەجێکردنی دەرکراون، هەر دوای ئەوە دکتۆر هیشام ئەلشاوی پەیوەندی پێوەکردم و سڵاو و تەواوی قسەکانی سەرۆکی پێڕاگەیاندم. بەو جۆرە پزیشکی ناوداری میسری مەجدی ئەلیەعقوب لە ڕۆژی ١٠ی ئەیلولی ١٩٨٠ لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی لەندەن و لەسەر حیسابی دەوڵەت نەشتەرگەرییەکەی بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا.

دوای ماوەی پشوودان گەڕاینەوە بۆ بەغداد، لە ڕاستیدا دەمویست سەردانی کۆشك بکەم و بەبۆنەی ئەو هەڵوێستەی کە هەرگیز لە یادم

ناچێت سوپاسی سەرۆك سەدام حسەین بكەم، بەڵام بەهۆی هێرشكردنە سەر ئێران و سەرقاڵبوونی سەدام حسەین بە ڕادەیەكی زۆر و تێكچوونی بارودۆخەكە، نەمتوانی سەردانی بكەم.

## ئاساییبوونەوەی پەیوەندییەكانی سەدام حسەین و من

لە یادمە ساڵی ١٩٩٣ بوو دكتۆر موكەڕەم تاڵەبانی وەك هەموو جارێك لەماڵی خۆمان سەردانی كردم و پێیگوتم: "كاك فوئاد گوناهە، ئەم ماڵەی تێیدا دەژیت لەدەستی بدەیت"

ئەو خانووە دایكی فەرهاد لە ساڵی ١٩٦٦ لە كاتی دوورخستنەوەی بە زۆرم لەلایەن عەبدولسەلام عارفەوە بۆ عەین ئەلتەمر دروستی كردبوو، كە گەڕامەوە بۆ بەغداد خانووەكە تەواو بووبوو، ئەندازیاری هاوڕێم حەسیب ساڵەح نەخشەی كێشابوو و سەرپەرشتی دروستكردنی كردبوو، بەڵام دوای پەیوەندی كردنم بە شۆڕشەوە لە ساڵی ١٩٧٤ ڕژێم بە دایكی فەرهادی وتبوو دەبێت دەست لە خاوەندارێتی خانووەكە هەڵگریت، بۆیە بوو بەهۆی توشبوونی بە شەلەل، هەرچەند هەموو ئەندامانی تری خێزانەكەم لە خانووەكەدا بوون، بەڵام لە هەر كاتێكدا چاوەڕێمان دەكرد فەرمانی چۆڵكردنی خانووەكە دەربكرێت. وەك ئاماژەم پێدا دكتۆر موكەڕەم پێیگوتم: "كاك فوئاد گوناهە ئەم خانووەت لەكیس بچێت، بۆیە پێشنیار دەكەم لەو بارەیەوە نامەیەك بۆ سەدام حسەین بنووسیت".

پێمگوت: نزیكەی بیست ساڵە هیچ پەیوەندییەكم لەگەڵ سەدامدا نەماوە و هیچ نامەیەكم بۆ نەنووسیوە، ئەمجا چۆن نامەكەمی پێبگات؟

دکتۆر موکەڕەم وتی: "ئەوەیان بۆ خۆی کێشەیەك نییە، من بۆ خۆم بەرپرسی پرسگەی کۆشك باش دەناسم و نامەکەتی پێدەگەیەنم و داوای لێدەکەم بە دەستی خۆی نامەکەت بگەیێنێتە سەرۆك، بۆ خۆشم ناوەڕۆکی نامەکەت بۆ دەنووسم".

ڕازیبووم بە پێشنیارەکەی و پێمگوت: چی دەنووسی بنووسە، من تەنها واژۆی دەکەم. دکتۆر موکەڕەم نامەکەی نووسی و واژۆمکرد و بە سوپاسەوە بردی بۆ پرسگەی کۆشك، دوای دوو یان سێ ڕۆژ کەسێك لە کۆشکەوە پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "من فاروق ئەلسامەڕائیم تکایە سبەینێ لە کۆشك ئامادەبە".

پێمگوت: نە ڕێگەی کۆشك دەزانم و نە ئۆتۆمبێلیشم هەیە، جا چۆن دەتوانم بگەمە لات. بۆیە ئەلسامەڕائی ئۆتۆمبێلێکی تایبەتی بۆ ناردم و لەماڵەوە گەیاندمیە پرسگەی کۆشك و فاروق ئەلسامەڕائی پێشوازی لێکردم و وتی: "بۆچی نامەیەك بۆ جەنابی سەرۆك نانووسیت و داوای چاوپێکەوتنی بکەیت؟" بە ئەلسامەڕائیم وت: ساڵانێکی درێژە پەیوەندیم لەگەڵ جەنابی سەرۆکدا نەماوە، دەتەوێت چی بۆ بنووسم؟

وتی: "ئەمە کێشە نییە، من خۆم نامەکەت بۆ دەنووسم و تۆ تەنها واژۆی بکە".

وتم باش، بە کورتی نامەیەکی نووسی، کە لە چەند دێڕێك زیاتر نەبوو، پاش ئەوەی بۆی خوێندمەوە واژۆم لەسەرکرد. دوای دوو ڕۆژ لە کۆشکەوە پەیوەندییان پێوەکردم و وتیان: "دەبێت سبەینێ کاتژمێر ٨ی

بەیانی لە كۆشك ئامادەبیت".

بەیانییەكەی فەرهادی كوڕم بە ئۆتۆمبێلەكەی تا پرسگەی كۆشك گەیاندمی، لەوێدا چاوەڕێم كرد تا ئۆتۆمبێلێكی داخراو هات و گەیاندمییە ئەو شوێنەی سەدام حسەینی لێبوو. دوای ئەوەی دەرگاكەیان كردەوە، لای سەرۆكی دیوان دانیشتم، كە داوای لێكردم هەرچی شتێكم پێیە وەك كاتژمێر و هەرچی تری لەو جۆرە لەوێدا بەجێی بهێڵم، دوای ئەوە برامە ژوورێكی تر و دوو یان سێ كەسی تری لێبوو، دوای سڵاوكردن لایان دانیشتم و تا یەكێك لە پاسەوانەكانی سەدام هات و پرسیاری لێكردم: "تۆ فوئاد عارفیت؟"

وتم: بەڵێ، پێدەچو سەدام ڕایسپاردبێت سڵاویم پێبگەیەنێت و پرسیار لە تەندروستیم بكات، لەگەڵ ئەوەش پێیگوتم: "سەرۆك حەز دەكات دوای هەمووان بتبینێت بۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵت دانیشێت".

دوای ئەوەی هەمووان ڕۆیشتن و كات گەیشتبووە نزیكی نیوەڕۆ، نۆرەی من هات و بڕیارم دا بەر لەوەی ئەو قسە بكات گلەیی لێبكەم، هەرواش بوو گلەیی ئەوەم لێكرد بە درێژایی ئەو چەند ساڵە منی پشتگوێ خستووە و هەواڵێكی لێنەپرسیوم. وەڵامی ئەوە بوو: "باوكی فەرهاد قسەكانت ڕاستن، من بۆ خۆم سەردانتم دەكرد و وەك مامی خۆم لە تۆم دەڕوانی، بەڵام تۆ خیانەتت لێكردم و لە پێناو ئەو هیچوپووچانە منت فرۆشت".

یەكسەر وەڵامم دایەوە و پێمگوت: جەنابی سەرۆك، ئەوانەی تۆ بە

هیچوپووچ ناویان دەبەیت هەموویان کەسوکار و برا و خاڵی منن، من لە ئەوانم و ئەوان لە منن، جا سوێندت دەدەم بەخودا ئەگەر تۆ لە جێگەی من بوویتایە ئەوەت نەدەکرد من کردم؟ ئا لێرەدا سەدام حسەین لە تەنیشتم دانیشت و بابەتەکەی گۆڕی، پێم وایە باش دەیزانی من لەسەر حەقم، ئەو ڕەخنە توندەی لێمگرت هیچ جیاوازی نەبوو لە ڕەفتارەکانی پێشووم لەگەڵ ئەودا یان لەگەڵ کەسانی تردا.

لە دواییدا پرسیاریکرد: "باوکی فەرهاد خانووەکەت فرۆشراوە یان ماوە؟"

وتم: جەنابی سەرۆك پێم وایە خانووەکە هێشتا نەفرۆشراوە.

وتی: "دڵنیابە ئەمڕۆ فەرمانی پێویست لەو بارەوە دەردەکەم و هیوادارم ناوە ناوە سەردانم بکەیت".

ڕووی کرد بەلای سەرۆکی دیوانەوە و پێیگوت: "هەر کات باوکی فەرهاد پەیوەندی پێوەکردی بە زووترین کات چاوپێکەوتنەکەمان ڕێکبخە". بۆیە منیش زۆر سوپاسی ئەو هەڵوێستە دۆستانەییەیم کرد و خواحافیزیم لێکرد.

### قەزیەی جەمال شەمەیی

دوای ئەوە چەند جارێکی تر چاوپێکەوتنی دۆستانەمان لە نێواندا دروستبوو، لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکاندا باسی بابەتەکەی جەمالم لەگەڵ کرد کە ناوی باوکیم بیرچۆتەوە، بەڵام خۆی بە جەمال شەمەیی

ناسرا بوو، لە هۆزی جاف بوو، بە تۆمەتی سیخوڕی حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوبوو. لە کاتێکدا ئاسنگەرێکی دەستپاکی هەژار بو. ژن و کچەکانی لەگەڵ مەحموودی خاڵۆزام هاتن بۆ لام بۆ ئەوەی تکایەکی بۆ بکەم.

پێمگوتن: نامەیەکی بەزەیی پێداهاتنەوە بنووسن تا بزانم چۆن دەبێت، ئەگەر دۆخەکە گونجاو بوو ئەوا عەرزەوحاڵەکەتان پێشکەش دەکەم، ئەگەرنا هیچ. کاتێك سەردانی سەرۆك سەدام حسەینم کرد دەبینم کەشی گفتوگۆکە لەبارە بۆ ئەوەی عەرزەوحاڵەکەی بدەمێ، بۆیە پەیوەندی کردە زیندانەوە و دڵنیابوو لەوەی حوکمی لەسێدارەدانەکەی جێبەجێ نەکراوە. فەرمانی حوکمی لەسێدارەدانەکەی ڕاگرت و ئەمجا ڕووی تێکردم و وتی:

"ئوستاد فوئاد، من یەکەمجار حوکمی لەسێدارەدانەکە دەکەمە حوکمی هەتا هەتایی و دوای ئەوەش فەرمانی ئازادکردنی دەدەم".

سەدام بەڵێنەکەی بردەسەر و دوای ماوەیەکی زۆر بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم کەسێك بنێرم شەمەیی لە زیندانەوە بباتەوە، فوئادی کوڕەزام -کوڕی ئیسماعیلی کوڕم- نارد بۆ زیندان و هێنایەوە. بەرپرسانی زیندان هەر بە زارەکی فەرمانی ئازادکردنیان لە سەدام وەرگرتبوو، دوای ئەوە فەرمانی نووسراوی بۆ ئازادکردنی بۆ ناردبوون.

## چیرۆکی دیارییەکەی سەرۆك

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر قەزیەی جەمال شەمەیی، سەرۆکی دیوانی کۆشك پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "جەنابی سەرۆك ئۆتۆمبێلێکی بە دیاری بۆ داناویت، هیوادارم لە پرسگەی کۆشك ئامادەبیت بۆ وەرگرتنی".

وەڵامم دایەوە: سوپاسی بەخشندەیی جەنابی سەرۆك دەکەم، بەڵام باوەڕت هەبێت پێویستم بە ئۆتۆمبێل نییە! سەرۆکی دیوان وەڵامی دایەوە: "فەرمانی جەنابی سەرۆکە و ئێمەش دەبێت جێبەجێی بکەین، هیوادارم هیچ قسەیەکی لەسەر نەکەیت و بۆ خۆت بێیتە پرسگەی کۆشك".

بەو جۆرە ناچار بووم بۆ خۆم بچمە پرسگەی کۆشك و ئیمزا لەسەر فۆڕمی وەرگرتنی ئۆتۆمبێلەکە بکەم کە لە جۆری تۆیۆتا کرۆلای یابانی مۆدیل ١٩٩٩ بوو.

## هەوڵەکانم بۆ چاککردنەوەی نێوان ناوەند و سەرکردایەتی کورد

دوای ماوەیەك حەزمکرد سەردانی سەرۆك سەدام حسەین بکەم، تا پێی ڕابگەیەنم حەز دەکەم سەفەرێکی کوردستان بکەم، کە ساڵانێکی زۆر بوو سەردانم نەکردبوو، ڕێگری نەکرد لە پێشنیارەکەم لە کاتێکدا لەو سەردانەدا دەمویست نێوانی سەرکردایەتی هەردوو پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان چاك بکەمەوە.

چوومە هەولێر و سەردانی مەسعود بارزانیم کرد و زۆر بە گەرمی

پێشوازی لە بیرۆکەکە کرد و هانی دام سەردانی مام جەلال بکەم و ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ جێبەجێکردنی هەموو داواکارییەکانی. لە هەولێرەوە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ مام جەلال کرد و پێمگوت دەمەوێت لە سلێمانی سەردانت بکەم، بێ ئەوەی مەبەستی سەردانەکەمی پێبلێم، زۆر دڵخۆشبوو بەو سەردانە، بە تایبەت ئێمە ساڵانێکی دوور و درێژ بوو دۆست و ناسیاو بووین.

پارتی تا سنووری دێگەڵە منیان هێنا و لەوێدا خواحافیزییان لێکردم، لەمبەری دێگەڵە چەند سەرکردەیەکی یەکێتی نیشتمانی پێشوازییان لێکردم و هاتینە ئوتێل ئاشتی سلێمانی کە مام جەلال بۆ خۆی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لەوێ چاوەڕێیان دەکردم. پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد، هەردوو بە تەنیا چووینە ئەو شوقەیەی لە ئوتێلەکەدا بۆ من دانرا بوو، دوو بە دوو گفتوگۆیەکی درێژی بابەتەکەمان کرد. دوای گفتوگۆکە، مام جەلال وتی: دەبێت بابەتەکە لەگەڵ هەڤاڵانم باس بکەم، دوای ئەوە وەڵامت لێدەگەڕێنمەوە، بەڵام من جەختم کردەوە لەوەی پێویستە لەگەڵم بێت بۆ هەولێر بۆ بینینی مەسعود بارزانی، بزەیەك گرتی بێئەوەی وەڵامم بداتەوە.

مام جەلال پێشنیاری ئەوەی کرد لە سلێمانی بمێنمەوە تا کاتی هاتنی بریکاری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، منیش مامەوە، دوای هاتنی، مام جەلال ئاگاداری کردمەوە بریکاری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بە کاك مەسعود و مام جەلالی ڕاگەیاندووە، مادلین ئۆلبرایتی وەزیری دەرەوەی

ئەمریکا حەز دەکات هەردوو سەرکردە سەردانی واشنتۆن بکەن، کارێك بوو هەموو دڵسۆزانی دۆزی کورد دەستخۆشییان لێکرد. بەو جۆرە مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لە واشنتۆن یەکتریان بینی و ڕێککەوتننامەی واشنتۆنی لێکەوتەوە.

تەموزی ساڵی ٢٠٠٠ و ٢٠٠٢ جارێکی تر سەردانی هەولێر و سلێمانیم کردەوە و سەرکردەکانی کوردم بینی، بە تایبەت سەرکردەکانی هەردوو پارتی و یەکێتی و بە وردی باسی بارودۆخەکانی سەر گۆڕەپانی ناوچەکەم کرد و پێویستە بە وردی و وریاییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێت، دوای گەڕانەوەم و بە دیاریکراوی لە چواری کانونی یەکەمی ٢٠٠٢ ئازادی کوڕم کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ هەولێر و هەردوو بەڕێزان نێچیرڤان بارزانی و سیداد بارزانی بەردەوام لەگەڵم بوون و مەسعود بارزانیش ڕۆژانە لە دەرەوە پەیوەندی دەکردە سیداد بارزانییەوە بۆ ئەوەی ئاگای لێمبێت. یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش شاندێکی گەورەیان هاتنە پرسەکەمانەوە، کە تا ماوم لە بیرم ناچێت.

دوای مەراسیمی بەخاکسپاردن و پرسە لە هەولێر، گەڕاینەوە بۆ بەغداد و لە بەغدادیش پرسەمان دانا و ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیان ئامادەی پرسەکە بوون، سەرۆك کۆماریش عەواد موحەممەد ئەلبەندەری وەك نوێنەری خۆی ناردە پرسەکەمان.

## گەڕانەوە بۆ عێراق

كاتێك بارزانی گواسترایەوە بۆ تاران، لەگەڵ ئازادی كوڕم و جەودەت ڕەشیدی خزمم و مازن عوسمانی خاڵۆزام بە مەبەستی چاوپێكەوتنی چووین بۆ تاران، هەوڵمان دا لە ئوتێلێكدا شوێنێكمان دەستكەوێت، بەلاّم نەیانهێشت لە یەك شەو زیاتر تیایدا بمێنینەوە، چونكە هیچ بەڵگەیەكمان پێنەبوو، بۆیە ناچاربووم تەلەفۆن بۆ خوالێخۆشبوو ئیبراهیم ئەحمەد بكەم، پێیگوتم: "دەتوانن هەمووتان بێنە ماڵی ئێمە و چەندتان دەوێت بمێننەوە" بەو جۆرە چووینە ماڵی ئیبراهیم ئەحمەد، هەرچەندە خانووەكەیان بچووك بوو، بەلاّم پێشوازییەكی گەرمیان لێكردین و هەرگیز میهرەبانیی خاتوو گەلاوێژی خێزانی لە بیر ناكەم. كە دەبێتە برازای خوالێخۆشبوو هەمزە عەبدوڵلا، بە جۆرێك ئازارەكانی ئەو ڕۆژە سەختانەی لەسەر كەمكردینەوە.

دوای ماوەیەكی كەم پەیوەندیمكردە پشكنەری گشتی موخابەراتی ئێران (ساواك)ەوە، دەمناسی بەوەی ئەڵقەی گەیاندن بوو بۆ ئاوارە عێراقییەكان، بەداخەوە ناوەكەیم لە بیر چووە، زۆر بەڕێز بوو لەگەڵم و دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئاگاداری كردمەوە بۆ هەر چوارمان شوێن گیراوە لە هۆتێل گراننس لە ناوەڕاستی تاران، بەلاّم بە چوار ناوی خوازراو.

لە هوتێل گراننس باڵوێزی عێراق خوالێخۆشبوو مەدحەت ئیبراهیم جومعە، سەردانیكردم، میهرەبانی زۆر لەگەڵدا نواندین، چەند كوردێكی تری عێراقیمان لەگەڵبوون دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ عێراق، پێمگوت من

دەمەوێت بچم بۆ بەیروت بۆ هەندێك پشکنینی پزیشکی، بەڵام سێ کەسەکەی تری ناردەوە بۆ بەغداد و بۆ ئەو مەبەستە فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ دابینکردن و ئازاد و جەودەت و مازن لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانیان لە کوردانی عێراق گەڕانەوە بەغداد.

دوای چەند ڕۆژێك عەلی کوڕی خوالێخۆشبوو قازی موحەممەد سەردانیکردم و لە ڕێگەی ئەوەوە شوێنی بارزانیم زانی و سەردانیم کرد. لەگەڵ بارزانی بە دوو کەسی لە باخچەی حەوشەکەدا پێکەوە پیاسەمان دەکرد، مەبادا لە نێو ژوورەکاندا ئامێری دەنگ تۆمارکردن دانرابن، دوای گفتوگۆیەکی دوور و درێژ پێمگوت: بڕیارم داوە لە هەرکوێ بیت لەگەڵت بمێنمەوە!

قبووڵی نەکرد و وتی: "ئێمە دەزانین سەدام فەرهادی کوڕتی گرتووە، بە دووری نازانین فەرمانی کوشتنیشی بدات، هەروەها بە دووریشی نازانم لە حاڵەتی گەڕانەوەی تۆدا فەرمانی ئازادکردنی بدات، وەك دەزانی ئێمە بارودۆخمان شڵەژاوە و نازانین ئایندەمان چۆن دەبێت، ئەگەر خوا کردی گەڕاینەوە سەر گۆڕەپانی خەبات، ئەو کات پەیوەندی کردنت پێمانەوە ئاسانە. تکا دەکەم بە زووترین کات بگەڕێیتەوە بۆ بەغداد".

## ڕێزو سوپاس بۆ سەردار جاف و ڕۆژبەیانی و مستەفا جاف

لەو ڕۆژە سەختانە هەریەك لە خوالێخۆش بووان سەردار جاف و مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی و مستەفا بەگی جاف بەدەمەوەهاتنێکی تایبەتیان بۆم هەبوو و تاڕادەیەکی زۆر ئازارەکانیان کەمکردمەوە، هەرسێکیان بەردەوام هەواڵیان دەپرسیم و تەنانەت هەرسێکیان ئامادەگی تەواویان دەربڕی بۆ جێبەجێکردنی هەر داواکارییەکم، سەردار جاف لە ماڵەکەی خۆیدا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ گێڕام لەگەڵ کوردە عێراقییەکانی تردا و مەلا جەمیلیش لە یەکێك لە چێشتخانەکانی تاران و مستەفا بەگی جافیش لە ماڵەکەی خۆیدا میوانداریيان کردم.

## دواچاوپێکەوتنم لەگەڵ سەدام حسەین

پێشتر هەندێك لایەنی ئەو چاوپێکەوتنانەم باسکرد کە لە ئاخروئۆخری سەردەمیدا، لە نێوان سەرۆك سەدام حسەین و مندا دروستبوو، بە تایبەت ئەو چاوپێکەوتنەی موکەڕەم تاڵەبانی ڕێکیخستبوو، پێم وایە دواین چاوپێکەوتنی نێوانمان گرنگترین چاوپێکەوتن بوو. کە زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی گفتوگۆمان کرد.

ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتم بۆ پرسگەی کۆشك بۆ وەرگرتنی دیارییەکەی سەرۆك، بە ئەحمەد حسەین حزەیر ئەلسامەڕائی سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتیم وت: هیوادارم سڵاو و سوپاسم بگەیەنیتە جەنابی سەرۆك بۆ دیارییەکەی و پێی بڵێیت حەز دەکات بە خۆی سەردانت بکات، بۆ ئەوەی چەند بۆچوون و بیرۆکەیەك هەیە بیخەمە بەرچاوی، چونکە زۆر گرنگە بۆ

ئەم قۆناغە سەختە کە وڵات پێیدا تێپەڕ دەبێت.

سەرۆکی دیوان پێشنیارەکەمی قبووڵکرد و ڕۆژی دواتر بە تەلەفۆن ئاگاداری کردم کە سەرۆك بۆ سەردانیکردنی ڕەزامەندی دەربڕیوە، پێیگوتم: "دەبێت سبەینێ کاتژمێر ٨ی بەیانی لە پرسگەی کۆشك ئامادە بیت". لە کاتی دیاریکراودا ئامادەبووم و ئۆتۆمبێلێکی داخراو بردمیانە شوێنێك کە نەمدەزانی کوێیە، چوومە ژوورێکەوە عەبد حەمودی پاسەوانی تایبەتی سەدام حسەین چاوەڕوانی دەکردم، دوو بە دوو دانیشتین و دەستمان بە قسەوباس کرد و چەند وێنەیەکی لەگەڵ گرتم. لەناکاو سەدام حسەین هاتە ژوورەوە، بە گەرمی چاك و چۆنی لەگەڵ کردم و لەگەڵمان دانیشت، دوای ئەوە چووینە هۆڵێکی تەنیشت، دوای چەند خولەکێك کامێرای تەلەفزیۆن ئامادە بوو، عەبد حەمود لە شوێنێکی دوور لە ئێمە دانیشت، وێنەگرەکان زۆرتر فۆکسیان خستبووە سەر سەرۆك، بەڵام داوای لێکردن تەرکیز بخەنە سەر منیش، قسەمان لە باسە گشتییەکان دەکرد و هەندێك قسەی خۆشیشی تێدەکەوت، دوای ئەوە پێمگوت: جەنابی سەرۆك حەز دەکەم دوو بە دوو دوور لە چاوی کامێرا پێکەوە دانیشین، چونکە بابەتێکی تایبەت هەیە حەز دەکەم بیخەمەڕوو بۆ جەنابتان. سەدام ڕازی بوو کامێرا و وێنەگرەکانی دوورخستنەوە و ئەمجا وتی: "ئەگەر ئاسایی بێت عەبد حەمود لەگەڵمان بمێنێتەوە". پێمگوت: بۆ من کێشە نییە، ئەوەیان لای جەنابتان دەمێنێتەوە.

دوای ئەوە دەستم بە قسانکرد و بەر لە هەر شتێك پرسیارم لێکرد:

جەنابی سەرۆك، حەز دەکەیت وەك سەرۆك کۆمار قسەت لەگەڵ بکەم یان وەکو مامە و برازاییەکەی جاران بێت؟

به بزەیەکەوە وەڵامی دایەوە: "باوکی فەرهاد! وەکو جارانی پێشوو، ئازادی تەواوی خۆت وەرگرە".

پێمگوت: جەنابی سەرۆك، هەر بڕیاردەرێك بڕیارێك دەدات لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانە دەیدات کە پێی دەگەن، ئەگەر زانیارییەکان ڕاستبن ئەوا بێگومان بڕیارەکان گونجاو و ڕاست دەبن، بەڵام دڵنیام لەوەی سەرچاوەی زانیارییەکانت لە ئاستی پێویستدا نین.

تا ڕادەیەك بە بێتاقەتبوونەوە، وتی: "چۆن وا دەڵێیت؟ دەمەوێت ڕاشکاوانە مەبەستی خۆتم پێبڵێیت".

وتم: سەرچاوەی زانیارییەکانت کەسانێکی وەك عیززەت ئەلدوری و تەها ئەلجەزراوی و هاوشێوەکانی ئەوانن، کە هەموو ڕاستییەکانت پێنالێن، ئەوەی تەنها و پێش هەموو شتێك بەلای ئەوانەوە گرنگە ڕازیکردنی دڵی تۆیە و دۆستت ئەوەیە قسەی ڕاستت لەگەڵ بکات.

جەنابی سەرۆك: ئێمە ئەمڕۆ بە ڕۆژگارێکی سەخت و دژواردا گوزەر دەکەین، دەبێت تێبگەین و واقیعەکە وەك خۆی ببینین، ئەمریکا ئەمڕۆ بەهێزترین وڵاتی دونیایە، هەروا گاڵتە نییە، بەو دواییانە زیاتر لە ١٢٠,٠٠٠ سەربازی هێناوەتە ناوچەکانی دەوروبەری عێراق، وێڕای ئەوە، چەند کەشتیەکی فڕۆکە هەڵگریشی هێناون، بارودۆخی ئەم قۆناغە زۆر جیاوازە لە بارودۆخی قۆناغی سەرۆك جەمال عەبدولناسر کە دەیتوانی پشت بە

هێزێکی نێودەوڵەتی گەورەی وەك یەکێتی سۆڤێت ببەستێت کە هیچی لە ئەمریکا کەمتر نەبوو، بەڵام ڕووسیای ئەمڕۆ، یەکێتی سۆڤێتی جاران نییە، بەڵکو خۆی پێویستی بە یارمەتی ئەمریکایە.

سەدام ئا لێرەدا قسەکەی پێبڕیم و وتی:

"کەواتە دەبێت من چی بکەم؟ ئەگەر ئەمریکا هێرشی کردە سەرمان لە بەرگری زیاتر هیچ چارێکی ترم نییە!"

پێمگوت: جەنابی سەرۆك: دەبێت پەنا ببەیتە بەر مناوەرە و مساوەمە، هیچ نەبێت بۆ سوودوەرگرتن لە کات، بە پێویستی دەزانم دەست بدەیتە هەندێك چاکسازی، بۆ ڕازیکردنی جەماوەر کە لە پێناوی حکومەتەکەتدا دەردیسەری زۆریان چێشت، هەروەها پێشنیار دەکەم پەیوەندی بکەیت بە سەرکردایەتی کوردەوە و هەندێك تەنازولاتیان بۆ بکەیت، بۆ ئەوەی بەلای خۆتدا ڕایانکێشیت وەك یەکێك لە دڵنیاییەکانی سەقامگیری.

لە وەڵامدا وتی: "لاریم نییە لە بەهەند وەرگرتنی تێبینییەکانت و ئۆتۆنۆمی بۆ کورد پەرە پێبدەین..".

لەوێدا قسەکەم پێبڕی و پێمگوت: جەنابی سەرۆك! ئەستەمە کورد بە ئۆتۆنۆمی ڕازی بن، بۆیە باشتر وایە سیستمی فیدراڵی ڕابگەیەنن.

سەدام ڕازی نەبوو بە پێشنیارەکەم، بە بیانووی ئەوەی وڵاتانی دراوسێی عێراق بە هیچ جۆرێك بە فیدراڵی ڕازی نابن. لە کۆتایی

چاوپێكەوتنی ئەو ڕۆژەدا هیوای سەركەوتنم بۆ خواست لە ئەركە قورسەكەیدا و بەوەش دوایین چاوپێكەوتنم لەگەڵ سەدام حسەینی سەرۆكی پێشووتری عێراق كۆتایی هات.

## وشەی كۆتایی

لە یەكێك لە ڕۆژەكانی ئەو قەیرانەی دواییدا، شێروان شاڵی زاوای حەسیب ساڵەح هات بۆ لام و وتی: "سامانی برام پەیوەندی پێوەكردووم و داوای لێكردووم پێت ڕابگەیەنم ئینتەرنێت بكەیتەوە و ئەو بابەتە بخوێنیتەوە كە لەسەرت بڵاوكراوەتەوە".

كاتێك دەستم كرد بە خوێندنەوەی بابەتەكە، دەبینم ناونیشانەكەی نووسراوە: "بەغدادی دوای سەدام" وتارێكی دووروودرێژ بوو، تیایدا ئاماژە كرابوو بە دامەزراندنی ئەنجومەنێك بە ئەندامێتی هەریەك لە فوئاد عارف و عەدنان ئەلپاچەچی و عەبدولغەنی دەلی و ئەحمەد حەبووبی و دابەشكردنی عێراق بۆ سێ ناوچەی باكوور و ناوەڕاست و باشوور و چەندین قەزیەی تریش. ڕۆژنامەی (القدس)ی لەندەنی لە ٩ی ئازاری ٢٠٠٣ دەقی ئەو بابەتەی لەگەڵ وێنەیەكدا بڵاوكردبووەوە، هەمان ڕۆژ خوالێخۆشبوو دكتۆر یوسف موسا و دكتۆر گوڵزار ڕەشید جەودەتی هاوژینی، لە لەندەنەوە پەیوەندییان پێوەكردم و داوایان لێكردم بۆ سەلامەتی گیانی خۆم هەرچی زووە بەغداد بەجێبهێڵم، مەبادا لەلایەن سەدام حسەینەوە بگیرێم، وەڵامم ئەوە بوو من لە هیچ شتێك ناترسم تا بەغداد بەجێبهێڵم. هەر لەوێدا تەلەفۆنی سەرۆكی دیوانم كرد لە كۆشكی

کۆماری و پێمگوت حەز دەکەم چاوم بە سەرۆك سەدام حسەین بکەوێت، بەڵام گوتی سەرۆك لە ئێستادا لێرە نییە، پێمگوت ئەگەر گەڕایەوە مەبەستی تەلەفۆنەکەمی پێڕابگەیەنێت. دوای کاتژمێرێك یان زیاتر پەیوەندی پێوەکردم و وتی: "جەنابی سەرۆك دەڵێت من زۆر باش باوکی فەرهاد دەناسم و ئەگەر هەر شتێکی هەبایە ئەسڵەن نەدەگەڕایەوە بۆ عێراق". ڕۆژی دواتر جێگری سەرۆکی دەزگای هەواڵگری عێراق "جەلیل تاهر عەبوش" سەردانی کردم و سڵاوی سەرۆکی پێگەیاندم و وتی: "ئەگەر هەر پێویستییەکت هەیە لەخزمەتداین" بۆیە سوپاسم کرد و هیوای خۆشیم بۆ عێراق و عێراقییەکان خواست.

